پێداچوونەوەی:

١- بەڕێز مامۆستا مەلا (محمد رسول عبدالرحمن) سەرۆکی لیژنەی فەتوای شەرعی (دەڤەری ڕاپەڕین)، ناوچەی بیتوێن.

٢- بەڕێز مامۆستا مەلا (عوسمان عبدالله أحمد) پێش نوێژو وتارخوێنی مزگەوتی (عبدالله خەسرەو) لەڕانیە.

٣- بەڕێز (مامۆستا مستەفا سەید مینە) خاوەنی بڕوانامەی ماستەر لەزمانی کوردیی، مامۆستای زانکۆی ڕاپەڕین، کۆلیژی زمان لەقەلاّدزێ.

٤- بەڕێز مافپەروەر(یوسف اسعد اسماعیل) جێبەجێکار( المنفذ العدلی) لەبەڕێوەبەرایەتی جێ بەجێکردنی دەشتی هەولێر)، بکلوریۆس لەکۆلیژی یاسای زانکۆی موصل/ خەبیر لە قەسامی شەرعی).

٥- بەڕێزان لیژنەی فەتوای شەرعی، یەکیەتی زانایانی ئیسلامی کوردستان/ لقی ڕانیە. پشتگیری ژمارە(٩٩)، بەرواری (٢٠١٤/٤/١٥).

ناوی کتێب: پوختەی یاساکانی ئیسلام

ناوی نووسەر: عمر امین علی/ ڕانیە

تیراژ: ١٠٠٠دانە

چاپ: ناوەندی هزر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە.

ساڵی: ٢٠١٦ میلادی

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٦٩٢)
ساڵی (٢٠١٥)ی دراوەتێ

بسم الله الرحمن الرحيم

الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً..

(٣ المائدة)

**﴿....ئـەمڕۆ ئایینەكـەم بۆتـەواوكردن‌و، نازونیعمەتـەكانی خـۆمم بەتـەواوی بۆناردن‌و، ڕازی بووم بەوەی كەئیسلام ئایینی ئێوەبێت....﴾.**

وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِيناً فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ

(٨٥ ال عمران)

**﴿هەركەسـێكیش پـەیڕەوی‌و (ئـارەزووی) ئـایینێكی تـر بكـات جگـە لەئیسـلام، ئەوە لێی وەرناگیرێت‌و، ئەوكەسە لەدواڕۆژدا لەزەرەرمەندەكانە﴾.**

وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ (٤٤ المائدة)

**﴿....هەركەسێكیش كار بەو یاسایانە نەكات كەخوا ناردوونیـە خـوارەوە، ئـەوا ئەوانە بێباوەڕەن﴾.**

## یاساكانی خواپەرستی

پێكهاتەی یاساكانی خواپەرستی لە ئایینی ئیسلامدا پێنج بابەتە، بەدوای یەكدا دێن، بەومانایەی هەر بابەتێك نەكەوێتە بواری جێبەجێ كردنەوە، بابەتەكانی دوای خۆی كاریان پێ ناكرێت، ئەوانیش بریتین لە:

باوەڕهێنان، نوێژكردن، بەڕۆژووبوون، زەكات دان، حەج كردن.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ئیسلام لەسەر پێنج بابەت بنیات نراوە، (یەكەم): باوەڕهێنان بەوەی كە خوا تاك و تەنهایەو محەمەدیش ڕەوانەكراوی ئەوە، (دووەم): ئەنجامدانی نوێژەكان، (سێیەم): زەكات دان، (چوارەم): بەڕۆژووبوون، (پێنجەم): حەج كردن).(١)

## بابەتی یەكەم

## باوەڕهێنان

باوەڕهێنان بە خواو بە فریشتەكانی و بە پێغەمبەرەكانی و بە كتێبەكانی و، جیاوازی نەخستنە نێوان هیچ كام لە پێغەمبەرەكانی و، باوەڕهێنان بە مردن و زیندووبوونەوە، هەموو ئەمانە لەو وێردەی خوارەوەدا ڕەنگ دەدەنەوە، كە باوەڕهێنانە بە تاك و تەنهایی خواو، باوەڕهێنانە بە محەمەدیش كە لەلایەن خواوە نێردراوە:

(أشهد ان لااله الا الله وأشهد ان محمدا رسول الله).

واتە: هەموو تاكێكی نێو كۆمەڵگا بۆئەوەی ببێتە ئەندامێك لەنێو ئایینی ئیسلامدا، پێویستە سەرەتا دان بەم ڕاستیە بەڵگەنەویستەدا بنێت و بڵێت: شایەدی دەدەم كە لە خوا زیاتر هیچ پەرستراوێكی تر نییە، شایەدیش دەدەم كە محەمەد ڕەوانەكراوی ئەو خوایەیە.

پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: كاملترین باوەڕی خاوەن باوەڕەكان ئەوەیانە كە خاوەنی جوانترین ڕەوشتە).(٢)

## باوەڕهێنان بەخوا

ذَلِكُم اللهُ رَبُّكُمْ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ (١٠٢ الانعام)

﴿ئەوە ئەو خوایەیە کە پەروەردگاری ئێوەیە، هیچ پەرستراوێك نیە تەنها ئەو نەبێت، دروستکەری هەموو شتێکە، جا بیپەرستن، بەڕێوەبردنی هەموو شتەکانیشی لە ئەستۆی خۆی گرتووە﴾.

خوا هەبوویەکی زیندووی بەردەوامە، وەنەوزو خەو نایباتەوە، ڕەوشەنی ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوییە، تاك و تەنهایە، جێگەی نیازو ئومێدە، کەس لەو نابێت، لەکەسیش نەبووە، هەرگیز کەسێکیش وەکو ئەو نابێت، فراوانیی دەسەڵاتەکەشی ئاسمانەکان و زەویی گرتۆتەوە، بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، ئەو خوایە بژێوی دەدات بە هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویدان، ئەوخوایەیە هەموو شتەکانی (لە کەرەسەخاوەکان) دروستکردووە، داهێنەری کەرەسە خاوەکانیشە لە نەبوونەوە بۆ بوون، نەخشەدانەری شتەکانیشە (پێش دروستکردنیان)، ئەو خوایە چەندین ناوی پیرۆزی هەیە، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویشدان پاك وبێگەردیی بۆ دەردەبڕن، ئەو خوایەشە خاوەنی هێزو دەسەڵاتێکی بێ وێنەیەو کاردروستە، دادوەرێکی زانایە، لەناوبەرو فەوتێنەرە، بە بەزەیی و لێبوردەیە، هەژارەکان دەوڵەمەند دەکات و دەوڵەمەندەکان هەژار دەکات، دەسەڵاتدارە بەرزەکان نزم دەکاتەوەو، ژێردەستەکانیش بەرزو دەسەڵاتدار دەکات، ئەو خوایەیە (مردووەکان) زیندوو دەکاتەوەو، (زیندووەکانیش) دەمرێنێت و بۆلای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە بۆ لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی.

بەندەکان بە هیچ شێوەیەك توانای بینینی خوایان نیە، چونکە خوا بۆخۆی دەفەرموێت:

لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ (١٠٣)(الانعام).

﴿چاوەکان دەرکی پێی ناکەن‌و نایبینن، ئەو دەرك بە چاوەکان دەکات‌و دەیانبینێ، چاکەکارو شارەزایە﴾.

خوا (٩٩)ناوی هەیە، هەریەکەیان تواناو دەسەلاَت‌و ڕەوشتێکی دەردەخەن، ئەو ناوانە ئەوەندە پیرۆزن، مرۆڤەکان دەتوانن بە پشتبەستن بەم ناوانە زۆر کارو فرمان ئەنجام بدەن، بۆ خزمەتی خۆیان‌و نەتەوەکانیان‌و هەموو مرۆڤایەتی.

(ئەوەی عەرشی بەلقیسی بۆ سلێمان هێنا، ناوی (آصف ی کوڕی برخیا) بوو، عائشه(ڕەزای خوای لێبێت) دەربارەی ئەو دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: گەورەترین‌و پیرۆزترین ناوی خوا کە((آصف) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) داوای پێ لە خوا کرد(بۆ هێنانی تەختی بەلقیس)، (یا حی یا قیوم) بوو.(٣)

ناوە پیرۆزەکانی خوا:

الله الذي لا إله إلا هو: (الرحمن): بەخشندەیە، (الرحیم): خاوەن بەزەییە، (الملك): خاوەنی دەسەلاَتە، (القدوس): بێگەردە، (السلام): ئاشتی پەروەرە، (المؤمن): خاوەن پەنایە، (المهیمن): بالاَ دەستە، (العزیز):خاوەن هێزە، (الجبار): زۆرلێکەرە، (المتكبر): خۆبەگەورەزانە، (الخالق): دروستکەرە، (البارئ): بەدیهێنەرە، (المصور): نەخشەدانەرە، (الغفار): چاوپۆشیکەری هەلَەکانە، (القهار): خەفەت دەرە، (الوهاب): بەخشەرە، (الرزاق): ڕزق‌و ڕۆزی دەرە، (الفتاح): ئاوەلاَکەرە، (العلیم): زانایە بە هەموو شتەکان، (القابض): دەستبەسەرداگرە، (الباسط): دەست ئاوەلاَکەرە، (الخافض): نزم کەرە، (الرافع): بەرزکەرە، (المعز): ڕێزدەرە، (المذل): ڕسواکەرە، (السمیع): گوێبیستە، (البصیر): بینەرە، (الحكم): ناوبژکەرە، (العدل): دادوەرە، (اللطیف): نەرم‌ونیانە، (الخبیر): شارەزایە، (الحلیم): پشوودرێژە، (العظیم): پیرۆزە، (الغفور): لێبووردەیە، (الشكور): سوپاسمەندە، (العلي): بەرزە،

(الكبير): گەورەیـە، (الحفیظ): پـارێزەرە، (المقیـت): وزە بەخشـە، (الحسـیب): لێپرسـەرەوەیە، (الجلیـل): پـاك و پوختـە، (الكـریم): خـاوەن ڕێـزە، (الرقیـب): چاودێرە، (المجیب): وەڵامدەرەوەیە، (الواسع): خاوەن دەسەڵاتێكی فراوانە، (الحكـیم): كاردروسـتە، (الـودود): دڵ نەرمـە، (المجیـد): خـاوەن پلـەو پایەیـە، (الباعـث): نێرەرە، (الشـهید): ئاگادارە، (الحـق): ڕاسـتییە، (الوكیـل): جێگـەی خۆ پێسپاردنە، (القوي): بەهێزە، (المتین): پتەوە، (الـولي): ڕابەرە، (الحمیـد): سـتایش كـراوە، (المحصـي): هەژماركـەری هـەموو شـتەكانە، (المبـدئ): دەسـتپێكەرە، (المعیـد): گێـڕەرەوەی هـەموو دروسـتكراوەكانە، (المحیـي): زیندووكەرەوەیە، (الممیت): مرێنەرە، (الحـي): زینـدووە، (القیـوم): ڕاوەستاوە بەسـەر كاروبارەكانـەوە، (الواجـد): هەمیشـە دەوڵەمەنـدە، (الماجـد): خـاوەن ڕەوشتە، (الواحد): یەكە، (الأحد): تەنهایە، (الصمد): جێگەی نیازە، (القادر): بەتوانایە، (المقتدر): بالاَّ دەستە، (المقدم): پێشخەری ڕووداوەكانە، (المؤخر): دواخەری پێشهاتەكانە، (الأول): یەكەم هەبووە، (الآخر): لە كۆتاییدا هەر ئەو دەمێنـێ، (الظـاهر): خـاوەنی شـتە دیارەكـان، (البـاطن): خـاوەنی شـتە نادیارەكـان، (الـوالي): پشـتیوانیكەرە، (المتعـالي): بـەرزترە بەسـەر هـەموو شتەكانەوە، (البر): چاكەكارە، (التـواب): تۆبە وەرگرە، (المنتقم): تۆڵەسێنە، (العفـو): بەخشـەرە، (الـرؤف): دڵۆڤانـە، (مالـك الملـك): خاوەنداریـەتی هـەموو دەسەڵاتەكانە، (ذو الجلال والإكرام): خاوەنی گەورەیی و ڕێزلێنانە، (المقسط): بـە ویژدانـە، (الجـامع): كۆكەرەوەیـە، (الغـني): دەوڵەمەنـدە، (المغـني): دەوڵەمەندكـەرە، (المـانع): قەدەغەكـەرە، (الضـار): داهێـزەرە، (النـافع): سـوود بەخشـە، (النـور): ڕەوشـەنی ڕووناكییـە، (الهـادي): ڕێ نیشـاندەرە، (البـدیع): داهێنـەرە، (البـاقي): هـەر دەمێنـێ، (الـوارث): میراتگـرە، (الرشـید): كامڵـە، (الصبور): دانبەخۆداگرە.

پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: بێ گومان خوا نەوەدو نۆ ناوی هەیە، لە سەد یەك کەم، هەر کەسێك بیانزمێرێو لە بەریان بکاتو (کاریان پێ بکات)، دەچێتە بەهەشتەوە). (٤)

ئەوخوایە ئەوەندە لێمانەوە نزیکە، ئەگەر ئێمە دەروونمان پاك بێتو بەڕاستی بیپەرستین، ئەوا داوای هەر شتێکی لێ بکەین بەدەنگمانەوە دێت:

وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ (١٨٦)البقرة

﴿(ئەی محەمەد)، ئەگەر بەندەکانم دەربارەی من پرسیاریان لێکردی، ئەوا من نزیکم، بە دەنگ داوای هەموو داواکارێکەوە دەچم کاتێك کە بانگم بکات، با ئەوانیش باوەڕم پێبێنن، بەڵکو بەو باوەڕهێنانەیان ڕێگەی ڕاستیان نیشان دەدرێت﴾.

وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ (١٦)قاف

﴿بەدڵنیاییشەوە ئێمە ئادەمیزادمان دروستکردو ئاگادارین بەو ختوکانەی کە دەروونەکەشی دەیدەنو لە ڕەگی شادەماریشی لێیەوە نزیکترین﴾.

## باوەڕهێنان بە فریشتەکانی خوا

فریشتەکان دروستکراوی پەروەردگارن، لە ڕەوشەنی ڕووناکیەکەی خۆی دروستی کردوون، نێرو مێیان نییەو زاوزێ ناکەن، فریشتە خاوەن باڵەکانی کردوون بە پەیامبەر، کە خاوەنی دووباڵو سێ باڵو چوار باڵن، لەنێو فریشتەکاندا هەندێکیان زۆر لە بارەگای پەروەردگارەوە نزیکن، وەکو: (جبرائیل) لێپرسراوی گەیاندنی وتەکانی خوایە بۆ پێغەمبەرەکان(سەلامی خوایان لێبێت)، میکائیل لێپرسراوی بژێوی گیان لەبەرانە، (عزرائیل) لێپرسراوی گیان کێشانە، (اسرافیل) لێپرسراوی فوو پێداکردنی ئامێری (صور)ە کە دووجار لێدەدرێت، جارێکیان بۆ نەمانو تێکچوونی بوونەوەرو جاری دووەمیش بۆ زیندووبوونەوە، (مالیك) لێپرسراوی دۆزەخە، بەخۆیەوە (١٩)فریشتەن بەسەر دۆزەخەوە دانراون، (رعد)فریشتەیەکی خوایە لێپرسراوی جووڵەی هەورەکانو باران بارینە، هەندێك لە فریشتەکان تایبەتن بەو ئادەمیزادەوە کە لەگەڵیدانو ئەو نایان بینێت، هەموو کارو کردەوەکانی دەنووسن بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە، دوو فریشتەی ناسراو هەن بەناوی(نکیرو منکر) لێپرسراوی پرسیارکردنەکانی نێو گۆڕن، هەشیانە لێپرسراوی سزادانەکانی نێو گۆڕە، (رضوان)یش سەردەستەی فریشتەکانی بەهەشتەو، (زبانیە)ش دەستەی سزا تایبەتیەکانن، فریشتەکان بۆ چاوتروکانێکیش لە فەرمانەکانی خوا یاخی نابنو، ئەوەی کە پێیان دەگوترێت جێبەجێی دەکەن.

چاوی ئادەمیزادەکان توانای بینینی فریشتەکانی نیە، بەڵام چاوی کەڵەشێر توانای بینینی فریشتەکانی هەیە.

ئەو توانایەی کە چاوی گیانەوەرو باڵندەکان شتەکانی پێ دەبینن، لەچاو توانای بینینی چاوی مرۆڤ، لە فەرموودەیەکی ڕاستو دروستی پێغەمبەردا(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەردەکەوێت کە ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە دەڵێت: ئەگەر گوێتان لە دەنگی کەڵەشێر بوو، ئەوا داوای چاکەو

پاداشت لە خوا بکەن، لەبەرئەوەی کەڵەشێرەکە فریشتەیەکی خوای بینیوە، ئەگەر گوێشتان لە زەڕەی کەر بوو، ئەوا خۆتان لە پەنای خوا بگرن، (بڵێن: (اعوذ بالله من الشيطان الرجيم)، لەبەرئەوەی کەرەکە شەیتانێکی بینیوە).(٥)

(لە عائشەوە(خوای لێ ڕازیبێت) گوتویەتی: پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمویٚ: (فریشتەکان لە ڕەوشەنی ڕووناکی دروست کراون، جندوکەکانیش لە گڕی ئاگرێکی بێ دوکەڵ دروست کراون، ئادەمیزادیش وا دروستکراوە وەکو بۆتان باسکراوە).(٥ب)

خوا لەبارەی فریشتەکانەوە دەفەرمویٚت:

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَتَعْلَمُونَ (٣٠)البقرة

﴿(ئەی محەمەد ئەوەش بێنەوەبیر) کە پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی گوت: من لەزەویدا جێنیشینێکم بۆخۆم داناوە، (فریشتەکان) گوتیان: خوایە ئەو کەسەی تێدا دادەنێی کە خراپەکاری تێدا دەکات و خوێنی تێدا دەرێژێت؟ ئێمەش پاك و بێگەردی و ستایشی تۆ دەکەین و ڕێزو پیرۆزیی دەدەین بەتۆو(ئێمە شایستەترین بەو ئەرکە)، (خواش) فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن﴾.

واتە پێش دروستکردنی ئادەم، فریشتەکان هەبوون، لە ژیانی ئادەمیزادەکانیشدا فریشتەکان هەر یەکەی بۆ مەبەستێك ڕاستەوخۆ بەشدارن، خوا لەم بارەیەوە دەفەرمویٚت:

وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ (١٠) كِرَامًا كَاتِبِينَ (١١) يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ (١٢)الانفطار

﴿بەڕاستی بەسەر ئێوەشەوە کارمەندی پارێزەر هەن، (ئەو کارمەندانە) بەڕێزن و کردەوەکانتان دەنووسن، دەشزانن ئێوە چی دەکەن﴾.

وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ (٢١)قاف

﴿(لە ڕۆژی دواییشدا)هەموو کەسێك لێخوڕو شاهیدێکی لەگەڵدا دێت (بۆ مەیدانی لێپرسینەوە)﴾.

فریشتەکان ناچنەماڵێکەوە سەگو پەیکەری تێدابێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: (فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە سەگو پەیکەری تێدابێت).(٦)

لە پاڵ فریشتەکانیشدا، دروستکراوی تری پەروەردگاریش هەن، کە کاریگەرییان بۆسەر ژیانی ئادەمیزاد هەیە، ئەوانیش جندوکەکانن، چاوی مرۆڤ توانای بینینی فریشتەو جندوکەی نیە، بەڵام ئەوان ئادەمیزاد دەبینن، جندوکەکان لە ئاگرێکی بێ دوکەڵ دروست کراون، موسوڵمانو بێباوەڕیان هەن، نێرو مێیان هەیەو زازوزێ دەکەن، زۆر جارانیش لەگەڵ ئادەمیزاددا لە ماڵو سامانو منداڵەکانیدا تێکەڵ دەبن، بۆیە وا پێویست کراوە لەکاتی جووتبوونی نێرومێی ئادەمیزادەکان بڵێن: (بسم الله الرحمن الرحيم، اللّهمّ جَنِّبْنا الشيطان وجَنِّبِ الشَيطان مارزقتَنا)، چونکە جندوکەکان بە بیستنی ئەم وێردە دەوروبەرەکە چۆڵ دەکەنو بە سەلامەتی تۆوەکە بە کێڵگەکەوە دەکرێت، پێویستە کەسی خاوەنباوەڕ بەهۆی دوو سوورەتەکانی کۆتایی قورئانی پیرۆزەوە، خۆی لە کێشەو دنەدنەکانی جندوکەو ئادەمیزادە خراپەکارەکان بپارێزێت. خوا لە باسی جندوکەکاندا دەفەرموێت:

قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا (١)الجن

﴿(ئەی محەمەد)، بڵێ پەیامم لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ هاتووە بەوەی (کاتێك لە نوێژدا قورئانم دەخوێند) دەستەیەك لە جندوکەکان گوێیان لەو قورئان خوێندنە بوو، (جا کاتێك گەڕانەوە بۆ لای جندوکەکانی تر) گوتیان: ئێمە گوێمان لە قورئانێکی سەرسووڕهێنەر بوو﴾.

لەنێو جندوکەکانیشدا خەڵکانی موسوڵمانو خەڵکانی بێباوەڕ هەن، هەروەکو خوا دەفەرموێت:

وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُولَئِكَ تَحَرَّوْا رَشَدًا (١٤)الجن

﴿(جندوکەکان گوتیان): لەنێو ئێمەشدا کەسانی موسڵمانو کەسانی خراپەکاریش هەن، جا کەسێك کە خۆی بداتە دەست هێزو دەسەڵاتی پەروەردگار، ئەوا ئەوکەسە ڕێگەی ڕاستی گرتۆتەبەر﴾.

جندوکەکان لە پێش هاتنە خوارەوەی قورئاندا دەیانتوانی لە ئاسمانی یەکەم نزیك بکەونەوە گوێ بگرن بۆئەوەی زانیارییەکیان دەستکەوێت بیهێننەوە بۆسەر زەوی کەڵکی لێببینن، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَنْ يَسْتَمِعِ الآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَصَدًا (٩)الجن

﴿ئێمە(پێش هاتنە خوارەوەی قورئانیش) وابووین بۆ گوێ گرتن لە شوێنی تایبەتی دادەنیشتین(لە ئاسماندا)، جا ئێستا هەر کەسێك (بچێت لەوێ) گوێ بگرێت، خۆی دەبینێتەوە کە کراوەتە نیشانەی ئەستێرەیەکی ئاگرهاوێژ﴾.

جندوکەکانیش کۆمەڵگایەکن دابو نەریتی تایبەتی خۆیان هەیەو ژنو ژنخوازیی دەکەنو منداڵیان دەبێت، پەیوەندیش لەگەڵ ئادەمیزادەکان پەیدا دەکەن، وەك خوا دەفەرموێت:

وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الإنْسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا (٦)الجن

﴿(پەیوەندیی نێوان ئادەمیزادو جندوکەش وەهابوو) کەسانێك لە ئادەمیزادەکان هانایان بۆبەر کەسانێك لە جندوکەکان دەبرد، بەڵام زیاتر تووشی نارەحەتییان دەکردن﴾.

لەنێو جندوکەکاندا کەسانی لاشە زلو فیلەتەن هەن کاری زۆر ئەستەم ئەنجام دەدەن، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

قَالَ يَا أَيُّهَا المَلأُ أَيُّكُمْ يَأْتِينِي بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَنْ يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ (٣٨) قَالَ عِفْرِيتٌ مِنَ الْجِنِّ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ تَقُومَ مِنْ مَقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ (٣٩)النمل

﴿(سـليّمان)گوتى: ئـەى خەڵكينـە، كامـەتان تـەختو تاراجەكـەى بەڵقيسـم بۆديْنىْ، پيْش ئەوەى ئەوان بە موسڵمانى بيْن بۆلام؟ لاشەزليْك لە جندوكە گوتى: من بۆت دەهيْنم پيْش ئەوەى لە شويْنەكەى خۆت هەستىو، منيش بۆ هيْنانى ئەو تەختو تاراجە كەسيْكى بەهيْزو دەستپاكم﴾.

جندوكەكان لە حيلەى ئەسپ دەترسنو ئەو شويْنانە جيْدەهيْلْن كە ئەسپى لىْ بيْت.

وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لا تَعْلَمُونَهُمْ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ.... ٦٠ الانفال

﴿خۆشتانيان بۆ ئامادە بكەن، ئەوەى لە تواناتانداىە لە كۆكردنەوەى هيْزو لە ئەسپى دابەستراو كە دوژمنەكانى خۆتانو دوژمنى خواى پىْ دەترسيْنن، بيْجگە لەوان دەستەيەكى تريشى پىْ دەترسيْنن كە ئيْوە نايانناسن خوا دەيانناسيْت....﴾.

ئەوانە جندوكەكانن، لەبەرئەوەى لە حيلەى ئەسپەكان هەڵديْنو، نزيكى مالْيْكيش ناكەونەوە كە ئەسپى تيْدابيْت). (٧)

هەموو كەسيْك جندوكەيەكى لەگەڵدايە، هاوويْنەى خۆيەتى خوا بە (قرين) ناوى دەبات، كاريگەرى زۆرى لەسەر ئەو ئادەميزادە هەيەو، لە ژيانى دنياو نيْو گۆڕو زيندوو بوونەوەشدا لەگەڵيدايە، لەبەردەم پەروەردگاريشدا شايەدى لەسەر كاروكردەوەكانى ئەوكەسە دەدات، لەم بارەيەوە خوا دەفەرمويْت:

وَقَالَ قَرِينُهُ هَذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ (٢٣)قاف

﴿هاوويْنەكەشى دەلْيْت: هەموو كردەوەكانى لەلاى منو ئامادەن﴾

(پيْغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموويەتى: (كەسكيْك نيە لە ئيْوە هاوويْنەيەكى خۆى لە جندوكە لەگەلْ دانەنرابيْت). (٨)

## باوەڕهێنان بە کتێبەکانی خوا

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: خوا حەوت سووڕەتە درێژەکەی لە جێگەی تەورات داوە بە من، ئەوانەش کە پێیان دەگوترێت (مئین) لەجیاتی ئینجیل دراون بە من، ئەوانەش کە پێیان دەگوترێت(المثانی) لەجیاتی زەبوور دراون بە من، پەروەردگاریشم منی بەوە بەرزتر نرخاندووە ئەو سووڕەتانەی پێ بەخشیوم کە بە(المفصل) ناسراون، (ئەم ڕوون کردنەوەیە لە تەفسیری (البغوی)وەرگیراوە).

کتێبەکانی خوا بەهۆی جبرائیلەوە هاتوون بۆ پێغەمبەرەکان(سەلامی خوایان لێبێت)، (١٠)دە نووسراویان بۆ ئادەم هاتووەو، پەنجایان بۆ (شیث) هاتووەو، (٣٠)سی بۆ ئیدریس هاتووەو، (١٠)دە بۆ ئیبراهیم هاتووەو، تەورات بۆ مووسا هاتووەو، زەبور بۆ داوود هاتووەو، ئینجیل بۆ عیسای کوڕی مریەم هاتووەو، قورئانیش بۆ محەمەد هاتووە.

ئینجا لە قورئاندا باسی هەموو ئەو کتێبانەی پێش خۆی دووبارە بوونەوە، بۆیە قورئانەکە بە سەرچاوەیەکی یاسادانان دادەنرێت بۆ هەموو خاوەن کتێبەکان، لەلایەکی تریشەوە قورئان کتێبێکی زانستییە، باسی هەموو زانستەکانی تێدایە لە فیزیاو کیمیاو بۆماوەزانی و ژمێریاریی و هەندەسەو کشتوکاڵ و بازرگانی و پیشەسازی و فەلەك ناسی و هەندەسەی جینات و زانستی ئیستنساخی بەشەری، تەنانەت لە سووڕەتی یوسفدا وەڵامی چەندین پرسیار دەست دەکەوێت بۆ کەسێك کە لەبارەی بابەتێکەوە پرسیار بکات، هەروەکو پەروەردگار دەفەرموێت:

(لَقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِ آيَاتٌ لِلسَّائِلِينَ (٧))(یوسف)

﴿بەدڵنیاییەوە(لە چیرۆکی) یوسف و براکانیدا چەندین بەڵگەونیشانە هەن بۆ ئەوانەی (کە بەدوای مەبەستێکدا) پرسیار دەکەن﴾.

تۆ ئەگەر دەتەوێت بپرسیت داخوا ژنێك باشترە یان دوو ژن، ئەوا پەروەردگار دیمانەکەت دەخاتە بەرچاو کە بەرەی دوو دایك ئاژاوە دەکەوێتە ناویانەوە وەکو یوسف و براکانیان لێدێت، یان تۆ پرسیاری ئەوە دەکەیت کە دەتەوێت گەنمێك بۆماوەی حەوت ساڵ عەمبار بکەیت، ئەوا پێت دەڵێت لەنێو گوڵەکەیدا هەڵی بگرەو هەڵی مەوەرێنە، چونکە بەهۆی توێکڵ و داسوەکانەوە هیچ وردە جانەوەرێك ناتوانێت نزیکی ببێتەوە، یان کاتێك دەتەوێت شۆڕشێك بەرپا بکەیت، ئەوە وەڵامەکە لە سوورەتەکەدا دەڵێت: دەبێت بارێکی ئابووریی پتەوو دەسەڵاتێکی بەهێزت لە پشت بێت، ئینجا دەتوانیت پشتی زۆرداری بشکێنی، هەروەکو چۆن یوسف بەو بارە پتەوەی ئابووری و بە پشتیوانی پاشا توانای دەسەڵاتی ئاموون نەهێڵێت و خواپەرستی جێگەی بگرێتەوە، یان لە لێکدانەوەی خەونەکاندا، مانگا مانای ساڵ دەگەیەنیٚ و، خۆر مانای باوك و مانگیش مانای دایك و ئەستێرەش مانای برا دەگەیەنێت، بۆیە باوەڕبوون بە کتێبەکانی خوا هەنگاوێکە بۆ باوەڕهێنانی تەواوەتی بەخوا.

لە قورئاندا هەموو ئەو وێردانە دیاریکراون بۆ ئاسانکاری کردنی باری ژیانت، بۆنموونە: لەسوورەتی(الكهف) دا خوا دەفەرموێت:

وَاذْكُرْ رَبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَى أَنْ يَهْدِيَنِي رَبِّي لأَقْرَبَ مِنْ هَذَا رَشَداً (٢٤)الكهف

﴿.....یادی پەروەردگاریشت بکەوەو ئەگەر شتێکیشت لەبیرچۆوە، ئەوا بڵێٚ: خۆزیا خوا ڕێگەیەکم نیشان دەدات بۆئەوەی لەو شتە نزیك بکەومەوە کە لەبیرم چۆتەوە (یان لێم بزربووە)﴾.

ئەم ئایەتە بەهێزکردنەوەی بیری مرۆڤە، بەوەی چەند جارێك بیخوێنێت بیرکردنەوەکەت بەهێز دەبێت و شتە بزربووەکە دەدۆزێتەوە.

لە بوارە زانستیەکاندا بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە مانگ و خۆر هەریەکەیان خولگەی خۆیان هەیەو شەویش هەرگیز پێش ڕۆژ ناکەوێتەوە، هەروەکو لە سوورەتی (یس)هاتووە:

وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ (٣٩) لا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ (٤٠)يس

﴿مانگیشمان بەپێی پێگەکانی ئەندازەگیری کردووە، هەتا دەگەڕێتەوە وەکو لاسکە خورمای وشك (دەردەکەوێت)، نە خۆر بۆی دەکرێ بگاتە مانگ و، نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێ، هەریەکەشیان لە خولگەی خۆیاندا مەلە دەکەن﴾.

لەبارەی وردەکارییەکانی قورئانەکە خوا دەفەرموێت:

هَذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ (١٣٨)ال عمران

﴿ئەم قورئانە ڕوونکردنەوەیە بۆ خەڵکی و، ڕێگا ڕووناك کەرەوەو ڕێ نیشاندەرە بۆ ئەوانەی لە خوا دەترسن﴾.

ئەم قورئانە بە شێوەیەکی گشتی ڕوونکردنەوەی تێکڕای شتەکانە بۆ هەموو مرۆڤایەتی و، بە شێوەیەکی تایبەتیش ڕێگا ڕووناك کەرەوەو ڕێ نیشاندەرە بۆ ئەوانەی لە خوا دەترسن.

## باوەڕهێنان بە پێغەمبەرەکانی خوا

خوا لەنێو ئادەمیزادەکاندا کەسانێك هەڵدەبژێرێت و ئامادەیان دەکات کە توانای وەرگرتنی پەیامەکانی ئەویان هەبێت و ببنە ڕێبەری بەرنامەکەی خوا لەسەر زەوی، خوا لەبارەی پێغەمبەرەکانەوە دەفەرموێت:

إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُوراً (١٦٣)النساء

﴿ئێمە پەیامان بۆ تۆ کرد، هەروەکو چۆن پەیامان بۆ نووح و پێغەمبەرەکانی دوای ئەویش کرد، پەیامیشمان کرد بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و، دوازدە بەرەبابەکەی نەوەکانی یەعقوب، (**پەیامیشمان کرد بۆ**) عیسا و ئەیووب و یوونس و هارون و سلێمان و، زەبووریشمان بۆ داود هێنا﴾.

وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلاً لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللّهُ مُوسَى تَكْلِيماً (١٦٤)النساء

﴿چیرۆکی زۆر لەو پێغەمبەرانەی پێشووشمان بۆ باسکردی و، پێغەمبەرانیش هەن کە بۆمان باس نەکردوی، خواش بە قسەکردن لەگەڵ مووسا هاتەدوان﴾.

بۆیە پێغەمبەرەکان(سەلامی خوایان لێبێت) کەسانێکن تایبەتمەندیی خۆیان هەیە لە ڕەوشت بەرزیی و ڕاستگۆیی و بە بەزەیی بوون و خۆڕاگریی، تەنانەت خاك کە توانای هەڵوەشاندنەوەی لاشەی هەموو زیندەوەرێکی هەیە، ناتوانێت لاشەی پێغەمبەرەکان لەبەریەك هەڵوەشێنێ، هەموو گەل و نەتەوەیەك لەلایەن پەروەردگارەوە پێغەمبەرێکی بۆ نێرراوە بە زمانی خۆیان بۆئەوەی بەرنامەو ئایینەکەی خوایان پێ بگەیەنێت و بۆیان ڕوون بکاتەوە، بەلای پەیڕەوانی ئایینی ئیسلامەوە، هیچ جیاوازییەك لە نێوان پێغەمبەرەکانی خوادا نیە، چەندە ڕێز لە محمد دەگیرێت، ئەوەندەش ڕێز لە عیسا و مووسا و یەحیا و

ئیدریس و لووت و یووسف و یەعقووب و ئیسحاق و ئیسماعیل و ئیبراهیم و پێغەمبەرەکانی تریش دەگیرێت، (سەلامی خوا لە هەموویان بێت).

خوا لەبارەی پێغەمبەرایەتی محەمەدەوە(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمویێت:

إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ (٥٥)المائدة

﴿بەڕاستی خواو پێغەمبەرو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، ڕابەری ئێوەن، ئەو خاوەنباوەڕانەی کە نوێژەکانیان بەرپێوەدەبەن و زەکات دەدەن و ملکەچی دەنوێنن بۆ پەروەردگاریان﴾.

لەبارەی ڕێزی هەموو پێغەمبەرەکانیش دەفەرموێت:

آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ...(٢٥٨ البقرة)

﴿پێغەمبەرو خاوەنباوەڕەکان، باوەڕیان هێنا بەوەی کە لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆیان هێنراوەتە خوارەوە، هەموو باوەڕیان هێنا بە خواو فریشتەکانی و پێغەمبەرەکانی و (گوتیان): جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەرەکانی خوا....﴾.

لەبارەی محەمەدیشەوە بانگی خاوەن باوەڕەکان دەکات و دەفەرموێت:

إِنَّ اللَّهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا (٥٦ الاحزاب)

﴿بەڕاستی خواو فریشتەکانی پیرۆزیی دەردەبڕن بۆ پێغەمبەرو درودو سەلامی بۆ دەنێرن، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئێوەش پاك و پیرۆزیی بۆ پێغەمبەر دەربڕن و، درودو سەلامی بۆ بنێرن و، بەتەواوەتیش خۆتان بدەن بە دەست دەسەلاتی خواوە﴾.

**کەواتە:** بەپێی دەسەلاتی ئایەتە قورئانیەکە، سەلاوەت دان لەسەر پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەسەرشانی خاوەن باوەڕەکان پێویست کراوە.

# باوەڕهێنان بە قەزاو قەدەر

إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ (٤٩)القمر

﴿ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە دروستکردووە﴾.

فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ الْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَى مَوْتِهِ إِلاَّ دَابَّةُ الأَرْضِ تَأْكُلُ مِنْسَأَتَهُ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ الْجِنُّ أَنْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ (١٤)السبأ

﴿جا کاتێك کە بڕیاری مردنی سلێمانمان دا، هیچ کەس جندوکەکانی ئاگادار نەکردەوە، تەنها مۆرانەی زەوی نەبێت، کاتێك گۆچانەکەی سلێمانی دەخوارد، جا کاتێك کە(لاشەکەی سلێمان) بەربۆوە، (بەهۆی ئەوەی کە گۆچانەکەی مۆرانە خواردبووی)، بۆ جندوکەکان دەرکەوت(ئەوان هیچ لەبارەی دنیای نادیارەوە نازانن)، ئەگەر لەبارەی دنیای نادیارەوە شتێکیان زانیبا، ئەوا (ساڵێك) لەنێو سزای ڕیسواکەردا نەدەمانەوە (لەکاتێکدا کە سلێمان ساڵێك بوو مردبوو، ئەوانیش نەیاندەزانی کە مردووە)﴾.

واتە: باوەڕهێنان بەوەی کە خوا خاوەنی هەموو بڕیارەکانەو ئەندازەگری بۆ هەموو شتەکانیش داناوە، خەڵکانێك بە هەڵە لێکدانەوەیان بۆ ئەم بابەتە کردووە، لەکاتی ڕووداوێکدا بەبێ چوونە نێو هۆکارەکانی ڕووداوەکەوە، یەکسەر دەگوترێت ئەم ڕووداوە قەزاو قەدەرە، خوا ژیانی دروست کردوە، ئەندازەی بۆ هەموو ئەو شتانەش داناوە کە پەیوەندییان بەو ژیانەوە هەیە، بۆنموونە: خوا شەوو ڕۆژی داناوە، ڕۆژ بۆ کارو کاسپی و شەویش بۆ پشوودان، جا ماوەی ئەو شەوو ڕۆژەی بە(٢٤)کاتژمێر داناوە، ئەوە(قەدەر)ەکەیە بە مانای (ئەندازە گیران)، جا کە ماوەکەی بۆ دیاری کردوون، لە خاڵێکی دیاریکراوی ئەو شەش ڕۆژەوە کە ئەو بوونەوەرەی تێدا دروستکرد، فەرمانی بە شەوو ڕۆژ کردووە دەست بەکاربن و ملکەچی فەرمانەکەی خوابن تا کاتێکی دیاریکراو، ئەمەشیان فەرمانی جێبەجێ

کردنەکەیە کە مانای(قضی) دەگەیەنێت، خوا ئادەمیزادی دروستکردووە لە یەککگرتنی تۆوی باوكو هێلکەی دایك، ڕێگەی ڕاستیشی نیشانداوە، لەهەمان کاتیشدا سەربەستی کردوە باوەڕبێنێت یان بێباوەڕبێت، بەلاّم لە یەکێك لە قۆناغەکانی نێو منداڵداندا، دوای چوار مانگ لە ڕێگەی فریشتەیەکەوە، هەندێك بڕیاری بەسەر ئەو کۆرپەیەدا داون، وەکو فەرمان کردن بە کۆرپەکە بەوەی بکەوێتە جووڵە، ئەمە جێبەجێ کردنی فەرمانێکی خوایە مانای(قضی) دەگەیەنێت، ئینجا دیاریکردنی ماوەی بەردەوام بوونی ئەم جووڵەیەش، پێویستە ئەندازەگیریی بۆ بکرێتو لە کاتێکدا کۆتایی پێبێت کە مەبەستی (قەدەر) دەگەیەنێت، لێرەشدا جێبەجێ کردنی فەرمانێکی تری خوا دەست پێدەکات، کە مردنی ئەو ئادەمیزادەیە دوای تەواوبوونی ئەوماوە دیاریکراوەی کە بۆی دانراوە، لە عیلمی ئیستینساخدا، بەهۆی ناوکە ترشی (DNA)یەوە توانراوە هەندێك لە نهێنیەکانی ڕابردووی ئەو زیندەوەرە بزانرێن، بۆنموونە: کە ئیستنساخ لەسەر مانگایەك کرا لە تەمەنی (٦) شەش ساڵیدا، ئەو گوێلکەی کە لە دایك بوو لەهەمان تەمەنی(٦) شەش ساڵیدا بوو، مرۆڤ هەر ئەوەندەی زانیاریی پێدراوە تا ئەوکاتە کە تێیدایەتی زانیارییەکان لەسەر خۆی بزانێت، زانیاری ئەوەی نەدراوەتیّ کە بزانێت بەیانی چی بەسەردێت:

وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ (٣٤)لقمان

﴿هیچ کەسێکیش نازانێت بەیانی چی دەست دەکەوێتو، هیچ کەسێکیش نازانێت لە چ خاکێکدا دەمرێت، بەڕاستی خواش زانایە(**بە هەموو شتێك**)و شارەزاشە (**بە شتە دیارو نادیارەکان**)﴾.

کەواتە: بەپێی ئەم بڕگە یاساییە بنبڕە، دەبێت مرۆڤ باوەڕی بە توانا و دەسەلاّتی خوا هەبێت دەربارەی ڕابردو ئێستاو داهاتووی دروستکراوەکانی.

## باوەڕهێنان بە مردن و زیندووبوونەوە

مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى (٥٥)طه

﴿لە خاك دروستمان كردوون، بۆناو ئەوێش دەتانگێڕینەوەو، لەوێشدا جارێكی تر دەرتان دەهێنینەوە﴾.

دیارە مرۆڤ لە هێلكەی دایك و تۆوی باوكەوە لەنێو منداڵدانی دایكیدا پێكهاتووەو قۆناغ بە قۆناغ گەشەی كردووەو پاشان هاتۆتە دەرەوە، ئینجا ئەگەر كەمێك بگەڕێینەوە دواوە، بۆمان ڕوون دەبێتەوە كە تۆوی باوك و هێلكەی دایكەكانمان لەو بەروبوومانەوە پەیدابوون كە لە خاكەوە وەرگیراون، كەواتە ئەو كەرەسەخاوانەی ئێمەی لێ دروست كراوین لە خاكەوە وەرگیراون، ئینجا كە لە دایك بووین بۆ كاتێكی دیاریكراو، لەسەر ئەم خاكە دەژیەین و پاشان دەمرین، كەواتە هەروەكو چۆن سەرەتا كەرەسەی خاو بووین و لەنێو خاكدا بووین، دوای مردنیش دەگەڕێنرێینەوە نێو ئەو خاكەو لەبەریەك هەڵدەوەشێنرێینەوە، تەنها كلێنچەكەمان دەمێنێتەوە، ئینجا كە كاتی زیندوو كردنەوەمان هات، ئەوا پەروەردگار زیندوومان دەكاتەوە بۆ لێپرسینەوە، پاشان ئەنجامەكانمان وەردەگرینەوە یان بەرەو دۆزەخ یان بەرەو بەهەشت. كەواتە باوەڕبوون بە زیندووبوونەوە، باوەڕەكەت بە تواناو دەسەڵاتەكانی پەروەردگار پتەوتر دەكات.

جا كاتێك لە باری كەسایەتیەكەتدا ئامادەییەكی تەوات هەبوو، پابەندبوونی خۆت بە تاك وتەنهایی خواو بە پێغەمبەرایەتی محمد(صلى الله عليه وسلم)، دەردەبڕیت، بەوەی ڕۆژانە لە پەیوەندی دابیت لەگەڵ ئەو پەروەردگارەو لە بەرانبەریدا ئەركەكانی سەرشانت جێبەجێ بكەیت و داوای یارمەتی و پێویستیەكانتی لێ بكەیت، ئەوەش لە سێبەری بابەتی دووەمدا خۆی دەبینێتەوە، كە نوێژ كردنە.

## بابەتی دووەم

## نوێژ

إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَاباً مَّوْقُوتاً (١٠٣)النساء

﴿بەڕاستی نوێژکردن لەسەر خاوەنباوەڕەکان نووسراوو پێویستکراوێکە کاتی بۆ دانراوە لەلایەن خواوە﴾.

(جابر گێڕاویەتیەوە کە گوێی لە پێغەمبەر بووە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: لەنێوان مرۆڤ و بێباوەڕ بوونو هاوبەشی دانان بۆ خوادا، نوێژ نەکردنە).(٩)

لەکاتێکدا دەروونت بۆ پەرستنی پەروەردگار پاكو ئامادە بوو، ئەوا پێویستە هەوڵ بدەیت جەستەکەشت پاكو ئامادە بێت بۆ ئەنجامدانی هەنگاوەکانی تر، بۆنموونە: پێویستە مرۆڤ شتە پاکەکانو شتە پیسەکان بناسێتو ئەو شتانەش بناسێت کە پاککەرەوەنو پیسیەکان لادەبەن.

### ئەو شتانەی ڕەوانو ئەوانەش کە قەدەغەن

یەکەم: ئاوریشم، بۆ پیاوان قەدەغەیە بیپۆشن یان نوێژی لەسەر بکەن، بەڵام ئافرەتان ڕێگەیان پێدراوە بیپۆشنو نوێژیشی لەسەر بکەن.

دووەم: زێڕ لە پیاوان قەدەغەیەو بۆ ئافرەتان ڕەوایە:

(پێغەمبەری خوا(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: زێڕو حەریر بۆ مێینەکانی ئومەتەکەم ڕەوا کراونو، لە نێرینەکانیش قەدەغە کراون). (١٠)

سێیەم: ئەو ئاژەڵانەی خواردنی گۆشتەکەیان ڕەوایە، دەتوانرێت پێستەکەیان دوای پاککردنەوەیان وەکو جلو بەرگ بەکاربهێنێت، بەڵام ئەو ئاژەڵانەی وەکو سەگو بەراز کە خواردنی گۆشتەکەیان حەرامە، بە هیچ شێوەیەك پێستەکانیان پاك نابنەوەو بەکارناهێنرێن.

## شوێنه قەدەغەكراوەكان

ئەو شوێنانەی نابێت نوێژیان تێدا بكرێت، حەوت شوێنن:

**یەكەم:** قەسابخانە، شوێنی سەربڕینی ئاژەڵ و باڵندە.

**دووەم:** زبڵدان، شوێنی كۆكردنەوەی خاشاكی ڕۆژانە.

**سێیەم:** گۆڕستان.

**چوارەم:** مۆڵگای حوشترو ئاژەڵ.

**پێنجەم:** حەمام، شوێنی خۆشردن.

**شەشەم:** سەرەڕێ، شوێنی هاتن و چوونی خەڵك.

**حەوتەم:** سەربانی كەعبە.

## شتە پیسەكان

### بڕگەی یەكەم:

لە گیانەوەرە زیندووەكاندا قەدەغەیە ئادەمیزاد دەست لە جەستەی سەگ و بەرازو وەچەكانیان بدات، هەموو بەشێكی جەستەی ئەو گیانەوەرانە بە مردوویی یان بە زیندوویی پیسن، هەركاتێك بەر جەستەی ئادەمیزاد كەوتن ئەو شوێنە گڵاو دەبێت و پێویستە پاك بكرێتەوە، ئەمجۆرە پاك كردنەوەیەش بەوە دەبێت كە حەوت جار بشۆرێت، جاری یەكەم بە قوڕاوو جارەكانی تر بە ئاوێكی پاك، قوڕاوەكە دەبێت بە هۆی گڵێكی پاكەوە بێت بۆ هیچ مەبەستێك بەكارنەهێنرابێت، ئاوی قوڕاوی ڕووبارێك یان جۆگەیەك دەشێت لەجیاتی تێكەڵكردنی خۆڵ و ئاو بەكار بهێنرێت.

### بڕگەی دووەم:

هەموو گیانلەبەرێكی مردار بوو پیسە، تەنها جەستەی مرداربووی ئادەمیزادو ماسی و كوللە نەبێت، هەروەها پێست و خوری و تووك و پەڕو مووی هەموو ئەو

زیندەوەرانە کە مرداردەبنەوە پیسن، تۆوی هەموو زیندەوەرێك پیسە، تەنها ئادەمیزادو ئەو گیانەوەرانە نەبن کە گۆشتەکەیان دەخورێت.

**بڕگەی سێیەم:**

هەموو خواردنو خواردنەوەیەك ڕەق بێت یان شل یان گازی ببێتە هۆی لەهۆشچونی ئادەمیزاد حەرامە، مەگەر بۆ کاتێکی دیاریکراو بۆ تێپەڕاندنی نەخۆشییەك بە بڕیاری پزیشکێکی باوەڕپێکراو.

**بڕگەی چوارەم:**

هەرشتێك خۆی پیس بێت بە هیچ شتێك پاك نابێتەوە، وەکو پێستو تووکی سەگو بەراز، بەڵام شتێك خۆی خاوێن بێت وەکو پێستی مەڕ کە مردار بۆوەو سەرنەبڕدرا، دەکرێت پێستەکە بەهۆی هەندێك توخمەوە پاك بکرێتەوەو وای لێ بکرێت بۆ پیشەسازی بەکاربهێنرێت، ئەم پاك کردنەوەیەی پێستیش پێی دەگوترێت: (دەبغ کردن).

**بڕگەی پێنجەم:**

میزو پیسایی ئادەمیزادو گیاندارەکان پیسن، دەبێت خۆیان لێ پاك بکرێتەوە. تەنها میزی حوشتر بۆ چارەسەری نەخۆشیەکان بە توخمێکی پاك دادەنرێت، (دەستەیەك لە خەڵکی(عەرینە) لە بەحرەین، هاتن بۆلای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) باری ژیانی خۆیان بۆ دەربڕی کە تووشی نەخۆشی بوون، ئەویش فەرمووی بڕۆن بۆلای ئەو مێگەلە حوشترەی کە بۆ خێرو چاکەکردن دانراوەو لە شیرو میزەکانیان بخۆنەوە، جا کاتێك کە خواردیانەوە چاك بوونەوە).(١١)

**بڕگەی شەشەم:**

ئەگەر پیساییەك بە شتێکەوە نووسا، ئەوا پیساییەکە لادەدرێتو بەپێی جۆری پیساییەکەش شوێنەکە دەشۆرێت، ئەگەر شوێنەواری سەگو بەراز بوو، ئەوا جارێك بە قوڕاوو شەش جار بە ئاو دەشۆرێت، ئەگەر میزو پیسایی ئادەمیزادو گیانەوەرەکانی تر بوو، ئەوا تەنها جارێك دەشۆرێت، ئەگەر میزی منداڵێکی

شیرەخۆرەی مێینەش بوو، بە هەمان شێوە شوێنەکە دەشۆرێت، بەڵام ئەگەر میزی منداڵێکی نێرینەی شیرەخۆرە بێت، ئەوا شوێنەواری میزەکەی شوردنی ناوێت، تەنانەت ئاوەکەی بەسەردا دەپرژێنیت، بە مەرجێك ئەو منداڵە بێجگە لە شیر هیچ خواردنێکی تری نەخواردبێت.

## بڕگەی حەوتەم:

ئەگەر شتێکی پیس کەوتە نێو ڕۆنێکی مەییو یان پەنیر یان ماستەوە، ئەوە تەنها ئەو بەشەی کە پیسیەکەی پێوەلکاوە فڕێ دەدرێت و ئەوەی کە دەمێنێتەوە پاکە، بەڵام ئەگەر ڕۆنەکە زەیت بێت، یان هەرشتێکی شلەمەنی بێت، ئەگەر پیساییەکی کەوتە ناوەوە هەمووی پیس دەبێت و بە هیچ شتێك پاك نابێتەوە.

## بڕگەی هەشتەم:

خوێن پیسە، بەڵام ئەو بەشە خوێنەی کە بەسەر گۆشتەوە دەمێنێتەوە گۆشتەکە پیس ناکات، ئەگەر نەششۆرێتەوە هەر پاکە.

## بڕگەی نۆیەم:

هەموو کرمێکی میوە هەتا لەنێو میوەکەدا بێت بۆخۆی پاکەو میوەکەش پیس ناکات، مێشەهەنگوینەی مردووش لەنێو هەنگویندا نابێتە هۆی پیسبوونی هەنگوینەکە، مێش و مێشولەو هەنگ و زەردەواڵەو پەپوولە ئەگەر بکەونە نێو خواردن و شلەمەنیەکەوە پیسی ناکەن، تەنها دەردەهێنرێن و فڕێ دەدرێن، مێش کە کەوتە نێو شلەمەنیەکەوە لەوێدا جارێك نقوم دەکرێت و پاشان فڕێ دەدرێتە دەرەوەو خواردن یان خواردنەوەکە پیس ناکات، بەڵام جانەوەرەکانی وەکو مشك و مار، ئەگەر کەوتنە خواردنێکەوەو تێیدا مردن پیسی دەکەن، هەروەها تەڕی پێیەکانی مشکێك خواردنێك پیس ناکەن کە مشکەکە بە زیندوویی بەناویدا تێپەڕێت، دوکەڵی تەپاڵەو قشپل نابنە هۆی پیسبوونی ئەو نانەی لە تەندوورا بەهۆی ئاگری ئەو تەپاڵەو قشپلانەوە دەبرژێت، لەکاتی

مەڕو بزن دۆشیندا ئەگەر قشپل کەوتە نێو دەفری شیرەکەوە، ئەوا شیرەکە پیس ناکات.

جا لەکاتێکدا کە شتە پیسەکان ناسران، پێویستە ئەو هۆکارانەش بزانین کە پیسییەکان لادەبەن، ئەوانیش دوو هۆکاری سەرەکی دروستبوونی ئەم بوونەوەرەن: ئاوو، خۆڵ.

## ئاو

### بڕگەی یەکەم:

ئاو یەکێکە لەو پێکهاتانەی پیسییەکان پاك دەکاتەوە، ئاوێك کە خۆی پاك بێتو پاك کەرەوە بێت، جا ئاوی باران یان بەفر یان تەرزە بێت، ئاوی دەریا یان ڕووبار بێت. خوا دەفەرموێت:

وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لِيُطَهِّرَكُمْ بِهِ وَيُذْهِبَ عَنْكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ (١١ الانفال)

﴿....لە ئاسمانەوە ئاوی بارانتان بەسەردا دەبارێنێ بۆئەوەی پاکتان بکاتەوەو پیسییەکانی شەیتانتان لەسەر لابات....﴾.

### بڕگەی دووەم:

ئاوێك شتێکی پیسی تێکەوتبێتو بووبێتە هۆی گۆڕانی ئاوەکە، ئەو ئاوە خۆشی پیسەو پیسیش پاك ناکاتەوە.

### بڕگەی سێیەم:

ئاوێك شتێکی پاکی تێکەوتبێت بووبێتە هۆی گۆڕانی ئاوەکە، ئەو ئاوە پاکە بەڵام پاك کەرەوە نیە، ئەگەر نەشگۆڕابێت ئەوە پاکیشەو پاك کەرەوەشە.

### بڕگەی چوارەم:

قولەتەین، پێوانەیەکە بۆ ئاوێکی وەستاو کە درێژیو قوڵیو پانی ئاوەکە لە شێوەی شەش لایەکدا بێت درێژی لایەکی باڵو چارەگێك بێت، کە دەکاتە دوو بستو نیو بە بستی ئادەمیزاد، بە کێشانەش دەکاتە (٥٠٠) ڕەتڵی بەغدادی،

ئەوا هەر ئاوێکی وەستاو کە گەیشتبێت بەو ئەندازەیەو هیچی تیَ نەکەوتبێت، یان شتێکی پیس یان پاکی تێکەوتبێت بەڵام نەیگۆڕیبێت، ئەوە ئەو ئاوە پاکو پاك کەرەوەیە، بەڵام ئەگەر ئاوەکە لەو ئەندازەی قولەتەین کەمتر بوو، ئەگەر شتێکی پیسی تێکەوتبێت ئاوەکەی گۆڕیبێت یان نەیگۆڕیبێت، ئەوا ئەو ئاوە بە پیس دادەنرێتو، ئەگەر شتێکی پاکی تێکەوتبێتو ئاوەکەی گۆڕیبێت، ئەوە خۆی پاکە بەڵام پاککەرەوە نیە، ئەگەر شتە پاکەکەش ئاوەکەی نەگۆڕیبێت ئەوە پاكو پاك کەرەوەیە هەرچەند لە قوللەتەینیش کەمتر بێت.

هەر ڕتڵێکی بەغدایی = ١٣٠ درهەم، هەر درهەمێك = ٣,٥ گرام

کەواتە هەر ڕتلێك = ١٣٠× ٣,٥ = ٤٥٥ گرام.

قولەتەین = ٥٠٠ ڕەتڵی بەغدادی

کەواتە قولەتەین = ٥٠٠ × ٤٥٥ = ٢٢٧٥٠٠ گرام = ٢٢٧،٥ کیلۆ ئاو.

## خۆڵ

ئەگەر ئاو دەست نەکەوت، ئەوا خۆڵ بەکاردێت بۆ پاککردنەوە:

﴿ئەگەر هاتوو نەخۆشیش بوون، یان لە گەشت کردن دابوون، یان یەکێکتان لە ئاودەست هاتەوە، یان چوونە پاڵ خێزانەکانتان(بۆکاری جووت بوون)و، ئاوتان دەست نەکەوت خۆتانی پیَ پاك بکەنەوە، ئەوا گڵێکی چاك بە مەبەست بگرن (لەجیاتی ئاو)، جا (بەو گڵە) دەستێکی تۆزاوی بە دەمو چاوو دەستەکانتاندا بێنن....﴾. (٤٣)النساء

واتە: نیەتی تەیەمموم بێننو تەنها دەستێکی تۆزاوی لەو گڵە پاکە بە دەمو چاوو دەستەکانتاندا بێنن، دەستنوێژەکە پێك دێت.

(لە ئیبن عەباسەوە(ڕەزای خوایان لێبێت)، دەڵیَ: لە ڕێوشوێنی پێغەمبەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە بە تەیەممومێك لە نوێژێکی سوننەت زیاتر نەکرێتو بۆ نوێژی داهاتووش جارێکی تر تەیەمموم بکرێتەوە). (١٢)

## پابەندبوون بە داب‌ونەریتە زگماکیەکانەوە

## (الفطرة)

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: داب‌ونەریتە زگماکیەکان دە دانەن:

یەکەم: ئاو لە دەم وەرکردن.

دووەم: ئاو لە لووت وەرکردن

سێیەم: سیواك کردن

چوارەم: کورتکردنەوەی سمێڵ.

پێنجەم: نینۆك کردن.

شەشەم: شۆردنی نێو پەنجەکان.

حەوتەم: لێکردنەوەی موی بنهەنگڵ.

هەشتەم: پاکردنەوەی شوێنی میزوو پیسایی جەستە بە ئاو.

نۆیەم: خەتەنە کردن.

دەیەم: بەر تاشین). (١٣)

(ئەنەسی کوڕی مالیك گوتویەتی: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئەوماوەیەی وا بۆ دیاری کردین کە کورتکردنەوەی سمێڵ‌و نینۆك کردن‌و بەر تاشین‌و هەڵکەندنی مووی بن هەنگڵ، لە چل ڕۆژ تێنەپەڕێت).(١٤)

خەتەنەکردنیش لەسەر موسوڵمانان پێویستە، نێربن یان مێ، خوا دەفەرموێت:

ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (١٢٣)النحل

﴿پاشان(ئەی محەمەد)، پەیامان بۆ کردی، بە شێوەیەکی ڕاست شوێن ڕێبازو ئایینی ئیبراهیم بکەوە، ئیبراهیمیش لە هاوبەشدانەرەکان نەبوو بۆخوا﴾.

ئیبراهیمیش یەکەم کەس بوو کە خۆی خەتەنە کرد:

(پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرموویەتی: (ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت)، خەتەنەکرا بە(القدوم)و ئەو لە تەمەنی هەشتا ساڵان بوو). (القدوم: نوك تیژێکی پەیکەر تاشینە). (١٥)

(ئافرەتێك خەتەنەی مێیینەكانی دەكرد، پێغەمبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، پێی فەرموو: (زیادەڕەوی تێدا مەكە، ئەو خەتەنە كردنە، بۆ چارەو بەختی ئافرەتەكە باشترەو بۆ مێردەكەشی خۆشترە). (١٦)

بەپێی فەرموودەكەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لەو (دە) شتەدا باسی ڕیش نەهاتووە، لەبەرئەوەی مرۆڤەكان سەربەستن لە هێشتنەوەی یان تاشینی، چونكە لە قورئاندا ئایەتێك نیە هێشتنەوەكەی فەرز بكات، یان تاشینەكەی قەدەغە بكات.

## بانگدان

بانگدان سوننەتێكی پێغەمبەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، شیعارێكی ئیسلامیە، بۆ ئاگاداركردنەوەی خەڵك بۆ زانینی هاتنی كاتی نوێژو، كۆبونەوەی خەڵك بۆ ئەنجامدانی، سوننەتە ئەو كەسەی بانگ دەدات دەنگی خۆش بێت، بانگدان تەنها بۆ نوێژە فەڕزەكان ئەنجام دەدرێت، بەم شێوەیەی خوارەوە:

الله اكبر.... الله اكبر، الله اكبر.... الله اكبر

أشهد ان لا اله الا الله... أشهد ان لا اله الا الله...

أشهد ان محمداً رسول الله... أشهد ان محمداً رسول الله...

حي على الصلاة.... حي على الصلاة...

حي على الفلاح.... حي على الفلاح....

الله اكبر.... الله اكبر

لا اله الا الله...

لە بانگدانی نوێژی بەیانیاندا، لە دوای(حى على الفلاح) دووجار دەگوترێت: (الصلاة خير من النوم: نوێژ لە خەو چاكترە)، ئینجا بە دوایدا بانگەكە تەواو دەكرێت.

بانگدان سوننەتە، بەلاّم بۆ کەسێکی موسڵمان کە گوێی لێبێت، لەسەری پێویست دەبێت کە بڕگە بڕگە وەلاّمی بانگەکە بداتەوە، وەلاّمدانەوەکەش بەم شێوەیە دەبێت:

لە سەرەتاوە بڕگە بڕگە وەکو خۆی وەلاّمی بانگەکە دەدەیتەوە، هەتا دەگەیتە (حي على الصلاة)، لە وەلاّمی دووجار(حي على الصلاة)، تۆش دوو جار دەڵێیت: (لاحول ولا قوه الا بالله)، هەروەها لە وەلاّمی دووجار(حى على الفلاح) تۆش دوو جار دەڵێیت: (لاحول ولا قوه الا بالله)، لە نوێژی بەیانیدا، لە وەلاّمی دوو جار(الصلاه خير من النوم)، تۆش دوو جار دەڵێیت: (صدقت وبررت وبالحق نطقت)، ئەوانەی دواتریش وەکو خۆیان دەڵێیتەوە، بەم پێیە کۆتایی بە بانگەکە دێت.

ئینجا کە بانگەکە تەواو بوو سوننەتە هەردووك دەستەکانت بەرز بکەیتەوەو ڕوو بکەیتە کەعبەو بڵێیت: (اللهم صلِّ وسلم وبارك ياربي على النبي الكريم و اله واصحابه، اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة، آتِ سيدنا محمداً الوسيلة والفضيلة والدرجة الرفيعة العلية، وابعثه مقاماً محموداً الذى وعدته انك لاتخلف الميعاد). هەر کەسێکیش ئەو دوعایە بخوێنێت دوای بانگەکە هەر دەکەوێتە بەر پاڕانەوەی پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە ڕۆژی دواییدا.(١٧)

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: پاڕانەوەی نێوان بانگو قامەت ڕەتبوونەوەی نیە لەلایەن خواوە). (١٧ب)

بەلاّم بانگدان بۆ ئەو نوێژانەی کە فەڕز نین، وەکو بانگی نوێژە فەڕزەکان نیە، بانگدان بۆ نوێژی مانگو ڕۆژ گیرانو نوێژی باران بارین، بەم شێوەیە بانگ کەرێك بانگ ڕادێڵێ و، دەڵێت: (ئەی خەڵکینە، نوێژی جەماعەتە، نوێژی جەماعەت، ڕەحمەتی خواتان لێبێت وەرن بۆ نوێژی باران بارین).

وەکو شیعارێکی ئیسلامیش بانگ بەسەر منداڵێکدا دەخوێنرێت کە تازە لەدایك بووبێت بۆئەوەی گوێچکەکانی بە بانگی خوا ئاشنابن، لەکاتی شەڕی

کافرو موسڵمانەکانیشدا بانگو قامەت لێدەدرێت وەکو هێزێکی دەروونی بۆ هاندانی جەماوەری موسوڵمانەکان دژی بێباوەڕەکان، هەروەها لە کاتی کارەساتی لافاوو ئاگرکەوتنەوەدا بانگ دەدرێت، بۆئەوەی کۆمەڵی موسوڵمانان بە هانایانەوە بێن، ئەگەر کەسێکیش بۆ حەجو عومرە، یان بۆ فێربوونی زانست، سەفەرێکی کەوتەبەر، گونجاوە بانگێکی بۆ لێبدرێت، یان بەسەر کەسێکی خەفەتبارو بەرێشاندا، یان بەسەر کەسێکی فێداردا، گونجاوە بانگیان بەسەردا لێبدرێت، بە شێوەیەك هەموو ئەم بانگانە وەڵامدانەوەیان پێویست نیە.

لە نوێژە فەڕزەکاندا، لەدوای پاڕانەوەی دوای بانگدانەکە ئیمامو نوێژکەرەکان نوێژێکی سوننەتی دوو ڕکاتی ئەنجام دەدەن، ئینجا کە نوێژە سوننەتەکە تەواو بوو، ئەوا بانگدەرێك، بانگ ڕادێڵێت بۆ ئامادەبوون بۆ دەستپێکردنی نوێژە فەڕزەکە، ئەم بانگ ڕاهێشتنە پێی دەگوترێت: قامەت، ئەویش بەشێوەی بانگدان تەنها بۆ نوێژە فەرزەکان دەکرێت.

قامەت: کورتکراوەی بانگە، بەم شێوەیە دەگوترێت:

الله اکبر.... الله اکبر،

أشهد ان لا اله الا الله...

أشهد ان محمداً رسول الله...

حي على الصلاة....

حي على الفلاح....

قد قامت الصلاة... قد قامت الصلاة...

الله اکبر.... الله اکبر

لا اله الا الله...

وەڵامدانەوەی قامەتیش پێویستە بڕگە لەدوای بڕگە بێت، وەکو وەڵامدانەوەی بانگەکەو کە گەیشتیتە سەرئەوەی دوو جار بگوترێت: (قد قامت الصلاة)، ئەوا

پێویسته تۆش دوو جار وەڵام بدەیتەوە بڵێیت: (اقامها وادامها وجعلنا من صالحی اهلها)، هەروەها سوننەتیشه دوای قامەتەکەش هەمان دوعای دوای بانگدانەکه جارێکی تر بیڵێیتەوە: (اللهم صلِّ وسلم وبارك ياربي على النبي الكريم و اله واصحابه، اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة، آتِ سيدنا محمداً الوسيلة والفضيلة والدرجة الرفيعة العلية، وابعثه مقاماً محموداً الذى وعدته انك لاتخلف الميعاد).

ئینجا لەم بارەدا ئەگەر نوێژەکه به کۆمەڵ ئەنجام بدرێت، ئەوا پەیڕەوی یاساکانی نوێژی به کۆمەڵ دەکرێت که له باسی ئیمامەتو نوێژی به کۆمەڵدا خراونەڕوو.

## نوێژکردن

پەیوەندیەکی گیانییە لە نیوان خواو بەندەکەیدا، ئەرکەکانی سەرشانت لە بەرانبەری خوادا جێبەجێ دەکەیت و، داوای مافەکانی خۆشت دەکەیت.

## خۆ ئامادەکردن بۆ نوێژکردن

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرموویەتی: کەسێك دەستنوێژەکەی بەو شێوەیە بشوات کە خوا فەرمانی پێ کردووە، ئەوا (ئەنجامدانی)نوێژە فەرزەکان دەبنە هۆی پاککردنەوەی گوناهەکانی ماوەی نێوان نوێژەکان).(١٨)

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ڕێگەی بە کەسێك نەداوە تەنگاو بێت و نوێژەکەی ئەنجام بدات).(١٩)

لە ئایینی ئیسلامدا بۆ دەستکردن بە جێبەجێ کردنی هەندێك لە ئەرکەکان، پێویستە دەستنوێژ بگیرێت، وەکو: هەستان بۆ نوێژکردن، یان سوڕانەوە بەدەوری کەعبەدا، یان هەڵگرتن و کردنەوەی قورئان، ئینجا بۆ خوێندنەوە بێت، یان بۆ گواستنەوەی بێت، یان بۆ سوێندخواردن بێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: دەست لە قورئان مەدە، تەنها ئەوکاتە نەبێت کە پاکیت). (٢٠)

جا بۆ جێبەجێ کردنی دەستنوێژەکە، واچاکە سەرەتا مرۆڤ بچێت دەست بەئاو بگەیەنێت و، خۆی لە پاشەڕۆکان بەتاڵ بکات و، پاش و پێشی خۆشی جوان بە ئاو پاك بکاتەوە، ئەگەر ئاویشی دەست نەکەوت، دەتوانێت(٣)سێ بەرد بەکاربێنێت بۆ خۆپاککردنەوە، بەمەرجێك پیساییەکە بە شوێنەکەیەوە وشك نەبووبێتەوە، واش باشترە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارانە دەستی چەپ بەکاربهێنرێت، پاککردنەوەی کۆمی ئادەمیزاد پێویست نیە لە کاتی دەرچوونی بایەك یان کرمێك، ئەگەر تەڕاییەکی کەمیش لەدوای خۆیان جێهێڵن، لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەریشە(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لەوکاتەدا کە نیازت

وایە بچیتە ژووری ئەدەبخانەکە، ئەگەر ئونگوستیلەت لەدەستدا بێت داینێیت، ئەگەر شتێکیشت پێبێت ناوی خوای لیٚ نووسرابێت، ئەوا نەیبەیتە ژوورەوە، قاچی چەپ بەریتە ژوورەوەو بڵێیت: (بسم الله اللهم اني اعوذ بك من الخبث و الخبائث): بەمانای: (بەناوی خوا، ئەی پەروەردگاری من، خۆم لە پەنای تۆدا دەگرم لە جندوکەی نێرو میٚ)، لە کاتێکیشدا کە دێتەدەرەوە قاچی ڕاست بهاویتە دەرەوەو بڵێت: (الحمد لله الذى اذهب عني الاذى وعافاني): بە مانای: (سوپاس بۆ ئەو خوایەی شتە خراپەکانی لەسەر لابردمو تەندروستی پێدام)، هەروەها واگونجاوە لە چۆڵەوانیدا، ڕووت یان پشتت لە قیبلەو مانگو ڕۆژ نەکەیت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ئەگەر چوون بۆ ئاودەست، پشتو ڕووی خۆتان مەکەنە قیبلە). (٢١)

هەروەها لە خراپەکاریەکانە ئەگەر یەکێك لەکاتی دەست بەئاوگەیاندندا، ناوی خوا بێنێت، یان قسە بکات، ئەگەر لە چۆڵەوانیش بوویت، وا پێویست دەکات ئەوەندە دوور بکەویتەوە کەس هەست بە بۆنو دەنگەکان نەکات، هەروەها لە چۆڵەوانیدا نابێت میزو پیسایی بکرێنە ئاوێکی وەستاوەو، نابێت میز بکرێتە ناو کونی جانەوەرەکانی زەویەوەو، نابێت بە پێچەوانەی ئاراستەی (با) میز بکرێت، هەروەها قەدەغەیە، پیسایی کردن لەسەر ڕێگایەکی گشتی، یان لەشوێنی کۆبوونەوەی خەڵکی، یان لە بن دارێکی بەردار، گونجاو نیە میزو پیسایی بە پێوە بکرێن، زۆر پێویستە مرۆڤ خۆی لە پرپشکی میزەکان بپارێزێتو، دوای میزکردنیش هەوڵ بدات ناو ئەندامی میزکردنەکەی زۆر بەجوانی خاوێن بکاتەوەو پاشان بیشوات، واش باشترە لە کاتی پیسایی کردندا، مرۆڤەکە خۆ بەلای چەپدا داگرێت، چونکە ئاسانکاریی دەکات بۆ هاتنەدەرەوەی پاشەڕۆکەکانو زۆر نامێنیتەوە،

(پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فێری کردین: ئەگەر چووینە ئاودەست، خۆمان بەلای چەپدا داگرین). (٢٢)

گونجاونیە یەکێك لە شوێنی خۆشردنەکەیدا میز بکاتو پاشان دەستنوێژیش هەر لەو شوێنە هەڵگرێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: با کەسێك لەئێوە لە شوێنی خۆشردنەکەی میز نەکاتو پاشانیش هەرلەوێ دەستنوێژ هەڵگرێت، لەبەرئەوەی زۆرینەی دڵەڕاوکێکان لەو کارەوەن). (٢٣)

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: خۆتان لە میز پاك کەنەوە، چونکە زۆرترینی سزاکانی ناو گۆڕ بەهۆی میزەوەن). (٢٤)

## دەستنوێژ

واچاکە ئەو ئاوەی دەستنوێژی پێ دەشۆرێت نەخرێتە بەر تیشکی خۆر بە مەبەستی گەرم کردنی.

(عائشە(ڕەزای خوای لێبێت) ئاوی لەبەر خۆر گەرم کردبوو بۆ دەستنوێژ، پێغەمبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: (ئەی سپیلکۆکە، وامەکە ئەوە گەڕی بەدوای خۆیدا دێنێ).(٢٥)

ئەو هەنگاوانەی کە پێویستن بۆ ئەنجامدانی دەستنوێژ بە تەواوی، شەشن:

### یەکەم:

نیەت هێنان بۆ ئەنجامدانی دەستنوێژ، لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەرە(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، سەرەتا (بسم الله)بکەیت ئینجا لە دڵی خۆتا، یان بە دەنگەوە دەڵێیت: نیەتم وەهایە بێ دەستنوێژی لەسەر خۆم لادەبەم، یان دەڵێیت: نیەتم وایە ئەرکی دەستنوێژ بەجێبهێنم، گرنگ نیە ئەو شوێنەی دەستنوێژەکەی لێ هەڵدەگریت ڕووت یان تەنیشتت یان پشتت لە قیبلە بێت، ئینجا هەردووك دەستەکانتو ناو پەنجەکانت بە جوانی دەشۆیت.

(پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێك لەئێوە لە خەو هەستا، با یەکسەر دەست نەخاتە دەفری ئاوی دەستنوێژەکەوە پێش ئەوەی سێ جاران بیانشوات، چونکە ئێوە نازانن لەکاتی خەوتنەکەتاندا دەستەکانتان لەکوێی جەستەکەتان بوون). (٢٦)

ئینجا ئاو لە دەم و لووت وەردەکرێت.

دووەم:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ....(٦ المائدة)

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر هەستان بۆ نوێژکردن و(دەست نوێژتان نەبوو)، ئەوا ڕووی خۆتان و دەستەکانتان تا ئانیشکەکان بشۆن، دەستی تەڕیش بەسەرتاندا بێنن، قاچەکانیشتان تا گوێزینگەکان بشۆن(وەکو چۆن دەستەکان تا ئانیشکەکان دەشۆن)....﴾.

شۆرینی ڕووی ئادەمیزاد لە سەرەتای توکی سەریەوە بۆ ژێر چەناگەی، بە پانی ئەو ڕووبەرەی کە دەکەوێتە نێوان گوێچکەکانیەوە، هەروەها لە کاتی شۆرینی ڕووی ئادەمیزاددا پێویستە هەموو بەشەکانی وەکو لوت و بڕوو سمێڵ و کوڵمەکان بشورێن و ئاو لە لوت و دەم وەربکرێت و پەنجە بەناو دەم و ددانەکاندا بهێندرێت و بە پەنجەش پێشەوەو پاشەوەی گوێچکەکان خاوێن بکرێنەوە، لەڕەوشتەکانی پێغەمبەریشە(صلى الله عليه وسلم) لە ئەنجامدانی هەموو ئەم کارانەدا لای ڕاست بخرێتە پێش لای چەپەوە.

ئینجا کە لە شۆردنی دەموچاوی بۆوە بڵێت: (خوایە ئەو ڕۆژەی کە ڕووەکان ڕەش دەکەیت ڕووی من سپی بکە).

سێیەم:

شووردنی هەردووك دەستەکانە تا مەچەك و ئانیشکەکان، بەڕوپشتی دەستەکان و ناو پەنجەکان بە جوانی دەشۆرێن و دەستی بڕدراوەش ئەوەندەی

دەشۆرێت کە ماوەتەوە هەتا ئانیشکی، بە پەنجەی دەستەکانیشت تەڕایی ئاو بە ناوەو دەرەوەی گوێچەکاندا دێنیت، لەهەموو بوارەکاندا شوردنەکان لە سێ جار کەمتر نین و لە سێ جاریش تێناپەڕن.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەستنوێژی هەڵگرت، هەر ئەندامەی سێ جاران دەشرد، جا کە لێبوٚوە فەرمووی: ئەوەی بینیتان دەستنوێژ بوو، جا هەر کەسێك لێی زیاد بکات یان لێی کەم بکاتەوە، ئەوە خراپەکاریو ستەمی کردووە).(٢٧)

لەکاتی شۆرینی دەستەکان تا ئانیشکەکان واچاکە شوردنەکە لە دەستەکانەوە بەرەو ئانیشکەکان بێت و بڵێیت: (خوایە نامەی کردارەکانم بدە دەستی ڕاستم).

چوارەم:

پێداهێنانی دەستێکی تەڕ بەسەر سەردا، ئەگەر لەباتی ئەو دەستە تەڕەش، ئەو کەسە هەموو سەری بشۆرێت، ئەوە باشترە، ئینجا بڵێیت: (خوایە پرچ و پێستم لە ئاگر بپارێزە)، یان سەڵەوات لە پێغەمبەر بدات(صلى الله عليه وسلم).

پێنجەم:

شووردنی هەردووك پێیەکانە هەتا گوێزینگەکان، وا پێویستە نێو پەنجەی پێیەکان بەجوانی بشۆرێن و کرداری شوردنی پێیەکانیش هەتا سەرووی گوێزینگەکان بگرێتەوە، ئینجا بڵێیت:( خوایە قاچەکانم لەسەر ڕێگەی ڕاست جێگیر بکە).

لە ئایەتەکەدا ئەو(و) واوەی پێش (و ارجلكم) باسی قاچەکان هەتا گوێزینگەکان دەباتەوە بۆ دوای ئەو باسەی کە بەخۆی دەچێت (دەستەکان هەتا ئانیشکەکان) کە پێویستکراوە بشۆرێن، کەواتە لێرەدا مەبەست لە شۆردنی قاچەکانە هەتا گوێزینگەکان.

((عەمرووی کوڕ عەبسە) دەڵێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا دەستنوێژ چۆنە؟ فەرمووی: دەستنوێژ ئەوەیە کاتێك کە تۆ دەستەکانت شردن و پاکت کردنەوە، تاوانەکانت لەنێوانی نینۆکەکان و پەنجەکانتدا دەچنەدەرێ، ئەگەر ئاوت لە دەمو لووتی خۆت وەرکردو دەمو چاوی خۆت شردو باسکەکانت هەتا ئانیشکەکان شردن و دەستێکی تەڕت بەسەرتدا هێناو قاچەکانت هەتا گوێزینگەکان شردن، ئەوا لە هەموو تاوانەکان خۆت پاك کردۆتەوە، جا ئەگەر ڕووی خۆت بکەیە خوا، ئەوە لە هەموو تاوانەکانت ڕزگارت دەبێت و وەکو ئەو ڕۆژەت لێدێتەوە کە لە دایك بووی). (٢٨)

لەکاتی سەفەرکردن یان چوون بۆ جەنگ دەکرێت ئەوانەی کاڵەیان لەپێیە کە دەستنوێژیان هەڵگرت و قاچیان خستنە ناو کاڵەکانەوە، بۆماوەی سێ شەوو سێ ڕۆژان، ئەگەر جارێکی تر دەستنوێژیان هەڵگرتەوە، ئەوا پێویست بە شۆردنی قاچەکان ناکات، تەنها دەتوانرێت دەستێکی تەڕ بەسەر کاڵەکاندا بهێنرێت، بە مەرجێك کاڵەکان لە کونی پەتەکانیانەوە تەڕایی و پیسایی دانەدەنە ناو قاچەکانەوەو بە تەواویش هەموو بەشی قاچەکان داپۆشن، جا ئەگەر کاڵەکان بۆخۆیان پیسییەکیان پێوە بێت، ئەوە مەسحیان لەسەر ناکرێت و لەوکاتەدا ئەو دەستنوێژە بە مەسحی سەر کاڵەکان پێك نایەت، ئەگەر کاڵەکان لە پێستی سەگ وبەراز دروست کرابن، ئەوە هەر گونجاونیە لەپێ بکرێن، ئەگەر لە پێستی ماڵاتی مرداوەرەوە بووش دروست بکرێن دروست نیە نوێژیان پێوە بکرێت ئەگەر دەباغ نەکرابن، پێستی شێریش ئەگەر توکی پێوە نەمابێت و خۆش (دەبغ) کرا بێت، ئەوە گونجاوە نوێژی پێوە بکرێت، پێستی ئەو گیانەوەرانەش کە گۆشتیان دەخورێت دوای سەربڕینیان دەتوانرێت بکرێن بە کاڵەو ئەگەر خۆشیش نەکرابن دەکرێت نوێژیان پێوە بکرێت، بۆ کەسێکیش کە لەنێو ماڵ و حاڵی خۆیدا بێت، ئەوا ماوەی شەوو ڕۆژێك بۆی هەیە لەجیاتی شۆردنی قاچەکانی مەسحی سەر کاڵەکانی بکات، کەسێك کە خۆشردنی لەسەر

پێویســت بــوو، پێویســته کاڵـەکانی دانیێـت و قاچەکانیشــی لەگــەڵ هــەموو جەستەکەیدا بشوات، لـەپێکردنی گـۆرەوی شـوێنی کاڵـەکان ناگرێتـەوە، بـەڵام دەتوانرێت گۆرەوی لە پێ بکرێت و لەسەر ئەویشەوە کالەکان لە پێ بکرێن، لە هەموو بارەکاندا تەنها کاڵەکان مەسح دەکرێن.

**شەشەم:**

پێویستە ئەم پێنج هەنگاوانەی سەرەوە، یەك لـەدوای یـەك ئـەنجام بدرێن، جا ئەگـەر کەسـێك نیـەتی دەسـتنوێژی هێنـاو خـۆی هەڵدایـە نـاو ئاوێکـەوەو هاتـەدەرەوە، ئـەوا دەستنوێژەکەی پێك دێـت، بـەڵام لـەژێر دوشـێکدا پێویستە نیـەتی دەسـتنوێژ بهێنرێـت و بـە تـەرتیب لەسـەرەوە بـۆ خـوارەوە ئەندامـەکانی دەسـتنوێژ بشـۆرێن، ئەوسـا دەسـتنوێژەکە پێـك دێـت، بـەڵام ئەوکەسـە دەبێـت وریا بێت لە کاتی خۆ وشك کردنـەوەدا لـەپی دەسـتی بـەر پـاش و پێشـی خـۆی نەکەوێت، دەنـا دەسـتنوێژەکەی دەشـکێت، لەڕەوشـتەکانی پێغەمبـەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دوای دەستنوێژ هەڵگرتن، ڕوو بکاتە قیبلەو بڵێت: (اشـهد ان لا الـه الا الله وحـده لاشـريك لـه، وان سـيدنا محمـداً عبـده ورسـوله، اللـهم اجعلـني مـن التـوابين و اجعلـني مـن المتطهـرين، سـبحانك اللـهم وبحمـدك، اشـهد ان لاالـه الا انت استغفرك واتوب اليك)، ئینجا دەستەکانی دابگرێت و سوورەتی(انا انزلنا) بخوێنێ.(٢٩)

پێویستە مرۆڤ ئاگاداری خوتخوتەی شەیتان بێت لە کاتی دەستنوێژ گرتندا.

(پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویـەتی: دەسـتنوێژ شـەیتانێکی هەیـە ناوی (ولهان)ە، جا خۆتان لە خوتخوتەی ئاو بپارێزن).(٣٠)

## هۆیەکانی نەمانی دەستنوێژ

یەکەم: خەوتن، یان لەهۆشچوون.

دووەم: بەریەك کەوتنی پێستی نێرو مێ تەنها ئەوانە نەبن کە لە یەکتری قەدەغەکراون و بە یەکتر ناشێن.

سێیەم: هاتنەدەرەوەی هەر شتێك لە پاش یان لە پێشەوەی ئادەمیزاد، شل بێت یان توند یا گاز.

(پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەبارەی (المذي): (ئەو شلەیەی لە کاتی دەستبازیدا لە دامێنی پیاو دیتە دەرەوە)، پرسیاری لێکرا: (ئایا دەستنوێژ دەشکێنێت یان نا)؟ ئەویش فەرمووی: دەبێت دەستنوێژی بۆ بگیرێتەوە، لە هاتنەوەی تۆوییشدا، دەبێت خۆ بشۆردرێت).(٣١)

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (کەسێك دەستنوێژی هەبێت، دەنگی (ترێك) یان بۆنی(فسێك) دەبنەمایەی ئەوەی دەستنوێژەکەی هەڵگرێتەوە).(٣٢)

واتە بوونی جووڵەیەك یان قۆرەقۆڕێك لەناو زگدا، کە نەبێتە مایەی هاتنە دەرەوەی باوبژەکە لەسەر شێوەی تڕ یان فس، نابێتە هۆی نەمانی دەستنوێژەکە.

چوارەم: بەریەك کەوتنی پێستی پیاو ژن دەستنوێژ دەشکێنێت، لە بڕگەی پێنجەمدا ئەم بابەتە ڕوونتر دەردەکەوێت.

پێنجەم: بەرکەوتنی دەست و پەنجەکانی مرۆڤێك نێر بێت یان مێ بە دامێنی خۆی، دەستنوێژی دەشکێنێ.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لەئێوە دەستی بە دامێنی خۆی بکەوێت، با دەستنوێژەکەی هەڵگرێتەوە). (٣٣)

کەواتە دەستنوێژ شکانەکە لە بەرکەوتنی جۆری پێستەکانەوە ڕوودەدات، تەنانەت پێستی ناو لەپی دەستەکانیشت ئەگەر بەر دامێنت بکەوێت، دەتوروژێنێت، پێستی ئافرەتیش لەو جۆرەیانەیە کە وروژێنەرە، بۆیە

بەدڵنیاییــەوە بەرکــەوتنی پێســتی نێرینــە بــە پێســتی مێیینــە دەســتنوێژەکە دەشــکێنێت، مەگــەر لــە بــاری بــێ ئاگاییــدا بێــت و نــەزانرێت کــە بــەر یــەکتری کەوتوون.

(ئومەیمــەی کچــی ڕەقیقــە دەڵێــت: لەگــەڵ چــەند ئافرەتێکــدا هــاتین بــۆلای پێغەمبــەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بۆئــەوەی بــە ڕابــەری خۆمــانی هەڵبژێرینــەوە، پێــی فەرموویــن: من دەستم ناخەمە ناو دەستی ئافرەتانەوە، (بۆئــەوەی پــەیمانتان لێ وەربگرم)، بەڵام ئەوەندەی پێتان دەکرێت و لەتواناتان دایە تێکۆشن). (٣٤)

(عائیشــە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێــت: ســوێند بــە خــوا هــەرگیز پێغەمبــەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەستی بە دەستی ئافرەتێك نەکەوتووە، کە دەشهاتن بۆلای بۆئــەوەی بە ڕابەری خۆیان هەڵیبژێرنەوە، ئەوە تەنها بە قسەکردن هەڵیان دەبژاردەوە). (٣٥)

شەشــەم: خــوێنی بــێ نوێــژی مانگانــەو خــوێنی زەیســتانی دوای منــداڵ بــوون، ئافرەت بێ بەش دەکەن لە دەستنوێژ هەڵگرتن.

(پێغەمبــەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویــەتی: ئەگــەر خــوێنی مانگانــە هــات، ئــەوا نوێژەکان وازیان لــێ دەهێنرێن). (٣٦)

# خۆشردن

وَإِن كُنتُمْ جُنُباً فَاطَّهَّرُواْ.....(٦ المائدة)

﴿....ئەگەر هاتوو لەشیشتان پیس بوو، ئەوا خۆتان پاك بكەنەوە....﴾.

لای هەرەكەمی خۆشردن، تەڕكردنی جەستەو دەست پێداهێنانی ئەندامەكانە.

ئەو هۆكارانەی دەبنەهۆی ئەوەی هەموو جەستەی ئادەمیزاد بشۆرێت، شەشن:

یەكەم: مردن، هەر كەسێك مرد دەبێت بشۆرێت، مەگەر كەسێك لەپێناوی خوادا لە شەڕی بێباوەڕەكان شەهید كرابێت، ئەوە شووردنی ناوێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی كرد كوژراوەكانی شەڕی ئوحود بە خوێن‌و جل‌و بەرگەوە بنێژرێن‌و نەشۆرێن‌و نوێژیشی لەسەر نەكردن). (٣٧)

دووەم: پاكبوونەوەی ئافرەتە لە خوێنی بیٚ نوێژی مانگانە(حەیز)، ئەو خوێنە لە مێیینەدا بەلای كەمیەوە لە تەمەنی نۆسالآنە دەردەكەوێت‌و لە زۆرینەیەكیشدا لە تەمەنی بیست سالآن پەیدا دەبێت‌و مێیینەی وەهاش هەیە لە تەمەنی (٦٢) شەست‌ودوو سالٚی ئەو خوێنەی لیٚ دەردەكەوێت، ماوە هەرە درێژەكەی ئەم خوێن هاتنە لە(١٥)پازدە شەوو ڕۆژ تێناپەڕێت، زۆرینەی ئافرەتانیش شەش تا حەوت ڕۆژ تووشی دەبن، كەمترین ماوەی نێوان دوو خوێن پێداهاتنیش هەرگیز لە پازدە ڕۆژ كەمتر نابێت، جا ئەگەر دوو خوێن بە مێیینەیەكدا هاتن ماوەی نێوانیان (١٥)ڕۆژ كەمتر بوو، ئەوا بەدڵنیاییەوە یەكێك لەو خوێنانە حەیز نیە، پێویستە پیاوان لە ماوەی بیٚ نوێژیدا نزیك ئافرەتەكانیان نەكەونەوە بۆكاری جووت بوون تا پاك دەبنەوە، هەروەكو خوا دەفەرموێت:

فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ (٢٢٢)البقرة

﴿لەكاتی حەیزدا دەست لە ئافرەتەكانتان بكێشنەوە(بۆ كاری جووت بوون)و، نزیكیشیان مەكەونەوە تا پاك دەبنەوە، ئینجا ئەگەر پاك بوونەوە، بچنە لایان

بەو شێوەیەی کە خوا فەرمانی پێ کردوون، بەڕاستی خوا تۆبەکارەکانی خۆش دەوێت و، ئەوانەشی خۆش دەوێت کە خۆیان پاك دەکەنەوە﴾.

پیاوەکان تەنها بۆ کاری جووتبوون ژنەکانیان لێ قەدەغە کراون، لەسەروی ناوك و خوارووی ئەژنۆکانەوە بۆیان هەیە لەزەت لەیەکتری وەرگرن:

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: لەماوەی خوێنی مانگانە وەکو ژن ومێرد هەموو هەڵسوکەوتێك بکەن تەنها بۆ جووت بوون نزیکی یەکتر مەکەونەوە).(٣٨)

خوێنی حەیزیش ڕەنگی ڕەشە، بۆیە بە ڕەنگەکەی لە خوێنەکانی تر جیادەکرێتەوە، هەروەها ئەم ئافرەتانە لەو ماوەی خوێن پێداهاتندا ناتوانن قورئان هەڵبگرن و بیکەنەوەو بیخوێننەوەو هەتا پاکیش نەبنەوە ناتوانن سوڕانەوەکانی دەوری کەعبە ئەنجام بدەن.

سێیەم: پاك بوونەوەی ئافرەتە لە خوێنی زەیستانی(النفاس) دوای منداڵ بوون، لە زۆرینەی ئافرەتاندا دوای منداڵ بوونەکە ماوەی چل ڕۆژ دەخایەنێت، بەڵام خوێن بەربوونێك هەیە پێی دەگوترێت(الاستحاضة) بەهۆی نەخۆشییەوە لە دامێنی ئافرەتەوە دێتە دەرەوە، هاتنە دەرەوەی ئەو خوێنە خۆشردن لەسەر ئەو ئافرەتە پێویست ناکات، تەنها دەستنوێژەکەی دەشکێنێ، حوکمەکەی وەکو حوکمی چرکە میزە وایە دەبێت یەکسەر دوای بانگدان دەستنوێژەکە هەڵبگیرێت و لۆکەی پێوە ببەسترێت و لەگەڵ هەموو نوێژێکدا شوێنەکەی پاك بکرێتەوەو دەستنوێژێکی تازەی بۆ هەڵبگیرێتەوەو بە پەلە نوێژەکەی بکات.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: خوا هیچ نوێژێك وەرناگرێت کە نوێژکەرەکە خۆی پاك نەکردبێتەوە). (٣٩)

چوارەم: جیابوونەوەی منداڵ لە ئافرەتێك کە هیچ خوێن و تەڕییەکیشی لەگەڵ نەبێت، ئەوا پێویستە ئەو ئافرەتە خۆی بشۆرێت.

**پێنجەم:** بەهۆی چوونە ناوەوەی سەری زەکەری نێرینە بۆ ناو دامێنی ئافرەت، ئەوا خۆشردن لەسەر هەردووکیان پێویست دەبێت، ئەگەر پیاوەکە تۆویشی نەهاتبێتەوە، جا ئەگەر هاتوو کەسێك سەری زەکەری بڕدرابوو، ئەوا لەوەی کە ماوە بە ئەندازەی سەرە بڕدراوەکە ئەگەر کرایە دامێنی مێیینەکە، ئەوا خۆشردن پێویست دەکات لەسەر هەردووکیان، بەلاَم ئەگەر هاتوو زەکەرە بڕدراوەکە بە جیا بەکارهێنرا بۆناو دامێنی مێیینەیەك، ئەوا خاوەن زەکەرە بڕدراوەکە خۆشردنی لەسەر نیە تەنها مێیینەکە لەسەریەتی.

**(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ئەگەر دوو ئەندامە خەتەنەکراوەکە بەیەك گەیشتن و سەری ئەندامی نێرینەکە دیارنەما(چووە ناو خەتەنەکراوی ئافرەتەکەوە)، ئەوا خۆشردنەوە پێویست دەبێت(لەسەر هەردووکیان)).(٤٠)**

بەلاّ ئەگەر هاتوو نێرینەکە جووتبوونەکەی ئەنجام داو، ویستی بۆ جاری دووەمیش ئەنجامی بداتەوە، ئەوا جووتبوونەکەی جاری یەکەم خۆشردنەوەی ناوێت، تەنها دەستنوێژێك دەگرێت و دەست بە جووتبوونی جاری دووەم دەکات.

**(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە چووە لای خێزانەکەی و کارەکەی ئەنجامداو ویستی بۆ جاری دووەم کارەکە ئەنجام بداتەوە، ئەوا با دەستنوێژێك بشوات ئینجا دەست بە جاری دووەم بکات).(٤١)**

ئەگەر هاتوو لەدوای جووتبوونەکانیش ویسترا نان بخورێت پێش خۆشردنەوە، ئەوا دەستنوێژێك دەشۆرێت.

**(عائشە(ڕەزای خوای لێبێت)، دەڵێ: پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (دوای جووتبوون)، ئەگەر لەشی پاك نەبایەو ویستبای خواردنێك بخوات، ئەوا دەستنوێژێکی دەشرد).(٤٢)، (٤٣)**

**شەشەم:** دەرچوونی تۆو (مەنی) لە جەستەی نێرینە، مەنی: تۆوی نێرینە هەر کاتێك بە شێوازەکەی خۆی هاتەدەرەوە، ئەوا خۆشردن پێویست دەکات لەسەر

خاوەنەکـەی، ئینجـا ئـەم هاتنەدەرەوەیـە بـەهۆی جووتبوونـەوە بێـت لەگـەڵ مێیینەیەکدا، یان بەهۆی خەونەوە بێت، یان بەهۆی بینینی دیمەنێکی سەرنج راکێشـەوە بێـت، هـەرکاتێك تۆوەکـە بـە تـەکان هاتـەدەرەوە لـەزەتێکی دا بـە خاوەنەکەی، ئەوا خۆشردن پێویست دەبێت، جا لەکاتێکدا کە تۆوەکە کرایە دامێنی مێیینەیەکەوەو مێیینەکەش دوای جووتبوونەکە خۆی شرد، پاشان ئەو تۆوەی لەنێو دامێنەکەیدایە وردە وردە هاتەوەخوارەوە، ئەوا جارێکی تر خۆشردنەوە پێویست نابێت لەسەر ئەو ئافرەتە، بەڵام پیاوەکە پێویستە پێش خۆشـردنەوە میزێك بکات، بۆئەوەی هیچ تۆوێك لەنێو ڕێڕەوەکەدا نەهێڵێت ئینجا خـۆی بشـوات، چونکە هاتنەخوارەوەی هەر پاشماوەیەکی ئەو تۆوە دەبێتەهۆی ئەوەی جارێکیتر خۆشـردنی لەسـەر پێویسـت ببێـت، لەبەرئەوەی ئەسڵی خۆشردنەکە بەهۆی تۆوەوە بەسەریدا سەپێنراوە.

ئافرەتانیش ئەگەر بەهۆی خەونەوە یان بەهۆی بینینی دیمەنێکەوە ئاویان بێتەوە، خۆشـردنیان لەسـەر پێویسـت دەبێـت، ئەگـەر پیاویشـیان نزیـك نەبووبێتەوە.

(دایکی سولەیم هات بۆلای پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) گوتی: ئەی پێغەمبەر، خوا شەرم لە دەربڕینی ڕاستی ناکات، ئایا ئەگەر ژنێك لە خەودا شەیتانی بوو، خۆی بشواتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ کە ئاوی هاتەوە با خۆی بشواتەوە). (٤٤)

حەج و عومرە هێنانەوە بە خۆشـردنێکی تایبەت دەست پێدەکەن، هەروەها خۆشردنی پێش نوێژی هەینیش لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەرە(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

تێبینی: لە ماوەی هاتنەخوارەوەی خوێنی حەیزو خوێنی نەفاسدا، نێرەو مێیەکان لەیەکتری قەدەغە دەکرێن هەتا خۆیان دەشۆن و پاك دەبنەوە.

# پێکهاتەو جێبەجیٚ کردنی نوێژ

نوێژ لەسەر بەندەکان پێویست کراوە، ئەگەر لەکاتی خۆیدا بۆیان نەکرا، ئەوا بەسەریانەوە دەبێت بە قەرز.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: کەسێك خەوی لێکەوتبوو یان لە بیری کرد نوێژێکی ئەنجام بدات، ئەوە کەی بیری کەوتەوە با نوێژەکەی بکات).(٤٥)

تەنها ئەو نوێژانەی ئافرەت کە بەهۆی خوێنی بیٚ نوێژییەوە لێیان بێبەش دەبێت نابن بە قەرز بە ئەستۆیەوە:

(عائشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵیٚ: لەسەردەمی پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، تووشی خوێنی بیٚ نوێژی دەبووین، پاشان پاك دەبووینەوە، ئەویش فەرمانی پیٚ دەکردین ڕۆژووەکانمان بگرینەوەو فەرمانیشی پیٚ نەدەکردین نوێژەکانمان بکەینەوە).(٤٦)

بۆ ئەنجامدانی هەر نوێژێکی فەرز پێنج مەرج هەیە:

**یەکەم:** زانینی هاتنی کاتی نوێژەکە، تەنانەت سوننەتی پێش نوێژەکەش هەتا کاتی نوێژەکە نەیەت جێبەجیٚ ناکرێت.

**دووەم:** ڕووکردنە قیبلە، لەم بارەیەوە پەروەردگار لە سوورەتی بەقەرەدا دەفەرموێت:

فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوِهَكُمْ شَطْرَهُ (١٤٤)البقرة

﴿جا ڕووی خۆت بکە ئاراستەی (مسجد الحرام)و لەهەر شوێنێك بوون ئەوا ڕووی خۆتان بکەنە ئاراستەی مزگەوتەکە...﴾.

قیبلەی موسوڵمانان:ماڵە چوارلایەکەی خوایە بە کەعبە ناسراوەو بەردێك لە بەهەشتەوە هێنراوە لە سووچێکی ئەوماڵەدا جێگیر کراوە، جا بەهۆی ئەوەی لە بەهەشتدا کات نیە، مردنو لە دایك بوون نیە، بۆیە لەسەر پێکهاتەکانی بەهەشتیش کات نیە، بە بەردەوامیش کات لەسەر ئەم بەردە سفرەو ڕۆژهەڵاتو

ڕۆژئاوای زەوی و کاتی شوێنەکانی تر بەهۆی ئەم بەردەوە دیاری دەکرێن.
کەعبە بە(بيت الحرام)ناسراوە، گەورەترین و پیرۆزترین مزگەوت و قیبلەی سەرەکیی مسوڵمانانە، بەدوای ئەودا مزگەوتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دێت بە پلەی دووەم و ڕێزێکی تایبەتیی هەیەوەو بە فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، (٤٠)نوێژی جەماعەت بەدوای یەکدا، واتە هەشت شەوو ڕۆژ نوێژکردن لەو مزگەوتەدا دەبێتەهۆی ڕزگاربوونی ئەوکەسە لە ئاگری دۆزەخ.
مزگەوتی(القدس)مزگەوتێکی ڕێزدارو پیرۆزەو بەوە ناسراوە لە مێژوودا یەکەم قیبلەی مسڵمانەکان بووە، بە پلەی سێیەم دێت، لە یاساکانی ئیسلامدا بەسەر کەسدا نەسەپێنراوە ئەگەر نەچێت بۆ مزگەوت بە تاوانبار دابنرێت، گرنگ ئەوەیە هەموو موسوڵمانێك لە ماوەی شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژە فەرزەکە ئەنجام بدات، ئینجا لەماڵەوە بێت یان لە مزگەوت یان لە دەشتودەر، بەڵام بەدڵنیاییەوە، بە چوونە مزگەوت لە(٢٧)لاوە خێری زیاتری بۆدێت وەك لەوەی کە نوێژەکە بەتەنها بکرێت.
(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: هەندێك لە نوێژەکانتان لە ماڵەکانتاندا جێبەجێیان بکەن و، ماڵەکانیشتان مەکەن بە گۆڕ).(٤٧)
دەبێت لەکاتی نوێژ دابەستندا مرۆڤ جێگیربێت بەرانبەر قیبلەکەی خۆی، بەڵام دابەستنی نوێژی فەرز لەنێو کەشتی و شەمەندەفەرو هەر هۆکارێکی تری گواستنەوەدا گونجاوە، بەمەرجێك کاتی دابەستنی نوێژەکە ڕووت لە قیبلە بووبێت، ئینجا پاشان گۆڕینی ئاراستەی کەشتیەکە یان شەمەندەفەرەکە بگۆڕێت کار لە نوێژەکەت ناکات.
سێیەم: داپۆشینی عەورەت بۆ نوێژکردن بە پۆشاکێك کە عەورەتی لێوە نەبینرێت، بۆ پیاوان لەنێوان ناوك و ئەژنۆی دایە، بۆ ئافرەتانیش هەموو لەشیەتی تەنها دەم و چاوو دەستی نەبێت هەتا مەچەکی.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: دامێنی پیاو لە نێوان ناوکی و ئەژنۆی دایە). (٤٨)

لە بارەی عەورەتی ئافرەتانیشەوە خوا دەفەرموێت:

وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا ......(٣١النور)

﴿جوانیەکانی خۆشیان بەدەرنەخەن، مەگەر تەنها ئەوەندەی کە بەدەرەوەیە﴾. ئەوەی کە بەدەرەوەیە دەموچاوو دەستەکانن، چونکە بۆ مامەڵەو کڕین و فرۆشتن واپێویست دەکات ڕووەکان بناسرێن و دەستەکانیش بۆ وەرگرتن و بەخشینی کاڵاکان بەدەرەوە بن.

بۆ پیاوان نابێت دەمیان داپۆشن و ئافرەتانیش نابێت لە نوێژدا ڕوویان داپۆشن، چونکە دەرخستنی ڕوو لە نوێژدا بۆ ژنانیش وەکو پیاوانە.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕێگەی نەداوە بە پیاوان لە نوێژکردندا دەمامکی خۆیان بکەن). (٤٩)

هەروەها پیاوان بۆیان نیە لەسەر بەرماڵی ئاوریشم نوێژەکانیان بکەن، چونکە لە بنەڕەتدا ئاوریشمیان لێ قەدەغەکراوە، بەڵام ئافرەتان بۆیان هەیە لەبەریشی بکەن و نوێژیشی پێوە بکەن، چونکە لە بنەڕەتدا ڕێگەیان پێدراوە ئاوریشم بەکاربێنن.

چوارەم: پاکیی لە لەش پیسی و بێ نوێژی، جا ئەگەر لە نوێژەکەدا بەهەر هۆیەکەوە دەستنوێژەکەت لەدەستدا، ئەوا پێویستە نوێژەکە جێهێڵێت و بەزویی بچیت دەستنوێژەکەت تازە بکەیتەوەو، نوێژەکە بکەیتەوە.

پێنجەم: پاکی لەش و پۆشاك و جێگەی نوێژ.

ئەو هۆکارانەی کە نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە دوای دابەستنی نوێژەکە:

یەکەم: هەر قسەکردنێك ئەگەر یەك پیتیش بێت بە مەبەستی ئەوەی دەوروبەرەکەت لە شتێك ئاگادار بکەیتەوە، نوێژەکەت دەپچڕێنێت، مەگەر ئاگادارکردنەوەی ئیمام بێت لە هەڵەیەك کە بەسەریدا تێپەڕبووبێت، ئەوا

نێرینه دەتوانێت بڵێت: (سبحان الله)، مێیینەش بەری دەستی ڕاستی لە پشتی دەستی چەپی دەدات و وەکو دەنگی چەپڵە ئیمامەکەی پێ ئاگادار دەکاتەوە.

دووەم: هەر کۆخین و گریان و پێکەنینێك لە نوێژدا نوێژەکە بەتاڵ دەکاتەوە، مەگەر کۆخینەکە بەهۆی نەخۆشیەوە بێت، هەموو جووڵەیەکی خەڵکی بە بەردەمی کەسی نوێژکەردا، نوێژەکەی لێ بەتاڵ دەکاتەوە، بۆیە واپێویستە نوێژکەرەکە نوێژەکەی لە شوێنێکی وەها دابەستێت خەڵك بە بەردەمیدا نەیەن، ئەگەر یەکێکیش بە بەردەمیدا هات، ئەوا بۆی هەیە بە ئاماژەیەك لەخۆی دوربخاتەوە.

سێیەم: هەموو خواردن و خواردنەوەیەك نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، تەنانەت مانەوەی پاشماوەی خواردن لەنێو دەمدا کە لە کاتی نوێژدا هەست بە تامەکەی بکرێت، نوێژەکە بەتاڵ دەکاتەوە، بۆیە لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) لە سەرەتای هەموو نوێژێکدا سیواك بەکاربێت کە دەبێتەهۆی پاك کردنەوەی دەم و ددانەکان.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: سیواك کردن پاك کەرەوەیە بۆ دەم و ڕازیکردنی پەروەردگارە). (٥٠)

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: نوێژێك سیواکی تێدا بکرێت باشترە لە حەفتا نوێژی بێ سیواك). (٥١)

چوارەم: هەموو جووڵەیەکی ناسروشتی کە شوێنی نوێژکردنەکە بگۆڕێت، نوێژەکە بەتاڵ دەکاتەوە، مەگەر ئەو وردە جووڵانە نەبن کە لە کاتی هەستانەوەو کڕنووش بردنەکاندا شوێنی پێیەکان دەگۆڕێن، یان خوراندنی شوێنێك کە وات لێبکات لە نوێژەکەت بێ ئاگابیت، هەروەها جووڵەیەکیش کە کەسێك دەیکات و هەنگاوێك دەچێتە پێشی ڕیزێکەوە بۆئەوەی لە نوێژی تاکەوە بیکەن بە نوێژی جەماعەت، ئەوا ئەو هەنگاوەی کە ئەوکەسە دەینێت

بۆئەوەی بچێتە پێشەوەو ببێت بە ئیمام، نوێژەکەی بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵام ئەگەر ئەم جووڵانەش لە سێ جار تێپەڕین، ئەوا نوێژەکە بەتاڵ دەکەنەوە.

پێنجەم: بێ ئاگایی و هۆش لەخۆ نەبوون، دەبێتە بچڕانی نوێژ، بۆنموونە: تۆ لە نوێژەکەتدا بیرت لەشوێنێکی تر بێت، ئەوا نوێژەکەت بەتاڵە، یان لەنێو نوێژەکەتدا لەهۆش خۆت چووی، یان خەوت لێکەوت، ئەوا دەستنوێژەکەشت دەشکێت و نوێژەکەشت بەتاڵ دەبێتەوە.

**پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (خوای گەورەو پیرۆز دەفەرموێ: نوێژم لە نێوان خۆمو بەندەکەمدا بە دووبەشی وەکویەك دابەش کردووە، جا نیوەی بۆ منەو نیوەی بۆ بەندەکەمە، بۆ بەندەکەشم هەیە ئەوەی داوای دەکات).(٥٢)**

**(پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ((لە خوێندنی) سوورەتی (فاتحە)دا چاکبوونەوەی هەموو دەردێك هەیە). (٥٣)**

دوای ئەوەی کە بە تەواوی دەستنوێژت هەڵگرت، لە شوێنێکی پاکدا لەسەر شتێکی پاك یان لەسەر زەوی، ڕووی خۆت دەکەیتە قیبلەو نیەتی جێبەجێ کردنی ئەو نوێژە دێنیت کە نیازت وایە بیکەیت، بۆنموونە: دەتەوێت نوێژی نیوەڕۆ بکەیت، ئەوا بەرەو قیبلە لە بارێکی تایبەتی خۆتدا دەوەستیت، بەشێوەیەك نێوان قاچەکانت بە ئەندازەی درێژی پێیەکت لەیەکترییەوە دوور بن، مەرج نیە پەنجەکانت بە پەنجەی کەسەکانی تەنیشتتەوە بنووسێنی، ناشبێت بۆشاییەکی وەها لەنێوانتاندا هەبێت، کە ڕیزەکە شلۆق بکات، ئینجا دەستەکانت بەرز دەکەیتەوەو دەڵێیت: (نیەتم وایە چوار ڕکاعەت نوێژی نیوەڕۆ دەکەم فەرزە لەسەر من بۆ خوای گەورە (الله اكبر))، لەگەڵ (الله اكبر)ەکەدا دەستەکانت دەهێنیتە خوارەوەو لەسەر ناوکت لەژێر ئێسکەکانی سینگەوە جێگیریان دەکەیت، دەستی ڕاستە لەسەر دەستی چەپ و بە ئەدەبەوە دەوەستیت، پێویستە ئەو(الله اكبر)ە بە دەنگێکی نیمچە بەرز بگوترێت،

لەبەرئەوەی کۆدی دابەستنی نوێژەکەیە، ئەگەر نەگوترێت، ئەوا پەیوەندییەکە لەنێوان خواو بەندەکەیدا گرێ نادرێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: کلیلەی نوێژکردن دەستنوێژە، چوونە ناوەوەشی (الله اكبر) کردنە، هاتنە دەرەوەشی سەلام دانەوەیە ).(٥٤)

ئینجا چاوەکانت لەسەر شوێنی سوجدەبردنەکە جێگیر دەکەیت و بەم پاڕانەوەیە دەست بە ئەنجامدانی نوێژەکەت دەکەیت و دەڵێیت:

(وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفاً مُّسْلِماً وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ):

﴿من بە دڵپاکی و موسوڵمانەتیەکی تەواوەوە ڕووی خۆم لەو کەسە کرد کە ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە، لە هاوبەشدانەرەکانیش نیم، بەڕاستی نوێژکردن و خواپەرستی و ژیان و مردنم تەنها بۆ پەروەردگاری جیهانیانە، (خوا) هیچ هاوبەشێکی نیە، منیش بەوە فەرمانم پێکراوە(کە هاوبەشی بۆ دانەنێم)، لەو کەسانەشم کە خۆیان داوەتە دەست دەسەڵاتی خوا﴾.

ئینجا بە تێڕوانینی بیرو هۆشەوە دەڵێت:

(اعوذ بالله من الشيطان الرجيم) و سوورەتی (فاتیحە) دەخوێنیت:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (١) الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٢) الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ (٣) مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (٤) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (٥) اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (٦) صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ (٧)

﴿بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، سوپاس وستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، (ئەو پەروەردگارەی کە) بەخشندەی میهرەبانە، خاوەنی ڕۆژی دواییە، (ئەی پەروەردگاری جیهانیان)، ئێمە هەر تۆ دەپەرستین و داوای یارمەتی هەر لەتۆ دەکەین، (تۆش) ڕێگەی ڕاستمان نیشان بدە، ڕێگەی ئەوانەی نازونیعمەتی خۆت بەسەر داداون، نەك ڕێگەی ئەوانەی ڕق و قینی

خۆت بەسەر داداونو، نەك ڕێگەی ئەوانەش گومڕا بوون (لە ڕێگەی ڕاست لایانداوە)﴾.

(بسم الله الرحمن الرحيم) ئایەتێکی سوورەتی فاتیحەیە، ئەگەر نەخوێنرێت نوێژەکە پێك نایەت.

لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەرە(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەدوای خوێندنی (الفاتحە) بگوترێت: ئامین، ئەگەر لە نوێژی بە کۆمەڵیشدا بێت نوێژکەرەکان لەگەڵ ئیمامەکەیان بە دەنگی بەرز بۆیان هەیە بڵێن: ئامین.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: (ئەگەر پێشەوای(نوێژکەرەکان گوتی): (غير المغضوب عليهم ولاالضالين)، ئەوا ئێوەش بڵێن: ئامین، جا کێ گوتەکەی لەگەڵ گوتەی فریشتەکان ڕێك کەوت، لە هەموو تاوانەکانی دەبووردرێت کە پێشتر کردوونی). (٥٥)

ئامین: وێردێکی داخوازی کردنە بۆ گەیشتن بە ئامانجێك، کە ڕەزامەندی پەروەردگارە لەسەر داواکاری بەندەکانی.

(پێغەمبەری خوا(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: نوێژی کەسێك قبووڵ نابێت کە سوورەتی (الفاتحە)ی تێدا نەخوێنێت). (٥٦)

ئینجا سوورەتێکی کورتی وەکو سوورەتی (الاخلاص)ی بەدوادا دەخوێنرێت:

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١)اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤)

﴿بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، بڵێ خوا تاكو تەنهایە، خوا جێگەی نیازو ئومێدە، کەس لەو نابێت، لەکەسیش نەبووە، هەرگیز کەسێکیش وەکو ئەو نابێت﴾.

ئینجا(الله اكبر)ێك دەکەیتو خۆت دەچەمێنیتەوەو دەستەکانت لەسەر ئەژنۆکانت گیر دەکەیت، پشتت بە شێوەیەکی وەها دەچەمێتەوە ئەگەر شتێکی لەسەردابنرێت بۆلای دوواوە بڕوات، ئینجا کە لەم بارە جێگیر بوویت، ئەوا

ئەوەندە دەمێنیتەوە کە (٣)جار بڵێیت: (سبحان ربي العظيم وبحمده)، ئینجا خۆت ڕاست دەکەیتەوەو دەستەکانت نیمچە بەرز دەکەیتەوەو دەڵێیت: (سَمعَ الله لِمَن حَمِدَه)، کە بە تەواویش جێگیر بوویت لە ڕاستبونەوەکەتدا، ئەوا دەڵێیت: (رَّبَنا ولَكَ الحَمد).

چوونە رکوع و سووجدە بردن لە پێویستکراوەکانی نوێژن، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ ...(٧٧)الحج

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بەچۆکدا وەرن و کڕنووش بەرن و خوای خۆشتان بپەرستن﴾.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەگەڵ (الله اکبر)ی نوێژ دابەستن و، لەگەڵ (الله اکبر)ی چوونەناو رکوع و، لە سەر بەرزکردنەوەی دوای رکوعدا، دەستەکانی تا ئەندازەی شانەکانی بەرز دەکردەوە). (٥٧)

ئینجا (الله اکبر)ێك دەکەیت و دادەبەزیتە سەر ئەژنۆکانت و کڕنوش دەبەیت و ناوچاوانت دەخەیتە سەر زەوی و قورسایی لەشت لە حەوت خاڵدا لەسەر زەوی جێگیر دەبێت، نێوچاوان ، هەر دووك دەستەکان و دوو ئەژنۆکان و هەردووك قاچەکانیش لە دواوەڕا پەنجەکانیان لە زەوی گیردەکرێت و (٣)جار دەگوترێت: (سبحان ربي الاعلى وبحمده)، ئەگەر لە نوێژی بە تەنهاش دابوو دەتوانێت ئەوەش بڵێت: (اللهم لك سجدت، وبك امنت، ولك اسلمت، سجد وجهي للذی خلقه وصوره وشق سمعه وبصره، تبارك الله احسن الخالقين)، واچاکە سەرەتا ئەژنۆکان بخرێنە سەر زەوی، پاشان دەستەکان بە تەریبی جەستەکە لە ڕێکی شانەکان بخرێنە سەر زەوی بە ئاراستەی قیبلە، ئینجا (الله اکبر)ێك دەکەیت و تا ناوەڕاستی لەشت ڕێك دەکەیتەوەو لەسەر قاچەکانت دادەنیشیت، دانیشتنێك کاتێکی کەم ئارامی تێدا دەگیرێت و، دەتوانیت بڵێیت: (ربي اغفرلي وارحمني واجبرني وارفعني واهدِني وعافِني)، ئینجا بە(الله

اكبر)ێك بۆ جاری دووەم دەچیتەوە كڕنووش بردنەوەكەو هەمان وێردەكانی جاری یەكەم دەخوێنی، ئینجا بە(الله اكبر)ێك خۆت ڕاست دەكەیتەوەو هەڵدەستیتەوە، واچاكە دەستەكان پێش ئەژنۆكان لەسەر زەوی هەڵگیرێن.

**(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كە سوجدەی دەبرد لە پێشدا ئەژنۆكانی دادەنانە سەر زەوی ئینجا دەستەكانی، كە لە سوجدەش هەڵدەستایەوە، دەستەكانی پێش ئەژنۆكانی لەسەر زەوی بەرز دەكردنەوە).** (٥٨)

ئینجا دەستەكانت لەسەر ناوكت دەگریتەوەو، ڕكاعەتی دووەمی نوێژەكە دەست پێدەكەیت لەشێوەی ڕكاعەتی یەكەمدا هەتا دەگەیت بە دوو كڕنووش بردنەكان، لەوێدا لەدوای كڕنووشی دووەم، (الله اكبر)ێك دەكەیت و هەڵناستیتەوە، بەڵكو پێی چەپت ڕادەخەی لەسەری جێگیر دەبیت و پێی ڕاستت لەسەر پەنجەكان دەچەقێنی و، پەنجەكانی دەستی ڕاستت لەسەر ڕانی ڕاستت خڕ دەكەیتەوە تەنها پەنجەی شایەدمان نەبێت، پەنجەكانی دەستی چەپیش لەسەر ڕانی چەپت ڕادەخەیت، ئینجا تەحیاتی یەكەم دەخوێنیت كە گەیشتیتە سەر (اشهد ان لااله الاالله)، لە دەستی ڕاستت پەنجەی شایەتمانت بەرز دەكەیتەوە بە ئەندازەی ئەوەی بۆڵوە ترێیەكی بەبندا بڕوات، وەكو نیشانەیەك بۆ باوەڕهێنان بە تاكوتەنهایی خوا، گونجاو نیە جووڵەجوڵ بە پەنجەی شایەتمان بكرێت، تەنها جاری یەكەم نەبێت لە دوای گرێدانی پەنجەكانی ترەوە تا دەستی ڕاستت لەسەر ڕانت ئارام دەگرێت، تەحیاتی یەكەم فەرز نیە بەڵكو سوننەتە، بەم شێوەیە دەخوێنرێت:

(التحيات لله، السلام عليك ايها النبي ورحمة الله وبركاته، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، الهم صلِّ على محمد وعلى ال محمد، كما صليت على ابراهيم وعلى ال ابراهيم في العالمين انك حميد مجيد).

ئینجا بە(الله اكبر)ێك ڕاست دەبیتەوەو دەستەكانت دەگریتەوەو دەست دەكەیت بە ڕكاتی سێیەم، ڕكاتی سێیەمیش بە شێوەی ڕكاتی یەكەمو دووەم دەكرێت،

بەلاّم دوای سوورەتی (فاتحە) سوورەتی کورتی قورئانی ناوێت، ئینجا کە دوو کڕنووشەکەی ڕکاتی سێیەمت تەواوکرد، ئەوا بە(الله اکبر)ێك هەڵدەستیتەوەو دەستەکانت دەگریتەوەو دەست بە ڕکاتی چوارەم دەکەیت لە شێوەی ڕکاتی سێیەمدا هەتا دوو کڕنووشەکان تەواو دەکەیت، ئەوسا (الله اکبر)ێك دەکەیتو لەسەر قاچەکانت دادەنیشیتو قاچی چەپ ڕادەخەیتو قاچی ڕاست لەسەر پەنجەکان دەچەقێنیت، پەنجەکانی دەستی ڕاستت لەسەر ڕانی ڕاستت خڕ دەکەیتەوە تەنها پەنجەی شایەدمان نەبێت، پەنجەکانی دەستی چەپیش لەسەر ڕانی چەپت ڕادەخەیتو تەحیاتی دووەم دەخوێنیت، کە گەیشتیتە سەر (اشهد ان لااله الاالله) لە دەستی ڕاستت پەنجەی شایەتمانت بەرز دەکەیتەوە بە ئەندازەی ئەوەی بۆڵوە ترێیەکی بە بندا بڕوات، بەم شێوەیە تەحیاتی دووەمیش دەخوێنیتو دەڵێیت:

(التحيات لله، السلام عليك ايها النبي ورحمة الله وبركاته، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، اللهم صلِّ على محمد وعلى ال محمد كما صليت على ابراهيم وعلى ال ابراهيم في العالمين انك حميد مجيد).

تەحیاتی دووەم فەرزە، دەبێت بکرێت، سوننەتە لەپاش تەحیات ئەو دوعایانە بخوێندرێن کە پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەدوای تەحیاتەکە خوێندوونی، وەکو: (اللهم اغفرلي ماقدمت وما اخرت وما اسررت وما اعلنت وما اسرفت وما انت اعلم به مني، انت المقدم وانت المؤخر لا اله الا انت)، یان بڵێت: (اللهم اني اعوذ بك من عذاب القبر ومن عذاب النار ومن فتنة المحيا والممات، ومن فتنة المسيح الدجال)، یان بڵێت:(ربي اني ظلمت نفسي ظلما كثيرا كبيرا، ولا يغفر الذنوب الا انت، فأغفرلي انك انت الغفور الرحيم).

ئینجا ئاوڕێك بەلای شانی ڕاستدا دەدرێتەوەو دەگوترێت: (السلام عليكم)، یان: (السلام عليكم ورحمة الله)، پاشان ئاوڕێك بەلای شانی چەپیشدا دەدرێتەوەو هەمان وێرد دووبارە دەکرێتەوەو، نوێژکردنەکە کۆتایی پێدێت،

مزگەوتەکــە گــەورە بێــت یــان بچــووك، ســەلامدانەوەی یەکــەم واجبــەو سەلامدانەوەی دووەم سوننەتە.

ئەو شەوەی کە پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەلایەن پەروەردگارەوە لە عەرشدا پێشوازی لێکرا، خـواو پێغەمبـەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەوەنـدە لەیـەکتری نزیـك بوونەوە ئەم دیمانەیە روویدا کە ئێستا لەنوێژەکانمان یادی دەکەینەوە بەناوی (التحیات)، پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەکو سەربازێك رووی کردە پەروەردگارو فەرمووی: (التحیات لله)، پەروەردگاریش وەڵامی دایەوە: (السلام علیك ایها النبی ورحمة الله وبرکاته)، جا پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەوێدا بۆئەوەی چاکەکارەکانیش بێبەش نەبن لەو رەحمەت و بەزەییەی پەروەردگار، بۆیە فەرمووی: (السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین)، فریشتەکانیش بەرێز لە دەوری عەرش وەستا بوون، کاتێك کە گوێیان لێبوو محەمەد لە بارەگای پەروەردگاریش چاکەکارەکانی لەبیر نەچوون، گوتیان: (اللهم صلِ علی محمد وعلی ال محمد کما صلیت علی ابراهیم وعلی ال ابراهیم انك حمید مجید).

زیندوو راگرتنی ئەم مەراسیمە نیشانەی پتەویی باوەری بەندەیە بە خواو پێغەمبەرەکەی(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

أَقِمِ الصَّلاةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا (٧٨)الاسراء

﴿نوێژەکان بەرێوەبەرن(لە سەرەتای رۆژەوە) تاکاتی خۆرئاوا بوون، لە خۆر ئاوابوونیشەوە تا بەشی یەکەمی تاریکی شەو، نوێژو قورئان خوێندنی بەرەبەیانیش بەرێوەبەرن، بەراستی نوێژو قورئان خوێندنی بەرەبەیان فریشتەکانی شەوو فریشتەکانی رۆژ بەشداری تێدا دەکەن﴾.

هەر لەهەمان شەودا، لە عەرشی خوا، نوێژەکان وەکو پێنج نوێژی دیاریکراو لەسەر پەیرەوانی ئایینی ئیسلام پێویست کران.

## نوێژی بەیانی

نوێـژێکی دوو ڕکاتیـە، بـە جەماعـەت بـە دەنگـەوە دەخوێنـدرێت، بـە تـەنیاش گونجاوە نوێژکەرەکە بە دەنگەوە نوێژەکەی ئەنجام بدات.

کاتەکەی: لە کازیوەی بەربەیانەوە دەست پێدەکات، کە هێڵی سپی ڕووناکی لە تاریکایی کۆتایی شەوەکەدا دەردەکەوێت، هەتا خۆرهەڵاتن.

لە نوێژی بەیانیو نیوەڕۆدا، لـەدوای(فاتحـە)، لـەو سـووڕەتانە دەخوێنرێت کـە ئایەتەکانیان کورتن، وەکو سوورەتی(الحجرات) هەتا سووڕەتی (عم).

لە نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینیدا، لەدوای (فاتحە)ی ڕکاتی یەکەم، سوورەتی (الم السجدە)و لە ڕکاتی دووەمیشدا سوورەتی(هل اتى على الانسان) دەخوێنرێت.

سـوننەتە قنـووت لـە هەسـتانەوەی ڕکـوعی ڕکـاتی دووەمـی نوێـژی بەیانیـدا بکرێـت، دوای ئـەوەی کـە بـە تـەواوی ئـارام دەگریـت، دەسـتەکانت تـا ئاسـتی شانەکانت بەرز دەکەیتەوەو دەڵێیت: (اللهم أهدِني فيمَن أهدَيت، وعـافني فـيمن عافَيت، وتَوَلَّني فـيمن تَولَّيت، وبارك لـي فِيما أعطَيت، وَقِني شـرّ ما قَضَيت، فأنَـك تَقضـي ولايقضـى عَلَيـك، وانـه لايـذل مـن والَيـت، ولا يعـز مـن عادَيـت، تَبارَكْـتَ رّبَنـا وَتَعاليـت، فَلـك الحَمْدُ علـى ماقَضَـيت، اسـتغفرِكَ وأتـوبُ اليـك).

دەکرێـت لـە نوێـژی بـە کۆمەڵـدا ئیمـام هـەموو ئـەو دوعایانـە بەشـێوەی کـۆ بخوێنێتـەوەو نوێژکـەرەکانیش لـەدوای ئـەو بڵـێن ئـامین، هـەتا (وَقِنـي شـرّ ما قَضَيت،) تەواودەکاتو ئەوەش کە ماوە لە دوعایەکە نوێژکەرەکە دەتوانێت لـە گـەڵ ئیمامەکـەی بیخوێنێـت، سـوننەتە قنـووت بکرێـت لـە دوا ڕکـاتی هـەموو نوێــژێکی فــەڕزدا لــەکاتی بــوونی شــەڕو تــرسو دەردو بــەڵاو مەینــەتیو نەخۆشیدا، بۆ داواکردنی خێرو بەرەکەت، لـەپی دەستەکان ڕوویـان لـەئاسمان دەکرێت، بۆلابردنی دەردو بەڵاو نەخۆشیەکانیش هەر لەسەرەتای قنووتەکەوە دەستەکان لە ئاستی شانەکاندا پشتیان لەئاسمان دەکرێتو لەپەکان ڕوویان

لەزەوی دەبێت، یان دەستەکانت ڕوویان لەسەرەوە بێت، کە گەیشتیتە(وقني شر ماقضيت) هەڵیان دەگێڕیتەوەو ڕوویان لە زەوی دەکەیت.

(جابر (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پێی گوترا: کام نوێژەیان باشترە؟ فەرمووی ئەو نوێژەی قنووتەکەی درێژ بێت).(٥٩)

سوننەتە دوای نوێژ بگوترێت: (استغفر الله... استغفر الله... استغفر الله العظيم من كل ذنب و اتوب اليه)، هەروەها سوننەتە بگوترێت:(اللهم انت السلام، ومنك السلام، تباركت يا ذا الجلال والاكرام)و دواتریش ئایەتی(الكرسی، ئایەتی ٢٥٥ی سوورەتی بەقەرە) بخوێنرێتو پاشتر سی و سێ جار(سبحان الله)و سی وسێ جار(الحمد لله)و سی وسێ جار(الله اكبر)و دە جار(لااله الا الله) بکرێتو پاشان لە خوا بپاڕێتەوە، داوای پاداشتی دنیاو قیامەت بکرێت، پاشتریش سەڵاوەت لە پێغەمبەر بدات(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

سوننەتە لە پاڕانەوەی نوێژی بەیانی و مەغریب دا (١٠)دە جار بە دەنگێکی هێواش بگوترێت: (لا اله الا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد، يحيي ويميت، بيده الخير، وهو على كل شيء قدير).

نوێژی بەیانی لە سەرەتای ڕۆژەکەو، نوێژی عەسر لە کۆتایی ڕۆژەکە، فریشتەکانی شەوو ڕۆژ بەشداری تێدا دەکەن.

(پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: مەلائیکەی شەوو مەلائیکەی ڕۆژ بە نۆبە دێنە ناوتانو، هەردووکلایان بەیەکەوە بەشداری نوێژی عەسرو نوێژی بەیانی دەکەن، پاشان ئەوانەی کە لەگەڵتان مابوونەوە بەرز دەبنەوە بۆ ئاسمان، خواش هەرچەندە لەوان زاناو ئاگادارترە، بەڵام پرسیاریان لێدەکات: ئایا چۆن بەندەکانی منتان جێهێشت؟ ئەوانیش دەڵێن: کە هاتین بۆ لایان نوێژیان دەکرد کە بەجێمان هێشتن، هەر نوێژیان دەکرد ).(٦٠)

## نوێژی نیوەڕۆ

نوێژێکی چوار ڕکاتیە.

کاتەکەی: سەرەتای نوێژەکە لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدات، تا ئەو کاتەش بەردەوام دەبێت کە سێبەری هەموو شتێك بەقەد خۆی لێدێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: جبریل دوو جاران لەلای دەرگەی مزگەوتی بەیت پێشنوێژیی بۆ کردم، جارێکیان کە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدابوو سێبەریش لە ڕێکی نەعلەکانی قاچم بوو، جاری کۆتاییش کە سێبەری هەموو شتێك بەقەد خۆی لێهاتبوو). (٦١)

نوێژی نیوەڕۆو نوێژی عەسر بە تاك بکرێن یان بە کۆ، نابێت بە دەنگەوە ئەنجام بدرێن.

## نوێژی عەسر

حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ (٢٣٨)البقرة

﴿پارێزگاری بکەن لەسەر(کات و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی)نوێژەکانتان (بەگشتی)و نوێژی عەسر بە تایبەتی، لە پێناوی خواشدا هەستن بە (ئەنجامدانی) نوێژەکانتان بە ملکەچی و بێدەنگی و(قووڵبوونەوە لەنێویاندا)﴾.

(ئیبن عەباس(ڕەزای خوایان لێبێت) گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (الصلاة الوسطى) واتە: نوێژی عەسر). (٦٢)

نوێژێکی چوار ڕکاتیە.

کاتەکەی: سەرەتای نوێژەکە لە کۆتایی نوێژی نیوەڕۆوە دەست پێدەکات تا ئاوابوون و دیارنەمانی خۆر.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: جبریل دوو جارانیش پێشنوێژی نوێژی عەسری بۆ کردم، جارێکیان کە سێبەری هەموو شتێك بەقەد خۆی بوو، جاری کۆتاییش کە سێبەری هەموو شتێك دوو ئەوەندەی خۆی بوو). (٦٣)

ئەمە کاتە دیاریکراوەکانی نوێژی عەسرن، بەڵام بۆ کەسێك کە لە ئەنجامدانی نوێژەکەی دواکەوتبێت، تا خۆر ئاوابوون گونجاوە نوێژەکەی ئەنجام بدات.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: هەرکەسێك لە ئێوە فریای سوجدەیەك کەوت لە نوێژی عەسر پێش خۆرئاوا بوون، یان فریای سوجدەیەکی نوێژی بەیانی کەوت پێش خۆرهەڵاتن، ئەوە با نوێژەکەی تەواو بکات). (٦٤)

لە نوێژی عەسرو عیشادا، لەدوای (فاتحە)، لەو سوورەتانە دەخوێنرێت کە ئایەتەکانیان کورتن، وەکو سوورەتی(عم) هەتا سوورەتی (الضحى).

کەسێك واز لە ئەنجامدانی نوێژی عەسر بێنێت، هەموو کارو کردەوەو خواپەرستیەکەی تێدا دەچێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: هەرکەسێك واز لە ئەنجامدانی نوێژی عەسر بێنێت، ئەوە هەموو کردەوەکانی تێداچوون). (٦٥)

## نوێژی شێوان(مەغریب)

نوێژێکی سێ ڕکاتیە، بە جەماعەت دوو ڕکاتی بە دەنگەوە دەخوێنرێت، بە تەنیاش گونجاوە نوێژکەرەکە بە دەنگەوە نوێژەکەی ئەنجام بدات.

کاتەکەی: لەدوای ئاوابوونی گۆی خۆرو نەمانی سوورایی لەلای ڕۆژهەڵاتی ئاسمانەوە دەست پێدەکات تا بزربوونی شەفەقی سوری خۆرئاوا بوون، کاتەکەی زۆر کەمە تەنها بەشی ئەوەندە دەکات یەکێك دەست بە ئاو بگەیەنێت و دەستنوێژ هەڵگرێت و بانگ بدرێت و قامەت بکرێت و نوێژەکە تەواو بکرێت.

نوێـژێکی مـەغریب کـە لـە کـاتی خۆیـدا دابەسـترێت، گونجـاوە بـەهۆی قورئـان خوێنـدنی نـاو نوێژەکـەوە درێـژە بکێشـێت، بـەڵام ئـەوە مانـای ئـەوە نیـە دوا خستنی نوێژەکە بۆ ئەو کاتە درەنگە دروست بێت، بەڵام ئەگەر ئیمامێك لەگەڵ بانگی ئێوارەدا نوێـژی دابەسـتو سـوورەتێکی وەکـو (اعـراف)ی لـە نوێژەکـەدا خوێنـد، ئـەوە بوارێـك هەیـە بۆئەوانـەی کـە دواکـەتوون فریاکـەون لەگـەڵ ئیمامەکەدا نوێژەکەیان ئەنجام بدەن.

(عائشە (ڕەزای خوای لێبێت)، دەڵێت: پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە نوێـژی مەغریبـدا سوورەتی(الاعراف)ی بە دووبەش خوێند، هەر ڕکاتەی بەشێك).(٦٦)

لە زۆربەی کاتەکانیش لە نوێژی مەغریب دا، لـەدوای (فاتحـە)، لـەو سوورەتانە دەخوێنرێـت کـە ئایەتـەکانیان کـورتن، وەکـو سـوورەتی(الضـحى) هـەتا سوورەتی(الناس).

(پێغەمبـەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێ: کـاتی نوێـژی مـەغریب دەمێنێـت هـەتا سوورایی خۆرئاوا بوون مابێت). (٦٧)

## نوێژی خەوتنان(العشاء)

نوێـژێکی چوار ڕکاتیـە، بە جەماعەت دوو ڕکـاتی بەدەنگـەوە دەخوێنرێت، بە تەنیاش گونجاوە نوێژکەرەکە بە دەنگەوە نوێژەکەی ئەنجام بدرێت.

کاتەکەی: لـە دوای کۆتـایی هـاتنی کـاتی نوێـژی مەغریبـەوە دەست پێدەکات، واتـە لـەدوای نـەمانی تیشـکی سـووری شـەفەقی خـۆر ئاوابوونـەوە دەسـت پێدەکات تا دەرکەوتنی کازیوەی بەربەیان.

(پێغەمبـەری خـوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ڕێگـەی نـەداوە پـێش نوێـژی خـەوتنان بخەویت و دوای نوێژەکەش بمێنیتەوە بە قسەکردنەوە سەرقاڵ بیت).(٦٨)

ئـەو نوێژانـەی کـە دەکەونـە نێـو تاریکاییەکانـەوە، ڕکـاتی یەکـەمو دووەمیـان دەنگیان تێدا بـەرز دەکرێتـەوە، ئەو نوێژانەش کە دەکەونـە نـاو ڕووناکیـەکانی

ڕۆژەوە، وەکو نیوەڕۆو عەسر، ئەوا بە شێوەیەکی هێدیو ئارامی دەخوێنرێن بە شێوەیەك کە خۆت گوێت لە دەنگی خۆت بێت، نوێژی هەینیش کە لە شوێنی نوێژی نیوەڕۆی ڕۆژەکانی تر ئەنجام دەدرێت، دوو وتار دەچنە جێگەی دوو ڕکاتی نوێژەکە، دوو ڕکاتەکەی تریش بەدەنگی بەرز دەخوێنرێن، ڕۆژی هەینی تایبەتمەندیی خۆی هەیە، پشووی هەفتانەی موسوڵمانەکانە، لە پێش نوێژی هەینیدا خوێندنی سووڕەتی(الكهف) لە ڕێوشوێنی پێغەمبەری ئیسلام بووە(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لە ڕۆژی هەینیدا لە سەرەتای کاتی نوێژکەوە بۆ ماوەی کاتژمێرێك دەرگای ئاسمانەکان دەکرێنەوە، بۆیە واباشە مرۆڤ ئەوەندی بۆی دەکرێت لەو ڕۆژەدا خواپەرستی بکاتو لە خوا بپاڕێتەوە.

لە نوێژی جەماعەتدا دەبێت نیەتی ئەوە بهێنرێت کە نوێژەکە بە جەماعەت دەکات لەدوای ئەو ئیمامەوە، کە ئیمام نوێژەکەی دابەست نوێژکەرەکەش دوای ئیمام (الله اكبر) دەکات، لە نوێژی نیوەڕۆو عەسردا دوای الله اکبری نوێژ دابەستن لەگەڵ ئیمام، فاتیحەو سووڕەتێکی کورت لە قورئان دەخوێنرێتو لەگەڵ ئیمامدا دەچیتە رکوعو سجودو دانیشتن بۆ تەحیاتەکان، نابێت نوێژکەر لە ئیمامەکەی دوا بکەوێت، دوای سەلامدانەوەی ئیمامیش، ئەویش سەڵام دەداتەوە، بەڵام لە نوێژی ئێوارانو عیشاو بەیانیاندا، لە دوو ڕکاتەکانی پێشەوەدا فاتیحەو سووڕەتەکەی پاشتری بە دەنگی بەرز دەخوێنرێن، دوای دابەستنی نوێژو خوێندنی دوعای (وجهت وجهی.....) نوێژکەرەکە لە دوای ئیمامەوە چاوەڕێ دەکات، هەتا ئیمام فاتحەکەی تەواو دەکاتو دەڵێت: (ولاالضالین)، ئەوسا هەموو نوێژکەرەکان لەگەڵ ئیمامەکەیان بە دەنگێکی نیمچە بەرزەوە دەڵێن (ئامین)، دوای ئەوە نوێژکەرەکان فاتحەکانیانو سوورەتەکی دوای فاتیحە دەخوێننو چاوەڕێ دەکەن تا ئیمام لە قورئان خوێندنەکەی دوای فاتیحاکە دەبێتەوە، ئینجا لەگەڵ ئەودا دەچنە ڕکوعەوەو بەدوای ئەودا هەنگاو هەنگاو نوێژەکەیان تەواو دەکەن، گونجاونیە نوێژکەر لە

هیچ بڕگەیەکی نوێژکردنەکەیدا پێش ئیمامەکەی بکەوێتەوە، کەسێك لەگەڵ ئیمامدا فریانەکەوت نوێژەکەی دابەستێت، ئەوا دەبێت یەکسەر بێتە ڕیزەکەوەو نیەت بێنێت و نوێژ دابەستێت، ئەگەر نوێژکەرەکە لە رکوعی ڕکاتێکدا فریای ئیمامەکەی کەوت، ئەوا ئەو ڕکاتەی بۆ حساب دەکرێت هەرچەندە فاتحەشی نەخوێندبێت، لەگەڵ ئیمام نوێژەکەی تەواو دەکات، ئینجا ئەگەر وابوو لە رکوعی ڕکاتی دووەمدا فریای ئیمام کەوت، واتە ڕکاتی یەکەمی فەوتاوە، بۆیە دوای سەلامدانەوەی ئیمام، نوێژکەرەکە سەلام ناداتەوەو بە تەنها هەڵدەستێتەوە ڕکاتە فەوتاوەکەی تەواو دەکات و تەحیات دەخوێنێت و سەلام دەداتەوە، وا باشە ئیمام بوارێك بە نوێژکەرەکان بدات بۆئەوەی بەلای کەمەوە فریای رکوعی ئەو ڕکاتە بکەون کە نوێژەکەی تێدا دادەبەستن.

ئەگەر نوێژکەرێك بە تەنها نوێژ بکات و پاشان نوێژکەرێکی تر هات ئەو نوێژکەرە بکات بە ئیمامی خۆی و لەدوای ئەوەوە نوێژەکەی بکات، ئەوا نوێژکەرەکەی دواوە نوێژکەرەکەی پێشەوە ئاگادار دەکاتەوە بەوەی کە ئەو بووە بە ئیمام، بەوەی کە دەستێکی لە شانی بدات، یان بە دەنگێکی نیمچە بەرز نیەتەکەی بە نوێژی جەماعەت دێنێت، بۆئەوەی نوێژکەرەکەی پێشەوەی پێ ئاگادار بکاتەوە، بەم پێیە نوێژەکە لە نوێژێکی تاکەوە دەبێت بە نوێژێکی جەماعەت، چەند کەسی تریش بێن لەدوای هەمان ئیمامەوە دەتوانن نوێژەکەیان دابەستن، جا کە ئیمامەکە سەلامی دایەوە، هەر نوێژکەرێك چەندی لە نوێژەکەی فەوتابێت لەدوای ئیمامەکەوە، ئەوا دوای سەلامدانەوەی ئیمامەکە، دەبێت نوێژکەرەکە هەستێتەوەو نوێژەکەی بەتەنیا تەواودەکات.

# نوێژی هەینی

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٩) فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (١٠)الجمعة

**﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، کاتێك بۆ نوێژی هەینی بانگ درا، ئەوا هەوڵ و تێکۆشان بکەن بۆ یادکردنەوەی خوا، کڕین و فرۆشتنیش لێگەڕێن، ئەوە بۆ ئێوە باشترە، ئەگەر دەزانن (ئەو نوێژەی هەینی چەند پیرۆزە)، جا کە نوێژەکە تەواو بوو، بە زەویدا بڵاوببنەوەو هەوڵی دەسکەوتنی چاکەو بەخشینەکانی خوا بدەن، زۆریش یادی خوا بکەن، بەڵکو سەرفراز دەبن﴾.**

**(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: کەسێك باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێت، نوێژی هەینی لەسەر پێویستە، تەنها ئافرەت و گەشتیارو کۆیلەو خەڵکی نەخۆش نەبێت).** (٦٩)

**جێبەجێ کردنی نوێژی هەینی لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا، نابێت ژمارەی نوێژکەرەکان لە چل کەس کەمتر بن، کە موسڵمان بن، خۆیان ناسیبێت، ژیرو هۆشمەند بن، نێرینە بن، (دیل و کۆیلە)نەبن، سەربەست و نەترس بن لەوەی هەر کەم و کورییەك بخەنە ڕوو، بەم پێیە هەر کەسێك موسڵمان نەبێت نوێژی هەینی نایگرێتەوە، هەروەها هەر کەسێك خۆی نەناسیبێت، نوێژی هەینی نایگرێتەوە، هەروەها کەسانی شێت و بێ عەقڵ نوێژی هەینی نایانگرێتەوە، هەروەها مێینەکان بە هیچ شێوەیەك نوێژی هەینی نایانگرێتەوە، بەڵام لەکاتێکدا کە باری تەندروستی ئەو مێینانە ڕێگر نەبێت بۆ چوونەناو مزگەوت و جەماعەتەکانەوە، ئەوا سەربەستییان پێ دراوە بە ئارەزووی خۆیان بەشداری بکەن یان نەکەن، هەروەها دەبێت هەرتاکێك لە تاکەکانی ئەو پۆلە موسوڵمانەی کە بەشدارییان لەم نوێژەدا کردووە کەسانی سەربەست و نەترس**

بن‌و بوێرانە کەم‌و کورپییەکانی ناو کۆمەڵگا بخەنە بەردەم دەسەڵات، یان بە واتایەکی تر دەبێت دەسەڵات ئەوەندە سینگی فراوان بێت ڕێگە لە هیچ بەشداربوویەك نەگرێت لەم کۆبوونەوە هەفتانەییەدا نەترسانە کەم‌و کورپییەکان بخاتە ڕوو، بەپێی یاساکانی ئیسلام دەسەڵات ناتوانێت ئەو مافی سەربەستیە لە بەشداربوویەکی نوێژی هەینی زەوت بکات کە خوا پێی بەخشیوە، بۆیە هەرکاتێك ئەو مەرجانە ئامادە نەبوون، ئەوا نوێژی هەینی کاریگەرییەکەی خۆی لەدەست دەدات.

پیرۆزی ڕۆژی هەینی بە شێوەیەکە وەکو حەجی هەژارەکان‌و جەژنی خاوەنباوەڕەکان دادەندرێت، بۆیە خۆشردن‌و لەبەرکردنی پۆشاکی جوان بۆ بەشداری کردنی ئەو نوێژە لە ڕەوشتی پێغەمبەری ئیسلام بووە(صلى الله عليه وسلم)، ئینجا هەر کەسێك گوێی لە بانگدانی نوێژی هەینی بێت، دەبێت یەکسەر دەست لە کاروپیشەکەی هەڵگریت‌و خەریکی یادی خوا بێت، لەشوێنێکدا ئەگەر نوێژی هەینیشی تێدا ئەنجام نەدرێت لەبەر نەبوونی ئەو مەرجانەی سەرەوە، ئەوا پێویستە تاکەکان، لەگەڵ بانگدانی نیوەڕۆدا دەست لە کارو کاسپی‌و بازرگانی کردن هەڵگرن‌و دەستنوێژ بشۆن‌و نوێژی نیوەڕۆیان دواخەن تا کاتی ئەنجامدانی نوێژی هەینی تەواو دەبێت، لەو نێوانەشدا بیر لە تواناو دەسەڵاتی پەروەردگارەکەیان بکەنەوەو لێی بپاڕێنەوە، ئینجا دواتر نوێژەکەیان وەکو نوێژی نیوەڕۆ بە تاك یان بە کۆمەڵ ئەنجامی بدەن، بەڵام ئەگەر لە شوێنێکدا مەرجەکانی ئەنجامدانی نوێژی هەینی هەبوون، ئەوا نوێژەکە وەکو نوێژی هەینی بەڕێوەدەچێت، لە کۆنترین‌و گەورەترین مزگەوتی ئەو شوێنەدا، ئەگەر نوێژی هەینی لە شارێکدا لە چەند مزگەوتێکدا ئەنجام درا، ئەوا تەنها لە مزگەوتە سەرەکیەکەدا نوێژی نیوەڕۆ ناکرێتەوە، دەنا دەبێت مزگەوتەکانی تر هەموویان دوای ئەنجامدانی نوێژی هەینی بە جەماعەت چوار ڕکات نوێژی ئەو نیوەڕۆیە بکەنەوە، ئەمەش هەر بۆئەوەیە ئەو کۆبوونەوە

جەماوەریـە هـەموو خـەڵكی ناوچـەكە بەشـداری تێدا بكـاتو خەڵكەكـە هـەموو بەیەكەوە كێشەكانی هەفتەی ڕابردوویان تێدا چارەسەر بكەن.
ئەگەر وارێككەوت یەكەم ڕۆژی جەژنێك كەوتە ڕۆژی هەینیەوە، ئەوا نوێژەكەی جەژن لەبری نوێژی ئەو هەینیە دادەنرێت، بـۆ ئەوخەڵكانـەی كە لەگوندەكانی دەرەوە دێنـە شـارەكانەوە بـۆ ئەنجامـدانی نوێـژی هـەینی، لەبـەر ئـەوەی هـەردووكیان كۆبوونـەوەی جـەماوەرین، مـادام نوێـژی جەژنەكە زووتـر ئـەنجام دەدرێت، ئەوا نوێژی هەینیەكە پێویست نابێت.
(معاویەی كوڕی ئەبو سوفیان پرسیاری لـە زەیـدی كـوڕی ئەرقـەم كـرد: ئایا وا ڕێككـەوتووە لەگـەڵ پێغەمبـەر بوویـت(صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) دووجـەژن كەوتبنـە ڕۆژێكەوە؟ زەید گوتی: بەڵێ، معاویە گوتی: چۆن ئـەو دوو جەژنـەی بەیەكەوە گونجانـدن؟ زەیـد گـوتی: نوێـژی جـەژنی كـرد، مۆڵەتیشـی دا نوێـژی هـەینی نـەكرێت، پێغەمبـەر(صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فەرمووشـی: (ئەگـەر یـەكێكیش ویسـتی جومعەكەی بكات، با بیكات)). (٧٠)
سەرەتای كـاتی نوێـژی هـەینی وەكـو سـەرەتای نوێـژی نیـوەڕۆ وایـە، كە بانگ درا، وەڵامی بانگەكە دەدرێتـەوەو بە تـەنیا دوو ڕكـات نوێـژی سـوننەت ئـەنجام دەدرێـتو سـەلام دەدرێتـەوەو بـە یـادی خـواو پاڕانـەوەوە لەشـوێنی خۆتـدا دەمێنیتەوە، یان خەریكی قورئان خوێندن دەبیت، یان گوێ لە قورئان خوێنێك دەگریـت، هـەتا بانگـدەرێك بانگێـك ڕادێڵێـتو بەخەڵكەكـە ڕادەگەیـەنێت كـە: (خوێندنەوەی دوو وتار لـەبری دوو ڕكـاتی نوێژەكە ئـەنجام دەدرێـت، جا بۆیـە ئەگەر وتـارخوێن چـووە سـەر مینبەرەكە، با كـەس لـەئێوە قسـە نـەكات، ئەگـەر كەسـێك لـە كـاتی وتارەكانـدا قسـە بكـات، ئـەوە دەنگـەدەنگ دروسـت دەكـات، هەركەسێكیش دەنگەدەنگ دروسـت بكـات، ئـەوا نوێژەكـەی بەتاڵـە، جا خۆتـان ڕێكخـەنو گـوێ بگـرن ڕەحمـەتی خواتـان لێببێـت)، ئینجا ئیمـام دەچێتە سـەر مینبەرەكـەو ڕوو لـە خەڵكەكـە دەكـاتو دەڵێـت: (السـلام علـیكم ورحمـة الله)،

بانگدەرەکەو خەڵکەکە وەڵامی دەدەنەوەو دەڵێن: (وعليكم السلام ورحمة الله وبركاته)، ئینجا بانگدەرەکە بە بانگێك وەکو بانگدانی یەکەم بانگ دەدات، لەم ماوەیەدا ئیمام لەسەر مینبەرەکە دادەنیشێت تا بانگدانەکە تەواو دەبێت، ئەوسا هەڵدەستێتەوەو دوو وتار بەدوای یەکدا دەخوێنێتەوە، لە هەردووك وتارەکەدا سوپاس و ستایشی خوا دەکرێت و سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر لێدەدرێت و بابەتەکان دەخرێنەڕوو، پاشان ئامۆژگاری خەڵکەکە دەکرێت بۆئەوەی پابەندبن بە ئایینی ئیسلام و لە خوا بترسن، ئینجا لەوتاری یەکەمدا بە ئایەتێکی قورئان کۆتایی بە وتارەکە دەهێنرێت و لەوتاری دووەمیشدا بە دوعاو پاڕانەوە کۆتایی بە وتارەکە دەهێنرێت، پێویستە لەدوای وتاری یەکەم ئیمام ئەوەندە دانیشێتەوە کە کاتەکەی بەشی خوێندنی سووڕەتێکی (الاخلاص) بکات، لەو ماوەیەشدا خەڵکەکە دوعا دەکات و دەپاڕێتەوە، ئینجا ئیمام هەڵدەستێتەوە بۆ وتاری دووەم، ئەم وتارانە بۆئەوەیە خەڵکی لێیان تێبگات و کەڵکیان لێ وەربگرێت، بۆیە پێویستە بە زمانی خەڵکەکە بخوێندرێنەوە، تەنها ئایەتەکان و سەڵاواتەکانی ناو وتارەکان بە زمانی عەرەبی دەخوێندرێنەوە، ئینجا کە وتاری دووەم تەواو بوو، ئیمام لەسەر مینبەرەکەی دێتەخوارەوەو بانگدەرەکەش قامەت دەکات و خەڵکەکەش لەبەرخۆیەوە وەڵامی قامەتەکە دەداتەوەو چاوەڕێ دەکەن ئیمام نوێژەکە دابەستێت، ئەوانیش نییەتی دوو ڕکات نوێژی هەینی دەهێنن و لەدوای (الله اکبر)ی ئیمامەوە (الله اکبر) دەکەن و نوێژەکەیان دادەبەستن، نوێژی هەینی وەکو دوو ڕکاتی نوێژی بەیانی بە دەنگەوە دەخوێنرێت، کە نوێژەکە دابەسترا خەڵکەکە چاوەڕێی ئیمام دەکەن هەتا فاتیحە تەواو دەکات، ئینجا کە ئیمام گوتی:(ولا الضالين) ئەوە خەڵکەکە هەموو پێکەوە دەڵێن ئامین و، دەست دەکەن بە خوێندنی سووڕەتی فاتیحە، لەدوای فاتیحەش خوێندنی سوورەتی قورئانی ناوێت، چونکە ئیمامەکە سوورەتەکە دەخوێنێت، لێرەدا ئیمام بوارێك دەدات بە نوێژکەرەکان

هەتا فاتیحاكانیان تەواو دەكەن، ئەوسا بە دەنگەوە لە ڕكاتی یەكەمدا سووڕەتی (الجمعه) یان(الاعلی)دەخوێنێتو لە ڕكاتی دووەمیشدا سووڕەتی(المنافقون) یان (الغاشیه)دەخوینێتو، نوێژەكە تەواو دەكاتو بە دەنگێكی بەرز سەلام دەداتەوەو، بەدوایدا نوێژكەرەكانیش سەلام دەدەنەوە، ئینجا ئیمام سیٚ جار (استغفر الله) دەكاتو (آیة الكرسی)دەخوێنێت، پاشان لەلایەن ئیمامەوە یان لەلایەن بانگدەرەكەوە، ڕێوڕەسمی خوێندنی وێردەكانی دوای نوێژەكە دەست پێدەكات، هەر وێردێك(٣٣)جار بە دەنگێكی ئاسایی دەگوترێنەوە، كە ئەم وێردانەن: (استغفر الله، سبحان الله، الحمدلله، لااله الا الله، الله اكبر)، پاشان سیٚ سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لێدەدرێنو لەلایەن ئیمامەكەوە یان لەلایەن بانگدەرەكەوە دەرگایەكی پاڕانەوە دەكرێتەوە، بۆنموونە: دەگوترێت: (ربنا اتنا في الدنیا حسنة وفي الاخرة حسنة وقنا عذاب النار)، ئینجا خەڵكەكە دەست دەكەن بە پاڕانەوەو دوعا كردن، تا ئیمامەكە كۆتایی بە دوعاكردنەكە دەهێنێت، بەوەی كە سەڵاواتێك لەسەر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەداتو بڵاوەی لیٚ دەكرێت، ئەوەی بشیەوێت بۆ خواپەرستی دەمێنێتەوە.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەدوای هەموو نوێژێكی فەرز، دەیفەرموو: هیچ پەرستراوێك نیە تەنها خوا نەبێت، هیچ هاوبەشێكی نیە، دەسەڵاتو ستایش هەر بۆئەوەو، بەسەر هەموو شتێكیشدا بەتوانایە، ئەی خوایە، كەس ناتوانێت بەخشینێك بگێڕێتەوە كە تۆ بیدەیت، كەسیش ناتوانێت شتێك ببەخشێت كە تۆ مەیلت لیٚ نەبێت، چارەو بەختو سامانی هیچ كەسێك دادی نادات، لە ئاست چارەو بەختو دەسەڵاتی تۆدا). (٧١)

## ئیمامەت و نوێژی بەکۆمەڵ

لەبارەی ئیمامەتەوە پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)دەفەرموێت:

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەرموو: ئیمام مسۆگەرکردنی ئەنجامدانی نوێژەکەی لە ئەستۆدایە، جا ئەگەر بە چاکی ئەنجامی بدات، ئەوە بۆ خۆیی و بۆ نوێژکەرەکانیشە، ئەگەر بە خراپیش ئەنجامی بدات ئەوە زیانەکەی بۆخۆیەتی و بۆ نوێژکەرەکانیش زیانی نیە).(٧٢)

لەبارەی نوێژی بە کۆمەڵیشەوە:

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەیفەرموو: نوێژی بە جەماعەت بە بیست‌وحەوت پلە لە نوێژی تاك باشترە). (٧٣)

لەبارەی ڕێکخستنی ڕیزەکانیشەوە:

(پێغەمبەری(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ڕیزەکانتان ڕێکخەن، لەڕاستیدا ڕێکخستنی ڕیزەکان بەشێکە لە دابەستنی نوێژەکە).(٧٤)

ئەوکەسەی پێشنوێژیی بۆ موسوڵمانان دەکات بە(ئیمام)ناسراوە، ئەوەی نوێژی هەینیش بەڕێوەدەبات بە(ئیمام و وتارخوێن)ناسراوە، ئیمامێك بەشێوەیەکی فەرمی بۆ مزگەوتێك دانرابێت، ئەوا ئەو ئیمامە بەرپرسیارە بەرانبەر ئەنجامدانی نوێژەکان بە جەماعەت و شیارکردنەوەی خەڵکەکە بە ئاداب و ڕەوشتەکانی ئیسلام، هەرکاتێکیش ئەوئیمامە چوو بۆ سەفەرێك، ئەوا ئەگەر ئیمامی دووەم هەبوو، ئەو دێتە شوێنی، ئەگەر ئیمامی دووەمیش نەبوو، ئیمامە یەکەمەکە خۆی کەسێك دەستنیشان دەکات بۆ پێشنوێژی کردنی خەڵکەکە، ئەگەر ئیمامەکەش وەهابوو نەگونجا لەگەڵ خەڵکەکەدا، ئەوا بەڕێزەوە داوادەکرێت ئیمامێکی تریان بۆ بهێنرێت، ئەگەر لەکاتی نوێژێکیشدا ئیمام نەبوو، ئەوە لەنێو خەڵکەکەدا کامەیان لە هەموویان زیاتر قورئانیان لەبەرە ئەو دەبێت بە ئیمام، ئەگەر دوو کەسیش وەکو یەك قورئانیان لەبەربوو، ئەوە بە تەمەنەکەیان دەکرێت بە ئیمام، ئەگەر دووکەسیش لە قورئانەکەش و لە

تەمەنەكەشیان وەكو یەك بوون، ئەوە ئەوەیان دەكرێت بە ئیمام كە دەنگی خۆشترو پاك‌وخاوێنترە، لە بواری ئیمامەتدا هەتا كەسی شارەزا لەدیندا هەبێت، هیچ حسابێك بۆ پلەوپایەو بنەماڵەو عەشیرەتەكان ناكرێت، ئەگەر گەورەی موسوڵمانان لە شوێنێكدا ئامادە بوو بۆ نوێژكردن دەكرێت ببێت بە ئیمام، بەمەرجێك بە ڕاستی گەورەی موسوڵمانەكان بێت، (نەك سەردەستەی گروپێك، یان سەرۆكێك بێت كە حكومەتەكەی كار بە یاساكانی ئیسلام نەكات)، ئەوكەسەی كە نوێژ لە دوای ئیمامێكەوە دەكات، مانای وایە ئەوكەسە خۆی داوەتە دەست ئەو ئیمامە، بۆیە زۆر پێویستە كەسی نوێژكەر ئیمامەكەی چاك بناسێت، دەنا لە ماندووبوون زیاتر هیچی بۆ نامێنێتەوە، بۆنموونە: لە هەموو نوێژە بە دەنگ‌و بێ دەنگەكاندا، (بسم الله الرحمن الرحيم) پێویستە لە سەرەتای سووڕەتی (فاتحە)بخوێنرێت، جا كە ئیمامێك نەیخوێنێت، ئەوا نوێژی هەموو خەڵكەكەش بەتاڵە، لەبەرئەوەی ئایەتێكە لە فاتیحە، جا كە ئیمامێك لە نوێژی مەغریب‌و عیشاو بەیانیاندا (بسم الله الرحمن الرحيم) نەخوێند بە بیانوی ئەوەی لەنێو دڵی خۆیدا یان بە هێواشی خوێندوویەتی، ئەوە دروست نیە، چونكە(بسم الله الرحمن الرحيم)یش وەكو بەشەكانی تری فاتیحاكە وایە دەبێت بە دەنگەوە دەربڕدرێت، ئیمامیش نابێت چاوی لەوەبێت كە نوێژكەرەكان زەكات‌و سەرفترەی بدەنێ، بەڵام شایستەی ئەوەشە لەلایەن خەڵكەكەوە ڕێزی لێ بگیرێت‌و ئاسانكاری بۆ بكرێت‌و یارمەتیش بدرێت، ئینجا ئەگەر لە بیروبۆچوونی تۆدا ئیمامەكە كەسێكی شیاوبوو كە ببێتە پێشەوای تۆ بۆ ئەنجامدانی نوێژەكە، ئەوا چەند مەرجێك دێنە پێشەوە:

**یەكەم:** دوای ئەوەی ئیمام بە(الله اكبر) نوێژەكەی دابەست، دەبێت نوێژكەرەكە نیەتی ئەوە بێنێت كە پابەندە بە هەڵسوكەوتەكانی ئەم ئیمامەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو نوێژە، بۆنموونە: لە نوێژی عەسردا ئەوكەسە دەڵێت:( نیەتم

وایە چوار ڕکات نوێژی عەسر دەکەم بە جەماعەت لەدوای ئەم ئیمامە، لە سەرم پێویستکراوە بۆ خوای گەورە(الله اكبر)).

دووەم: دەبێت ئەوکەسە بەدوای ئیمامدا بڕوات لە نوێژەکەیدا، بۆنموونە: نوێژکەر کە لەدوای ئیمامەوە نیەتی هێناو دەستی کرد بە دوعای سەرەتای نوێژەکەو سوورەتی (فاتیحە)و سوورەتێك لە قورئانی خوێند، نابێت یەکسەر لەخۆیەوە بچێتە ڕکوعەوە، دەبێت چاوەڕێ بکات تا ئیمام دەچێتە ڕکوعەوە، ئینجا ئەویش بەدوایدا بچێتە ڕکوعەوە، نابێت لە رکوع هەستێتەوە هەتا ئیمام هەڵنەستێتەوە، نوێژکەر لە قورئان خوێندنەکانی دوای فاتیحەدا بۆی هەیە پێش ئیمام بکەوێتەوە، بەڵام لە جووڵەکاندا بۆی نییە پێشی بکەوێتەوە، هەتا ئیمامیش سەلام نەداتەوە، نوێژکەرەکە بۆی نیە سەلام بداتەوە.

سێیەم: نابێت ئەوکەسە ئەوەندە لە ئیمام دوا بکەوێت کە ڕیزی نوێژکەرەکان بشێوێنێت:

إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ (٤)الصف

﴿بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت بە یەکڕیزی لە پێناوی ئەودا دەجەنگن، وەکو دیوارێك وان کە(خشتەکانی) بەیەکەوە نووسابن﴾.

چوارەم: پێویستە ئیمام ڕەچاوی ئەوە بکات کە لەوانەیە خەڵکێکی نەخۆش لە جەماعەتەکەدا بن، بۆیە واچاکە نوێژەکان زۆر درێژ نەکرێنەوەو سوورەتە کورتەکان بخوێندرێن.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە کورتی نوێژەکەی تەواو دەکرد). (٧٥)

هەروەها کاتێك کە نوێژکەرەکان لە نوێژەکانیاندان و لە دەوروبەرەکە ڕووداوێك ڕوویدا، پێویستە نوێژکردنەکە پەلەی تێدا بکرێت بۆئەوەی فریای چارەسەری ڕووداوەکە بکەون.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: من کە گوێم لە گریانی منداڵێك دەبێت خێرا نوێژەکە تێدەپەڕێنم). (٧٦)

پێنجەم: وا چاکە ئیمام لەدوای دابەستنی نوێژەکەی بوارێك بدات بۆئەوانەی فریا نەکەوتوون، بۆئەوەی لە پێش ڕکوعی ڕکاتەکاندا نوێژەکەیان دابەستن و ئەو ڕکاتەیان لێ نەفەوتێت.

شەشەم: ڕاوەستان لە ڕیزی یەکەم خێری لە هی دووەم زیاترەو هی دووەمیش خێری لە هی سێیەم زیاترە.

پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ئەگەر دەتانزانی ڕیزی یەکەمی جەماعەت چیە، ئەوا تیروپشکتان بۆ دەکرد).(٧٧)

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: خواو فریشتەکانی سەڵەوات لەسەر ڕیزی یەکەم لێدەدەن).(٧٨)

بۆ ئافرەتانیش وەستان لە ڕیزی پاشەوە خێری زیاترە.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: باشترین ڕیزی ئافرەتان ئەوەی هەرە پشتەوەیانە، ئاژاوەترینیشیان ڕیزی یەکەمیانە، باشترین ڕیزی پیاوانیش ئەوەی یەکەمیانە، ئاژاوەترینیشیان ڕیزی پشتەوەیانە). (٧٩)

حەوتەم: نوێژی بە کۆمەڵ بە دوو کەس یان زیاتر پێکدێت، یەکیان دەبێت بە ئیمام و ئەوەی تریان لەدوای ئیمامەکەوە لەلای ڕاست دەوەستێت، ئەگەر کەسی سێیەمیش هات، ئەوا لەلای چەپی ئیمامەکەوە دەوەستێت، بە بەردەوامیش ئافرەتان لەدوای پیاوەکانەوە دەوەستن، بۆنموونە: ئەگەر دووکەس نوێژیان دابەست، ئەگەر ئافرەتێك هات، نایەتە تەنیشت کەسی دووەم، کە لەدوای ئیمامەوەیە، بەڵکو لەدوای کەسی دووەمەوە نوێژەکەی دادەبەستێت، بەم پێیە ئافرەتان بە بەردەوامی لەڕیزەکانی دواوەن.

(مووسای کوڕی ئەنەس دەڵێ: پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی بە من و بە ئافرەتێك کرد، منی لەلای ڕاستی خۆیەوە وەستاندو، ئافرەتەکەش لەدوای ئێمەوە نوێژەکەی کرد).(٨٠)

**هەشتەم:**

هەتا ڕیزێك تەواو نەبێت نوێژی ڕیزەکەی دوای خۆی قبووڵ نابێت.

**نۆیەم:**

کەسە نەخۆشەکان کە ناتوانن نوێژەکانیان بە پێوە ئەنجام بدەن، بۆیان هەیە نوێژەکانیان بە دانیشتنەوە ئەنجام بدەن.

## ئەو کاتانەی کە دروست نیە نوێژیان تێدا بکرێت

جگە لە شاری مەککە، پێنج کات هەیە دروست نیە بەبێ هۆ نوێژیان تێدا بکرێت:

**یەکەم:** دوای نوێژی بەیانی.

**دووەم:** دوای نوێژی عەسر هەتا خۆر ئاوا دەبێت.

**سێیەم:** ئەو کاتەی کە خۆری تێدا دەردەکەوێت هەتا بەرزدەبێتەوە.

**چوارەم:** لە کاتی نیوەڕۆدا هەتا خۆر لادەدات، جگە لە ڕۆژانی هەینی.

**پێنجەم:** لە کاتی زەردەی دوای ئاوابوون.

تێبینی: مەبەست لەو نوێژانەیە کە هیچ هۆیەك نەبێت بۆ ئەنجامدانیان، بەڵام ئەگەر هۆیەك هەبێت وەکو: سوننەتی دەستنوێژ، یان چوونە ناو مزگەوت، یان نوێژی مردوو، یان قەزاکردنەوە، ئەوە لە هەموو کات و شوێنێکی شیاو دروستە ئەنجام بدرێن.

## نوێژی سوننەت:

ئـەو نوێژانـەن کـە خـوا لەسـەر ئـادەمیزاد پێویسـتی نـەکردوون، بـەڵام وەکـو ڕەوشتێك پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کردوونی، دەکرێت بەینێك بخرێتە نێوان نوێژێکی فەرزو نوێژێکی سوننەتەوە، وەکوئەوەی کە لە نوێژە فەرزەکە بویتەوە شوێنەکەت بگوازێتەوە، بەڵام لە نوێژی بەیانیدا ئەگەر لە شوێنێکدا دانیشتیت بۆ یادی خوا، ئەوە سوننەتە تا خۆرکەوتن لەو شوێنە بمێنیتـەوە، لەبەرئـەوەی مانەوە لەو جێگەیەدا لەوکاتەدا خێری حەج و عومرەیەکی هەیە.

نوێژی سوننەت دەکرێن بە دوو بەشەوە:

**یەکەم:** ئەو نوێژە سوننەتانەی کە پێویست ناکات بە جەماعەت بکرێن.

وەکو سوننەتەکانی پاش و پێش نوێژە فەرزەکان، کە ناسراون بە:(الرواتب) وەکو نوێژی ئاسایی وەهان، لەو نوێژانەدا ئەوەی کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) زۆر سوربووە لەسەریان و خێریان زۆرە، ئەو نوێژانەن کە بە(مؤكدة) ناسراون: دوو ڕکاتی پێش بەیانی، دوو ڕکاتی پێش نیوەڕۆ، دوو ڕکاتی دوای نیوەڕۆ، دوو ڕکـاتی دوای مـەغریب و، دوو ڕکـاتی دوای عیشـا، ئەوانەشـیان کـە پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆخۆی کردوونی و بەڵام زۆر پێی دانـەگرتووە لەسـەر کردنیـان، لەلایـەن خـاوەن باوەڕەکانـەوە بـە(غير مؤكدة) ناسـراون: دوو ڕکـاتی تـری پـێش نیـوەڕۆ، دووی تـری دوای نیـوەڕۆو، چـواری پـێش عەسـرو، دوو ڕکـاتیش لـە پـێش مـەغریب و دووانـیش پـێش عیشـا، نوێـژی هـەینیش وەکـو نوێژی نیوەڕۆ تەماشا دەکرێت، واباشـە سوننەتەکانی پـێش نوێـژی بـەیانی و مـەغریب و عیشا بـە کورتی ئـەنجام بدرێن، واش گونجـاوە لـە ڕکـاتی یەکـەمی سـوننەتی نوێـژی بەیانیـدا سـوورەتی (الکـافرون) بخوێنـدرێت و لـە ڕکـاتی دووەمیشـدا سـوورەتی (الاخـلاص) بخوێنـدرێت، هـەروەها خوێنـدنی ئـەم دوو سـوورەتە سـوننەتن لـە هـەر نوێژێکـدا کـە سـوورەتی تایبـەت بـەخۆی بـۆ دانەنرابێت، هەروەها گونجاویشە لە سوننەتی پێش نوێژی بەیانیاندا لە ڕکاتی

یەکەمدا سوورەتی(الانشراح) بخوێنرێت و، لە ڕکاتی دووەمیدا سوورەتی (الفیل) بخوێنرێت.

نوێژی وەتر:

نوێژێکە لەنێوانی نوێژی عیشاو نوێژی بەیانیدا ئەنجام دەدرێت، لای هەرە کەمی ڕکاتێکەو لای هەرەزۆری (١١)ڕکاتە، شێوە ئاساییەکەی (٣)سێ ڕکاتە، لە کۆتایی هەموو دوو ڕکاتێکدا سەلام دەدرێتەوەو ڕکاتی کۆتاییش بەتەنها ئەنجام دەدرێت و تەحیاتی تێدا دەخوێنرێت و سەلامی تێدا دەدرێتەوە، وا پێویستە لە سێ ڕکاتی کۆتایی سوننەتی وەترا، لە یەکەمیان سوورەتی (الاعلی)و لە دووەمیان سوورەتی(الکافرون)و لە سێیەمیان سوورەتی(الاخلاص، الفلق، الناس) بخوێنرێن، دوای سەلام دانەوەش واباشە (٣)سێ جار بگوترێت: (سبحان الملك القدوس).

سوننەتی ئیشراق: سوونەتی خۆر هەڵاتن، لەگەڵ هەتاوکەوتن ئەنجام دەدرێت، ماوەکەی هەتا نوێژی نیوەڕۆیەو دوو ڕکاتە.

سوننەتی چێشتەنگاو: لە پاش بەرزبوونەوەی خۆر بە ئەندازەی ڕمبێك یان زیاتر هەتا کاتی نیوەڕۆ ئەنجام دەدرێت، لە دوو ڕکاعەتەوە بۆ هەشت ڕکات، دوو دوو ئەنجام دەدرێن و سەلامیان تێدا دەدرێتەوە، لە ڕکاتی یەکەمدا سوورەتی (الشمس)و لە ڕکاتی دووەمدا سوورەتی(الضحی)ی تێدا دەخوێنرێت، ئەگەر لە دوو ڕکاتیش زیاتر بوو، ئەوا سوورەتی(الکافرون)و (الاخلاص)ی تێدا دەخوێنرێت.

**(عائشە**(ڕەزای خوای لێبێت)**دەڵێ: پێغەمبەر**(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، **چوار ڕکات نوێژی چێشتەنگای دەکرد، ئەوەندەی خواش مەیلی لێبا زیاتری دەکرد)**.(٨١)

**(پێغەمبەر**(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فەرموویەتی: هەرکەسێك (ڕۆژانە) دوازدە ڕکات نوێژی چێشتنەگا ئەنجام بدا، کۆشکێکی لە زێڕ بۆ دروست دەکرێت لە بەهەشتدا)**.(٨٢)

سوننەتی(الاوابین): لە نێوانی مەغریب و عیشادا، لە دوو ڕکاتەوە بۆ چوارو بۆ شەش و هەتا بیست ڕکات دەکرێت.

سوننەتی (صلاة التسبیح): لە هەموو کاتێکدا دەکرێت، چوار ڕکاتە ئەگەر لە شەودا بکرێت دوو دوو ئەنجام دەدرێن، ئەگەر لە ڕۆژدا بکرێت هەر چوار بەسەر یەکەوە ئەنجام دەدرێن، لە هەموو ڕکاتێکدا (٧٥)جار دەگوترێت: (سبحان الله والحمد لله ولاالە الاالله والله اکبر)، لەپاش فاتیحە (١٥)جار، لە رکوعدا (١٠)جار، لەڕاستبوونەوەی دوای رکوع(١٠)جار، لە هەر سوجدەیەکدا (١٠)جار، لەنێوان سوجدەکاندا (١٠)جار، لە دانیشتنی پێش تەحیاتدا، یان لە جێگیربوونی هەستانەوەی دوای سوجدەی دووەمدا(١٠)جار، بە شێوەیەکی تریش دەبێت، پێش فاتیحە(١٥)جارو (١٠)جاری دوای سوجدەکانیش دەهێنرێتە دوای فاتیحەو ئەوانەی تریش وەکو خۆیان دەخوێنرێنەوە، ئەگەر لە نوێژەکەشدا تەسبیحاتەکە نەکرێت، ئەوا نوێژەکەی لە(صلاە التسبیح) دەردەچێت، ئەگەر هەندێك لە تەسبیحاتەکەشی تێدا بکرێت و هەندێکی نەکرێت، ئەوە گونجاوە بەڵام خێری کەمترە، لە ڕکاتی یەکەمی ئەو نوێژەدا سوورەتی(الکافرون) دەخوێندرێت و لە ڕکاتی دووەمیدا سوورەتی (الاخلاص) دەخوێنرێت.

شەو نوێژ: دوای نوێژی عیشاو سوننەتەکان، ئەوکەسەی کە دەخەوێت، دوای هەستانەوە لە خەو، چەندی بۆ بکرێت لە نوێژ بە شەونوێژ دادەنرێت، لای کەمەکەی دوو ڕکاتە.

سوننەتی تۆبەکردن: لای کەمی ئەم نوێژە دوو ڕکاتە، کاتێك مرۆڤ خۆی بە تاوانبار زانی لە ئاستی کارێکا کە بە نەزانی کردوویەتی، ئەوا دەستنوێژ هەڵدەگرێت و دوو ڕکات نوێژ دەکات بە نیەتی ئەوەی جارێکی تر بەلای ئەو کارەدا نەچێتەوە.

نوێژی گەشت کردن (صلاة السفر): دوو ڕکاتە، پێش دەستپێکردنی سەفەرەکە ئەنجام دەدرێت، لە ڕکاتی یەکەمدا دوای فاتیحە سوورەتی (الکافرون)و لە ڕکاتی دووەمیشدا سوورەتی(الاخلاص)دەخوێندرێن.

صلاة القدوم: سوننەتی گەڕانەوە لە سەفەر، کاتێك موسوڵمان لە سەفەرەکەی دەگەڕێتەوە، سوننەتە دوو ڕکات نوێژ ئەنجام بدات.

نوێژی پێداویستیەکان (صلاة الحاجه): دوو ڕکات نوێژە، لە کاتێکدا ئەنجام دەدرێت ئەوکەسە پێویستیەکی هەبێت و بۆی ئەنجام نەدرێت، دوای نوێژەکە لە خوا دەپاڕێتەوەو داوای ئەوە دەکات کارەکەی بۆ ئەنجام بدرێت.

(صلاة الاستخاره):

فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ (١٥٩)ال عمران

﴿ئەگەر لەسەر جێبەجێکردنی ئەرکێکیش جێگیر بووی، ئەوا پشت بە خوا ببەستە، بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کە پشتی پێ دەبەستن﴾.

کاتێك کە نەتتوانی بڕیاری کارێك بدەیت، دوو ڕکات نوێژی هانابردن دەکەیت، کە داوای یارمەتی لە خوا دەکەیت ڕێگەت نیشان بدات بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، ئینجا خوا یان لە ڕێگەی خەونەوە ڕێنومایت دەکات، یان بیرو هۆشت ڕوونـاك دەکاتەوە بەوەی کارەکە بکەیت یان نەیکەیت، ئەگەر بە جارێك ئەنجامت نەبوو، دووبارە دەکرێتەوەو چاوەڕێ دەکرێت، ئەگەر ئەنجام نەبوو بۆ جاری سێیەمو .....چەند جارێك دووبارە دەکرێتەوە.

نوێژەکە دوو ڕکاتە سوننەتە، وەکو هەر نوێژێکی ئاسایی دەکرێت، نیەتی نوێژی (هانابردن)ی لێدێنی، دوای فاتیحەی ڕکاتی یەکەم سوورەتی (قل یا ایها الکافرون)و لەدوای فاتیحەی ڕکاتی دووەم: (قل هو الله احد)دەخوێنرێت، سوجدەکان دەبرێن و تەحیات دەخوێندرێت و سەلام دەدرێتەوە، ئینجا سەڵوات لەپێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)دەدرێت و دەستەکان بەرز دەکرێنەوەو ئەم دووعایە دەخوێندرێت:(خوایە من بە هۆی زانستەکەتەوە هانا بۆتۆ دێنم،

بەهۆی تواناكەتەوە تێتڕادەبینم هەموو كارێك ئەنجام بدەی، لە چاكەو پێ بەخشینەكانیشت داوای یارمەتیت لێ دەكەم، تۆ خاوەن توانایتو من بێ توانام، بێ زانیاریمو تۆش زانیاریت بە دنیای نادیار هەیە، ئەی خوایە، ئەگەر دەزانی (ئەو ئیشە) خێری بۆ من تێدایە لە ئێستاو داهاتوویدا، یان خێری بۆ خۆمو ئایینەكەمو چارەنووسەكەم تێدایە، ئەوا ئەو كارەم بۆ دابین بكەو كارئاسانیم بۆ بكەو پیرۆزی خۆتی بخەناوەوە، ئەی خوایە، ئەگەر دەشزانی (ئەو ئیشە) ئاژاوەیە بۆ ئێستاو داهاتوی خۆمو ئایینەكەمو پاشەڕۆژەكەم، ئەوا لێمی دووربخەوە، ئەی خوایە، خێروچاكەم بۆ دیاری بكەو وام لێبكە پێی ڕازیبم).

سوننەتی زاوایەتی: دوو ڕكات نوێژە، پێش ئەوەی زاوا بچێتە لای بووك.

سوننەتی ئیحرام: دوو ڕكاتە، لەكاتی پۆشینی بەرگی حەج یان عومرە كردن.

سوننەتی سوڕانەوە بە دەوری كەعبەدا: دوو ڕكات نوێژە، دوای تەوافەكە.

سوننەتی دەستنوێژ: دوو ڕكاتە دوای دەستنوێژ هەڵگرتن ئەنجام دەدرێت.

تحیە المسجد: ڕێزنان لە مزگەوت: دوو ڕكات نوێژە، وەكو ڕێزێك بۆ ئەو شوێنە كە ماڵی خوایە، كە چوویتە ناو مزگەوتێكەوە بەر لە هەموو شتێك ئەو دوو ڕكات نوێژە ئەنجام دەدەیت.

بەڵام ئاگاداربن، هەموو شوێنێكیش مزگەوت نیە، مزگەوت ئەو شوێنەیە لەسەر بنەمای خواپەرستی بنیات نرابێت، نەك لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی گروپێك یان تاكە كەسێك، لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) كە مزگەوتی موسوڵمانەكان لە قەدو لاسكو پەلكی خورما دروستكرابوو، بێباوەڕەكان مزگەوتێكیان دروستكرد، پێغەمبەریش(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زۆر دڵی بەو مزگەوتە خۆش بوو، بەڵام كاتێك كە تەواوكراو داوا لە پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كرا بچێت دوو ڕكات نوێژی تێدا بكات، ئا لەوێدا خوا وەكو ماددەیەكی یاسایی بنبڕ فەرمووی:

وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِداً ضِرَاراً وَكُفْراً وَتَفْرِيقاً بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَاداً لِمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِنْ قَبْلُ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلاَّ الْحُسْنَى وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ (١٠٧) لا تَقُمْ فِيهِ أَبَداً لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَنْ تَقُومَ فِيهِ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ (١٠٨) التوبة

﴿ئەوانەش کە بێباوەڕ بوونو مزگەوتێکیان دروستکرد بۆ زیان گەیاندنو جیاوازیی خستنەناو خاوەنباوەڕەکانو (بەکارهێنانی ئەو مزگەوتە وەکو) سەنگەرێکی نیشانەگری بۆ ئەو کەسانەی کە پێشتر دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەیان دەکردو (لە دروستکردنی مزگەوتەکەشدا)سوێند دەخۆن کە ئەوەی مەبەستمان بووە تەنها چاکەکاری بووە، خواش شایەدی دەدات بەوەی کە ئەوان درۆ دەکەن، (ئەی محەمەد)هەرگیز لەو مزگەوتەدا مەمێنەوە، بۆ تۆ ڕەواترە لە مزگەوتێکدا بمێنیتەوە کە لە یەکەم ڕۆژەوە لەسەر بناغەی خواپەرستی دروست کرابێت، کە لەو مزگەوتەدا خەڵکێکی تێدا بێت پێیان خۆشە هەردەم خۆیان پاك بکەنەوە، خواش خۆپاککەرەوەکانی خۆشدەوێت﴾.

نابێت گۆڕی پێغەمبەرانو پیاوچاکان بکرێن بە مزگەوت:

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: خوا جولەکەکان لەناوبەرێت، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردوون بە مزگەوت). (٨٣)

دووەم: ئەو نوێژە سوننەتانەی کە پێویستە بە جەماعەت بکرێن.

## نوێژی تەراویح

ئەم نوێژە تەنها لە شەوەکانی مانگی ڕەمەزاندا ئەنجام دەدرێت، لەدوای سوننەتەکەی نوێژی عیشاوە دەست پێدەکات، هەتا هاتنی کاتی نوێژی بەیانی، بە تەنیاو بە جەماعەتیش دەکرێت، لە مزگەوتو لە ماڵەوەش دەکرێت، هیچ فەرز کردنێك نیە بەوەی ئەو نوێژە بە جەماعەت فەرز بکاتو لە مزگەوتیشدا بکرێت، پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە(٣)سێ شەوی (٢٣، ٢٥، ٢٧)ی مانگی ڕەمەزاندا، (٨)هەشت ڕکاتی لەو نوێژە لە مزگەوتا کردووە،

نوێژەکەشی وەکو تاك ئەنجام داوە، پاشتر موسوڵمانەکان ئەویان کردوە بە ئیمام و نوێژەکانیان لەپاش ئەوەوە دابەستووە، پاشان گەڕاوەتەوە ماڵەوەو بە(٨)هەشت ڕکاتەکەی مزگەوتەوە (٢٠)ڕکاتی لە ماڵەوە تەواوکردووە، بۆیەش ئەوەی کردووە هەتا نەبێت بە فەرز بەسەر موسڵمانەکان، موسوڵمانەکان سەربەستن بە جەماعەت بیکەن یان بە تەنیا، لە ماڵەوە بیکەن یان لە مزگەوت، ئەم نوێژە بەپێی سوننەتی پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (٨)هەشت ڕکاتە، بەپێی هەڵوێستی زۆرینەی ئەسحابەکان و زانایان لە دوای پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) (١٢) ڕکاتەو دوو دوو ئەنجام دەدرێن و سەلام دەرێتەوە.

## نوێژی جەژنەکان

جەژنەکان لە ئیسلامدا ڕێوڕەسمی تایبەتیان هەیە، شەوو ڕۆژەکانی بە پیرۆز رادەگیرێن و، خۆشردن بۆ ڕۆژی جەژنیش سوننەتە، ئەم نوێژانە لە ئاوایییەکدا دەبێت بەرێوەببرێن، هەرکەسێك بیەوێت خێری پێ بگات دەبێت ئامادەبێت، چونکە لە گوتەی سەرەکی شەرعدا سوننەتی کیفایەنین، سوننەتی عەینن، ئەگەر ئێوارەی دواڕۆژی ڕەمەزان مانگی تازە بینرا، ئەوە دەگەیەنێت کە دواڕۆژی ڕەمەزان شەوەکەی کەوتۆتە مانگی شەوالەوە، کە دەڵێن جەژن مەبەست لەو شەوەیە کە ڕەمەزانی تێدا بە کۆتا هاتووەو، بە(الله اکبر... الله اکبر.. لاالە الاالله.... والله اکبر الله اکبر ولله الحمد) پێشوازی لە ڕۆژی جەژن دەکرێت و تەراویحی تێدا ناکرێت، ڕۆژەکانی جەژنیش لە کازیوە بەربەیانەوە دەست پێدەکەن تا خۆرئاوا بوون.

نوێژی جەژنی ڕەمەزان و نوێژی جەژنی قوربان دوو نوێژی سوننەتن، دوو ڕکاتین، لەدوای ئەوەی کە خۆر بە ئەندازەی ڕمبێك لە کەلەوە بەرز دەبێتەوە، ئەو نوێژانە بەڕێوەدەچن، جەژنی ڕەمەزان لە بەربەیانی ڕۆژی یەکەمی مانگی شەوال و، جەژنی قوربانیش لە ڕۆژی (١٠)دەیەمی مانگی(ذي الحجة)ئەنجام دەدرێن، هەرکەسێك نوێژی فەرز قەرزدار بێت، ئەوا کاتێك کە نوێژێکی

سوننەت ئەنجام دەدات، دەبێت نیەتی جێبەجێ کردنی نوێژێکی فەوتاوی بەیانی بێنێت و لەگەڵ ئیمامەکەدا نوێژەکەی تەواو بکات و پابەند نەبێت بە هەندێك تایبەتمەندی تایبەتی ئەو نوێژە، بۆنموونە: کەسێك نوێژی بەیانی قەرزدارەو ڕۆژی جەژن هاتووە لەگەڵ موسوڵمانەکان بە جەماعەت نوێژی جەژن ئەنجام بدات، ئەوا ئەوکەسە لەنێو ئەو جەماعەتەدا نوێژە فەوتاوەکەی خۆی دەگێڕێتەوەو، (الله اکبر)ەکان ناکات و دەستیش بەرز ناکاتەوەو نوێژەکەی وەکو نوێژێکی بەیانی ئەنجام دەدات، بەڵام ئەگەر کەسێك هیچ نوێژێك قەرزدار نەبوو، ئەوا لەگەڵ ئیمامەکەدا سوننەتی نوێژی جەژن ئەنجام دەدات، لە ڕکاتی یەکەمدا دوای نوێژ دابەستنەکەو خوێندنی (وجهت وجهي....) دەست بەرز دەکرێتەوەو حەوت جار دەگوترێت(الله اکبر)، لەنێوان هەر(الله اکبر)ێکدا واباشە بگوترێت: (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اکبر)، پاشان فاتحە دەخوێندرێت و بەدوایدا سوورەتی( قاف یان سوورەتی الاعلی) دەخوێندرێت و ڕکاتەکە تەواو دەکرێت، لەگەڵ هەستانەوە بۆ ڕکاتی دووەم، بەهەمان شێوەی ڕکاتی یەکەم دەستەکان بەرز دەکرێنەوەو پێنج جار (الله اکبر)دەکرێت و لە نێوانیشیاندا ئەم وێردە: (سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اکبر) دەگوترێتەوەو فاتیحە دەخوێندرێت و سوورەتی(اقتربت) یان(هل اتاك) دەخوێندرێت و نوێژەکە تەواو دەکرێت و سەلام دەدریتەوەو ئیمام هەڵدەستێتەوە بۆ پێشکەشکردنی دوو وتار، لە سەرەتای وتاری یەکەمدا نۆ جار بەسەر یەکەوە(الله اکبر)و لەوتاری دووەمیشدا حەوت(الله اکبر) بەسەر یەکەوە دەیانڵێت، واباشە لە وتارەکانی مانگی ڕەمەزاندا باسی زەکاتی سەرفترەو، لە وتاری جەژنی قوربانیشدا باسی قوربانی کردن بکرێت، ئەگەر ڕۆژی یەکەمی یەکێك لەو دوو جەژنە کەوتە ڕۆژی هەینیەوە، ئەوا نوێژی جەژن جێگەی نوێژی هەینی دەگرێتەوەو موسوڵمانان دەتوانن نوێژەکەی هەینیان وەکو نوێژێکی نیوەڕۆ ئەنجام بدەن.

## نوێژی مانگ و ڕۆژ گیران

ئەم نوێژانە سوننەتن، هەروەها سوننەتیشە بە جەماعەت ئەنجام بدرێن، سوننەتیشە لە پاش نوێژەکەدا دوو کورتە وتار بخوێنرێنەوە، هانی خەڵکی بدات بۆ چاکەکردن و پەشیمان بوونەوە لە تاوانەکان، ئەم نوێژە لەوکاتەدا بەڕێوەدەبرێت کە خۆرو مانگ ڕووناکیان لێ دەبڕێت لە ئەنجامی سوڕانەوەی مانگ بە دەوری زەویدا یان سوڕانەوەی مانگ و زەوی بە دەوری خۆردا، کە مانگ دەکەوێتە نێوان خۆرو زەوییەوەو بەری تیشکی خۆر دەگرێت و لەوبەشەی سەرزەویی نیمچە تاریکی دادێت، ئەمە بە خۆرگیران ناسراوەو نوێژەکەی بە بێدەنگی ئەنجام دەدرێت و کاتەکەشی بە ڕووناك بوونەوەی دەوروبەرەکە کۆتایی پێدێت، ئەگەر مانگیش کەوتە بوارێکەوە، کە لە زەویەوە تیشکدانەوەکانی خۆری بەرنەکەوێت، ئەوە مانگ بە تاریکی دەردەکەوێت، ئەم بارە بە مانگ گیران ناسراوە، ئەم نوێژە بە دەنگەوە ئەنجام دەدرێت و، کاتەکەشی بە ڕەوشەن بوونەوەی ڕووی مانگ کۆتایی دێت.

ئەم نوێژە بە(٣)سێ شێوە ئەنجام دەدرێت:

### شێوەی یەکەم:

نیەتی نوێژی سوننەتی ڕۆژگیران یان مانگ گیران دەهێنیت و دوو ڕکات نوێژی ئاسایی وەکو نوێژی بەیانی دەکەیت و سەلام دەدەیتەوە.

### شێوەی دووەم:

نیەتی نوێژی سوننەتی ڕۆژگیران یان مانگ گیران دەهێنیت و بە(الله اکبر)ێك نوێژەکەی دادەبەستێت و فاتیحەو سوورەتێکی کورت دەخوێنێت و دادێتەوە بۆ ڕکوع، کە بەرز دەبێتەوە لە ڕکوع، بەڕاوەستاوی دەمێنێتەوەو جارێکیتر فاتیحەو سوورەتێکی کورت دەخوێنێت، پاشان دەچێتەوە ڕکوع، کە ڕاست بۆوە، دادێتە سەر ئەژنۆکانی و دووجار کڕنووش دەبات، هەتا ئێرە ئەمە ڕکاتی

یەکەمـە، دوای کڕنووشـەکان هەڵدەسـتێتەوەو ڕکـاتی دووەمـیش بـە شـێوەی ڕکاتی یەکەم تەواودەکاتو تەحیات دەخوێنیٚو سەلام دەداتەوە.

### شێوەی سێیەم:

هـەمان شـێوەی دووەمـە، بـەڵام لـەدوای خوێنـدنی فاتیحـەی یەکـەم، هـەموو سـووڕەتی بەقـەرە یـان بـە ئەنـدازەی ئـەو سـووڕەتە لـە سـووڕەتەکانی تـر دەخوێنرێت، لەدوای فاتیحەی دووەمی ڕکاتی یەکەمیشدا بە ئەندازەی (٢٠٠) دووسەد ئایەت لە(البقره) دەخوێنرێت، لە فاتیحەی یەکەمی ڕکاتی دووەمیشدا بـە ئەنـدازەی(١٥٠)سـەدو پـەنجا ئایـەت لـە(البقره) دەخوێنرێـتو لـەدوای فاتیحەی دووەمی ڕکاتی دووەمیشدا بە ئەندازەی(١٠٠) ئایـەت لـە سووڕەتی (البقـره) دەخوێنرێت، لـە ڕکوعی یەکـەمی ڕکـاتی یەکەمدا بە ئەندازەی(١٠٠) ئایەتی سووڕەتی (البقره) بگوترێت: (سبحان ربي العظيم وبحمـده)، لـەڕکوعی دووەمی ڕکـاتی یەکەمـدا ئەوەنـدەی (٨٠)هەشـتا ئایـەت لـە(البقره)و لـەڕکوعی یەکـەمی ڕکـاتی دووەمـداو ئەوەنـدەی(٧٠)حـەفتا ئایـەت لـە(البقره)و لـەڕکوعی دووەمـی ڕکـاتی دووەمـدا ئەوەنـدەی(٥٠)پـەنجا ئایـەت لـە(البقره)دەخوێنرێن، لەهەر سوجدەیەکیشـدا ئەوەنـدەی ڕکوعەکـەی پـێش خۆی(سـبحان ربـی الاعلـی وبحمده) بخوێنیٚو پاشان تەحیات بخوێنێتو سەلام بداتەوە.

## نوێژی باران بارین

ئەم نوێژە سوننەتە، لەکاتی بیٚ بارانیدا بە کۆمەڵ ئـەنجام دەدرێـت، داواکردنـی باران بارین بە سیٚ شێوە ئەنجام دەدرێت:

**شێوەی یەکەم:** پاڕانەوەی خەڵکە لـە پەروەردگارەکـەیان، بۆئـەوەی بارانیـان بـۆ ببارێنێت، جا ئەم پاڕانەوەیە بە تاك بێت یان بە کۆمەڵ.

**شێوەی دووەم:** پاڕانەوە لە پەروەردگار لـە دوای نوێـژە فـەرزەکانو پاڕانـەوەش لە وتارەکانی نوێژی هەینیدا، بۆئەوەی بارانیان بۆ ببارێنێت.

**شێوەی سێیەم:** گەورەی موسوڵمانان بۆ مەبەستی ئەنجامدانی نوێژی باران بارین، فەرمان دەکات خەڵکی ناوچەکە هەموویان سێ ڕۆژ بەڕۆژووبن و، تۆبە بکەن و گەردنی یەکتری ئازاد بکەن و لە تاوانەکانیان پەشیمان ببنەوە، جا لە ڕۆژی چوارەمدا پیرو گەنج و منداڵ بە زمانی بەڕۆژووەوە لە بەرگێکی هەژارانەو بێ دەسەڵاتیدا هەندێك لە ئاژەڵ و مەڕومالاّتەکانیان لەگەڵ خۆیان بەرن و بچنە دەرەوەی ئاواییەکەو لەوێ بە نیەتی نوێژی باران بارین دوو ڕکات نوێژ لە شێوەی نوێژی جەژن ئەنجام دەدەن و لە ڕکاتی یەکەمدا (٧)حەوت جار(الله اكبر)و لە ڕکاتی دووەمدا (٥)پێنج جار(الله اكبر)دەکرێت و لەدوای فاتیحەی ڕکاتی یەکەم و دووەمدا سوورەتی(نوح) دەخوێنرێت و پاشان ڕکوع و سوجدەکان دەبرێن و تەحیات دەخوێنرێت و سەلام دەدرێتەوە، دوا بەدواش ئیمام دوو وتار دەخوێنێتەوە، وتاری یەکەم بە(٩)جار (استغفر الله)کردن بەدوای یەکدا دەست پێدەکات و ئەم دوعایە دەخوێنێت: (اللهم اسقنا غيثاً مغيثاً هنيئاً مريئاً غدقاً مجللا سحا طبقاً دائماً، اللهم اسقنا الغيث ولاتجعلنا من القانطين، اللهم انا نستغفرك انك كنت غفارا، فأرسل السماء علينا مدرارا)، دوای کەمێك وتاری دووەم بە(٧)جار (استغفر الله)کردن دەست پێدەکات و، ئیمامەکە ڕوودەکاتە قیبلەو چەندی بۆی بکرێت دەپاڕێتەوە بۆئەوەی خوا بارانیان بۆ بباریێنێت، سوننەتە لە کاتی ئەم پاڕانەوەیەدا ئیمام و نوێژکەرەکان بەرماڵەکانی سەر شانیان سەرەوژێرو ڕاست و چەپ بکەن و بەم شێوەیە بگەڕێنەوە ناو ئاوەدانیەکەیان.

## نوێژی مردوو

پێش ڕوونكردنەوەی چۆنیەتی نوێژی مردوو، پێویستە هەندێك لە ئادابەكانی پێش مردنو، دوای مردنو، شوردنو كفن كردنو، نوێژی مردوو، خستنە ناوگۆڕ ڕوون بكرێنەوە. هەر موسوڵمانێك لەكاتی نەخۆشی یان تەندروستیدا، پێویستە دان بەخۆداگربێتو پەشیمان ببێتەوە لەو تاوانانەی كە كردوونیو، مافی خەڵكی بداتەوەو توێشویەك ئامادە بكات بۆ گەشتێكی لەپڕ كە بە مردن ناسراوە، ئەوانەی باسكران بۆ كەسانی نەخۆش پێویستترن، جا ئەوكەسە كە هەستی بەخۆی كرد كە نەخۆشیەكەی ڕۆژ بەڕۆژ لێی توند دەكاتو بەرەو مردنی دەبات، پێویستە لەم كاتەدا، لەلای كەسێكی باوەڕپێكراو وەسیەت بكات، لەبارەی ئەو قەرزانەی لەسەریەتی، یان ئەو قەرزانەی كە داویەتی بە خەڵكو كاتی وەرگرتنەوەیان نەهاتووە، یان لەبارەی ئەو ئەمانەتانەی كە لای دانراون، یان لەبارەی ئەو چاكەكاریانەی كە دەیەوێت دوای مردنی بۆی بكرێن، هەروەها سوننەتە خزمو ناسیاوو دەروجیران، سەردانی نەخۆش بكەنو دڵی بدەنەوەو هیوای چاكبوونەوەی بۆ بخوازنو ئەوەندەش لەلای نەمێننەوە كە ببێتە بارقورسیەك بەسەر نەخۆشەكەوە، مەگەر نەخۆشەكە خۆی ئارەزووی دیداری كەسێك بكاتو بیەوێت ماوەیەكی زیاتر لەگەڵیدا بمێنێتەوە، جا لەكاتێكدا نەخۆشیەكە بووە هۆی ئەوەی نەخۆشەكە بگاتە قۆناغی گیاندان، ئەوا پێویستە دەورەی چۆڵ نەكرێتو بەرەو قیبلە درێژ بكرێتو هان بدرێت بەوەی چەندجار وێردی(لا الە الا اللە) بڵێتەوەو قورئان خوێنێكیش سوورەتی (یس)ی بەسەردا بخوێنێت، جا كاتێك گیانی دەرچوو، دەستێك بەسەر پێڵوی چاوەكانیدا دەهێنرێتو، چاوەكانی دادەخرێنەوەو هەوڵدەدرێت بەزووترین كات بشۆرێتو كفن بكرێت.

جلكەكان لەبەر مردووەكە دادەكەنرێنو لەسەر شوێنێكی نیمچە بەرزدا درێژ دەكرێت كە تایبەتە بە مردوو شردنەوە، سەرەتا مردووشۆرەكە نیەتی شوردنی

مردووەکە دەهێنێت‌و هەر پیسیەك لەسەر هەر شوێنێکی جەستەی مردووەکەدا هەبێت لادەبرێت‌و بە ئاوێکی شیلەتێن پاك دەکرێتەوە.
دەکرێـت نینـۆکی مردووەکـە بکـرێن‌و ڕیـش‌و بـەرو بنهـەنگڵی پـاك بکرێتـەوە، ئینجا لەسەرەوە بۆ خوارەوە جەستەی مردووەکە دەشۆرێت‌و دەست بە لەشیدا دەهێنرێت‌و ئاو دەگەیەنرێتە هەموو بەشەکانی لەشی، تەنانـەت ئەگـەر کەسێك خەتەنــە نــەکرابێت، هەوڵــدەدرێت پێســتی ســەری زەکــەری هەڵبدرێتــەوەو بشـۆرێت، مەرجـە لـەم شـوردنانەدا ئەندامـەکانی لای ڕاسـت بخرێنـە پـێش لای چـەپ، ئـەم شـوردنانە سـێ جـار دوای یـەك دووبـارە دەکرێنـەوە، ئـەم شـوردنە بەسـە بـۆ پاکبوونـەوەی ئـافرەتێکی مـردووی زەیسـتان یـان خـاوەن حـەیز، وا گونجاوە کەسی نێرینە مردووی نێرینە بشوات‌و، کەسـانی مێیینـەش مـردووی مێیینە بیشوات، گونجاونیە تەماشای عەورەتی مردوو بکرێت، گونجاویشـە ژن بەشدار بێت لە شوردنی جەستەی مێردە مردووەکەیدا، ئەگەر ئەو ژنە لەماوەی حەیزو زەیستانیشدا بێت، هەروەها گونجاویشە مێرد بەشدار بێت لـە شـوردنی ژنــە مردووەکەیــدا، بەمــەرجێك لــە هــەردووك بارەکانــدا مردووشــۆرەکە دەستەوانەیەك لە دەست بکات، نەهێڵێت پێستی کەسـە زیندووەکـە بـە پێسـتی مردووەکە بگەیەنێت، پاشـان دەسـتنوێژێك بـە مردووەکـە هەڵـدەگیرێت‌و ئامـادە دەبێت بۆئەوەی کفنەکەی تێوە بپێچرێت.
ئەگەر کەسێك شەهید بێت لە ڕێگەی خوادا، ئەوا بەرگەکەی لەبەر داناکەنرێت‌و ناشۆرێت، نوێژیشی لەسەر ناکرێت‌و دەخرێتە گۆڕەوە، ئەگـەر کەسـێك بەهـۆی کارەســاتێکەوە جەســتەکەی وای لێهــاتبوو کــە نەشــۆرێت، ئــەوا پێویســتە تەیەممومی بۆ بکرێت.
هـەموو پارچـەیەکی بڕدراوی جەسـتەی ئـادەمیزاد، وەکـو جەسـتەکەی وایـە بـە مردوویی، دەبێت بشۆردرێت‌و نوێژی لەسـەر بکرێـت‌و بخرێتـە گـۆڕەوە، ئەگـەر منداڵێکی لەبەرچوو هیچ ئاکارێکی مرۆڤی تێدا دەرنەکـەوتبێت، ئـەوا شـوردن‌و

نوێژ لەسەرکردنی ناوێت، تەنها لە پارچە جلێکەوە دەپێچرێت و دەخرێتە ژێر خاکەوە، بەڵام ئەگەر شێوەی مرۆڤی وەرگرتبوو، نیشانەی ژیانی پێوە دیار نەبوو، ئەوە دەشۆردرێت و کفن دەکرێت و دەخرێتە ژێر خاکەوە، بەڵام ئەگەر بەتەواوی شێوەی ئادەمیزادی هەبێت و شوێنەواری جووڵەو دەنگی پێوە دیاربێت، یان بەواتایەکی تر تەمەنی لە چوار مانگ زیاتر بێت و، گیانی بە بەردا کرابێت، ئەوە دەبێت بشۆرێت و کفن بکرێت و نوێژی لەسەر بکرێت و بخرێتە گۆڕەوە.

ئەوکەسەی کە مردووەکە دەشوات دوای ئەوەی لەشردنەکە بۆوە، پێویستە وەکو سوننەتێك خۆی بشواتەوە.

(پێغەمبەری خوا(صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: کەسێك کە مردوویەکی شرد، با دواتر بۆخۆشی خۆی بشواتەوە). (٨٤)

جا کە مردووەکە شۆرا، ئینجا کفن دەکرێت، کفن پۆشاکێکە بۆ داپۆشینی عەیب‌وعاری مردووەکە، لە کۆمەڵگای ئیسلامدا کفن قوماشێکە لە لۆکەی سروشتی دروست دەکرێت، پێی دەگوترێت (خام)، کە ڕەنگەکەی لەنێوان سپی و زەردێکی کاڵ دایە، مردوو هەردەبێت کفن بکرێت، ئەگەر خۆی ماڵ‌وسامانی لەدوا بەجێما، ئەوە لە ماڵ و سامانەکەی خۆی پارەی کفنەکە دەدرێت، ئەگەر خۆی ماڵ و سامانی نەبوو، ئەوا لەسەر کەسە نزیکەکانیەتی وەکو باوك و براو باپیر، ئەگەر ئەوانەش نەیانبوو، لەوبەشە ماڵە وەردەگیرێت کە لەلایەن موسوڵمانانەوە تەرخانکراوە بۆ کڕینی کفنی خەڵکی بێ دەرامەت، ئەگەر ئەو ماڵەش نەبوو، ئەوا لەپارەی خەزێنەی دەوڵەت ئەو کفنە دەکڕدرێت، ئەگەر دەوڵەتیش توانای نەبوو، ئەوا دەوڵەمەندێکی خاوەن توانا ئەو ئەرکە دەگرێتە ئەستۆ، کارێکی ناگونجاوە مرۆۋ پێش وەخت جۆرێك لە قوماش دانێت بۆ کفن کردنەکەی.

مردوو مافی ئەوەی هەیە بە سێ بەرگ کفن بکرێت لە تەپڵی سەریەوە بۆ ژێر پێکانی، بەڵام ئەگەر خۆی وەسیەتی کردبوو کفنەکەی تەنها بەرگێك بێت، ئەوا تەنها بە یەك بەرگ کفن دەکرێت، ئەگەر لەنێو میراتگرەکانیشدا منداڵی وەها نەبن کە هەتیوبن، ئەوە بۆ ئافرەتان واباشترە ژمارەی کفنەکان بکرێن بە پێنج، دوو بەرگ لەسەریەك وەکو پێچەرەوە(لفاف)، لەسەریەوە بۆ ژێر پێیەکانی، بەرگی سێیەم: پارچەیەك بە دەوری لەشیدا، لەنێوان ناوکیەوە بۆسەر ئەژنۆکانی (ازار)، بەرگی چوارەم: کراسێك(قمیص) کە شانەکانی تاکو پێیەکانی بگرێتەوە، سەرپێچێك (خمار) کە بە دەوری سەرو پرچیدا ببەسترێت، جا کە کفنەکان کرانە بەری مردووەکە، ئینجا بە پارچەی باریکی قوماشی کفنەکە لەلای سەری و لەخوار قاچەکانی و لەلای پێیەکانی و لەلای ئەژنۆکانی و لەسەر باسکەکانی، بە توندی دەپێچرێن و، کە خرایە گۆڕەوە ئەم پارچە قوماشانە دەکرێنەوە، ئینجا لەدیمەنێکی شایستەدا دەخرێتە ناو دار جەنازەیەکەوەو بە سەڵاوات لێدان لەسەر محەمەد(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەهێنرێت بۆئەوەی نوێژی مردووی لەسەر بکرێت:

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: هەر موسوڵمانێك بمریٚ و موسوڵمانان بە سێ ڕیز نوێژی لەسەر بکەن، ئەوە بەهەشتی مسۆگەرە). (٨٥)

ئەم نوێژە بە هیچ جۆرێك لەسەر کەسانی بێباوەڕ ناکرێت:

وَلا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَداً وَلا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ (٨٤)التوبة

﴿کە یەکێکیش لەوان(لەبێباوەڕەکان) دەمرێت، هەتاهەتایە نوێژیان لەسەرمەکە، لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە، ئەوانە بێباوەڕیان نواند بەرانبەر بە خواو پێغەمبەرەکەی، بەشێوەیەکیش مردوون کە لە ڕێگەی ڕاست لایانداوە﴾.

نوێژی مردوو بە تەنهاو بە جەماعەت ئەنجام دەدرێت، نوێژکەرەکانیش هەتا لە خزمە نزیکەکانی بن باشترە، ئەگەر بە جەماعەت بوو واباشترە بە سێ ڕیز

بووەستن، نیەتی نوێژی مردوو دەهێنرێتو (الله اکبر)ی نوێژ دابەستن بە دەنگێکی نیمچە بەرز دەگوترێتو، سوورەتی فاتحە دەخوێنرێتو (الله اکبر)ی دووەم دەگوترێتو سەلاوات لەسەر پێغەمبەر لێدەدرێت بەم شێوەیە(اللّهم صلِّ علی محمد وعلی آل محمد)، ئینجا(الله اکبر)ی سێیەم دەگوترێتو دوعا بۆ مردووەکە دەکرێت بەم شێویە دەگوترێت: (خوایە بەزەییت پێیدا بێتەوە)، یان(خوایە لێی خۆشببە)، دوعای تریش هەیە وەکو ئەوەی بڵێیت: (ئەی خوایە خۆشبە لە زیندوو لە مردووکانمان، لە نێرو لە مێیەکانمان، لەوانەشمان کە ئێستا لێرەنو لەوانەشمان کە ئامادە نین، ئەی خوایە ئەوانەی لە ئێمە کە زیندوویان دەکەیتەوە، لەسەر ئاینی ئیسلام زیندوویان بکەوە، ئەوانەی ناو ئێمەش کە دەیانمرێنیت، بە باوەڕەوە بیانمرێنە). ئینجا (الله اکبر)ی چوارەم دەگوترێتو ئەم دوعایە دەخوێندرێت: (خوایە بێبەشمان مەکە لەو پاداشتەو.....) پاشان سەلام دەدرێتەوەو کۆتایی بە نوێژەکە دێتو دەکەونەڕێ بەرەو گۆڕستان.

لە سێ کاتدا گونجاو نیە مردوو بخرێتە گۆڕەوە:

**یەکەم:** بەیانیان کە خۆر لە کەلەوە دەردەکەوێت هەتا بەرز دەبێتەوە.

**دووەم:** نیوەڕۆیان کاتێك لە ناوەڕاستی ئاسماندا بێت.

**سێیەم:** ئێواران کە بەرەو ئاوابوون دەڕوات.

(پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ئەگەر جەنازەیەکتان بینی بۆی هەستنە سەرپێ هەتا لێتان تێدەپەڕێت).(٨٦)

(پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمانی پێکردووین بەوەی سەردانی نەخۆشەکان بکەینو بەدوای تەرمی مردووەکانیشەوە بین بۆ گۆڕستان). (٨٧)

مردن کۆتایی ڕێڕەوی بوونی زیندەوەرەکان نیە، ئەوان لە نەبوونەوە کەرەسە خاوەکەیان دروستکرا، ئینجا پەروەردگار لەم کەرەسە خاوانە ئادەمی دروستکرد، ئینجا لە ئادەمەوە حەوای وەکو مێیینەیەك دروستکرد، ئینجا لە

له تۆوی ئادەمو له هێلکەی حەواوە وەچەکانیانی هێنانە ژیانەوە بۆ کاتێکی دیاریکراو، لەوکاتە دیاریکراوەدا دەسەڵاتی بینین‌و بیستن‌و ئاخافتن‌و بۆن کردن‌و ڕۆیشتن‌و بڕیاردان‌و هەستکردن‌و ... هەموو دەسەڵاتەکانی تری پێدا، چەندین چاودێری نادیاریشی بەسەرەوە دانا کە هەموو گەورەو بچوکێکی ژیانی ئەم ئادەمیزادەیان لە کات‌و شوێنی دیاریکراودا تۆمار دەکردو دەیانخستە سەر دیسکێکی وەبیرهێنانەوە لە شێوەی(فلاش میمۆری) کە بە کلێنچە ناسراوەو دوا بڕبڕەی ئادەمیزادەو گڵ توانای شیکردنەوەی ئەم کلێنچەیەی نیە، لەکاتێکدا کە هەموو جەستەی زیندەوەرەکان شی دەکاتەوە بۆ ئەو کەرەسە خاوانەی کە لێی دروستبوون، جا کە کاتە دیاریکراوەکەی ژیانی تەواوبوو، ئەوا جارێکیتر دەسەڵاتەکانیان لێ دەستێنێتەوەو دەیانمرێنێتەوە، تا لە دواڕۆژدا لە کلێنچەکەیانەوە جارێکیتر زیندوویان دەکاتەوە بۆ لێپرسینەوە، ئینجا ئەو کلێنچەیە بە هەموو ئەو زانیارییەی کە تێیدا کۆکراوەتەوە لەسەر ئەم ئادەمیزادە، پێویستە بە ئەمانەتەوە هەڵبگیرێت، بۆیە مردووەکە دەخرێتە گۆڕەوەو لەوێدا لاشەکەی لەبەر یەك هەڵدەوەشێتەوەو تەنها کلێنچەکەی لە کاردا دەمێنێت، ئەو کلێنچەیە توانای جوولەی نیە، توانای بینینی نیە، توانای ئاخافتنی نیە، بەڵام توانای بیستنی هەیە، بۆیە پێویستە لەسەرت کاتێك کە بەلای گۆڕستانێکدا تێدەپەڕیت بڵێیت: (سڵاوتان لێبێت ئەی موسوڵمان‌و خاوەنباوەڕی خەڵکی ئەم ئاواییە، بە پشتیوانی خوا ئێمەش بە ئێوە دەگەین)، ئینجا لەسەر ئەم بنەمایە چاڵێك هەڵدەکەندرێت، بەپێی سەردەمەکان، لەم سەردەمەی ئێستادا پانیەکەی نزیکەی(٨٠)هەشتا سانتیمەترو، درێژیەکەی نزیکەی(٢)مەترو قوڵیەکەشی نزیکەی(٢)مەتر دەبێت، لەناوەوەدا بە تەختە بەردی شاخەکان، یان بە پارچەی داڕێژراوی کۆنکریتی بە قوڵیەکی (٥٠) سانتیمەتری لەشێوەی سندوقێکدا ناوەوەی قەبرەکە ڕێك دەخرێت‌و تەرمەکەی دەخرێتە ناوەوە، سوننەتە ئەوکەسەی

مردووەكە دادەهێڵێتە ناو گۆڕەكەوە بڵێت: (بسم الله و من الله وعلی ملة رسول الله)، لە كاتی دانانی تەرمەكەدا سوننەتە كفنەكە لەسەر نێوچاوانی مردووەكە لابدرێت و كەسێك سێ چەنگ خۆڵ هەڵگرێت و بەسەر یەكەمیاندا بڵێت(مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ) ئینجا هەڵیداتە لای سەری مردووەكەوەو، چەنگی دووەم هەڵگرێت و بڵێت: (وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ)، ئەویش هەڵداتە هەمان شوێن، جەنگی سێیەمیش هەڵگرێت و بڵێت: (وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى) ئەویش هەڵداتە هەمان شوێن، هەروەها سوننەتە كەسێكی قورئان زان چەنگێك خۆڵ هەڵگرێت و حەوت جار سوورەتی(انا انزلناه في ليلة القدر)ی بەسەردا بخوێنێ و خۆڵەكە بكاتە سەر كفنەكە، پاشان بە هەمان تاشەبەرد سەری لاشەكە دادەپۆشرێت و گۆڕەكە پڕدەكرێتەوە لە خۆڵ، ئینجا دوو بەرد لەوسەرەو سەری قەبرەكەوە قیت دەكرێنەوە بە كێلەقەبر ناودەبرێن، ئینجا خۆڵەكە دەپەسترێتەوەو ئەوشێوەیە وەردەگرێت كە لە گۆڕستانەكاندا دەیبینین، ئینجا كەسێكی زانا دێت، پشت لە قیبلە دەكات و لای سەری مردووەكەوە دادەنیشێت و دەرسێكی مردووەكە دادەدات زیندووەكان كەڵكی لێ وەردەگرن، ئەو دەرسە پێی دەڵێن (تەلقین)، كە ئەو زانایە بە ناوی دایكیەوە بانگی مردووەكە دەكات و دەڵێت: (ئەی فلانی كوڕی فلان )(بۆ نێرینە)، یان(ئەی فلانی كچی فلان)(بۆ مێیینە)، ئەو پەیمانە بێنەوە بیری خۆت كە لە دنیادا لەسەری بوویت، ئەویش دان پێدانانە بە تاكوتەنهایی خواو نەبوونی هاوبەش و، دان پێدانانە بەوەی كە محەمەد ڕەوانەكراوی خوایە، ئەوەش بێنەوە بیری خۆت كە زیندووكردنەوەی ڕۆژی دوایی و بەهەشت و جەهەندەم حەق و ڕاستین، ئەوەش بێنەوە بیری خۆت كە كارەساتی دواكاتی بوونەوەر گومانی تێدا نیەو لە هاتن دایەو لە ڕۆژی دواییشدا خوا مردووەكان لە گۆڕەكانیان زیندوو دەكاتەوە، ئەوەش بێنەوە بیری خۆت، كە تۆ لە ژیانی دنیادا ڕەزامەندیت نواند بەوەی كە خوا پەروەردگارت بێت و ئیسلام ئایینت بێت و محەمەد(صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەرت

بێت‌و، قورئان پێشەوات بێت‌و کەعبە قیبلەت بێت‌و خاوەنباوەڕەکان خوشك‌و برات بن، پەروەردگاری من ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێك نیە تەنها ئەو نەبێت، پشتم بەو بەستووەو هەر ئەویشە خاوەنی عەرشی پیرۆز)، سوننەتە ئەمە سێ جار دووبارە بکرێتەوە، ئینجا دوای ئەم تەلقینە ئیمامەکە داوای پاڕانەوەی بۆ دەکات‌و دەڵێت: (ئەی خوایە زمانی جێگیرکە لەسەر وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی لەلایەن دوو فریشتەکانەوە لێی دەکرێن)، خەڵکەکەش بە ئامین وەڵامی دەدەنەوەو، ئیمام بە هەدیەکردنی سووڕەتێکی فاتیحە کۆتایی بە مەڕاسیمەکە دێنێت، سوننەتە خەڵکانێکی نزیکی مردووەکە چەند خولەکێك بەسەر گۆڕەکەوە بمێننەوەو پاشان بەجێی بهێڵن، قەبر دوا ماڵی قۆناغی ژیانی سەر زەویەو یەکەم ماڵی مردووەکەیە لە ماڵەکانی دوای ژیان، بۆیە ڕێز لە گۆڕەکان دەگیرێت‌و سەردانیان دەکرێت، ئەگەر دۆستێك سەردانی گۆڕی دۆستێکی خۆی کرد، ئەوە لای مردووەکە ئەم سەردانە زۆر پیرۆزترە لەدنیاو لەوەی لە دنیادایە، سەردانی گۆڕی پێغەمبەرەکانیش(سەلامی خوایان لێبێت) پیرۆزی خۆیان هەیەو، سەردانی گۆڕی پێغەمبەری ئیسلامیش(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، مزگێنییەکی خۆشی پێوەیە، بەوەی هەر کەسێك سەردانی گۆڕەکەی بکات، شایستەی ئەوە دەبێت کە بەر پاڕانەوەکانی بکەوێت، مردووەکان بە بەردەوامی چاویان لەوەوەیە کە زیندووەکانیان خێریان بۆ بکەن‌و بۆیان بنێرن، دروستە قورئان خوێندن‌و هەدیەکردنی سووڕەتی فاتیحە بۆ پێغەمبەرو کەس‌و کاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و بۆ مردووەکەو بۆ مردووی هەموو موسوڵمانەکان، هەریەکەیان خێری خۆی دەگاتێ، نابێت گۆڕەکان بکرێن بە ڕێبازو نابێت بە هەنگاونان بەسەریاندا بپەڕینەوە، نابێت گۆڕستانەکان بەرەڵا بکرێن‌و نابێت بهێڵرێت ئاژەڵەکان بەسەر گۆڕەکاندا بڕۆن، هەموو گریان‌و شین‌و لەخۆدانیش حەرامە، لەسەر گۆڕەکان بێت یان لەهەر شوێنێکی تر.

(پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك سەرەخۆشی لە کەسێك بکات کە تووشی کارەساتێك بووبێت، ئەوە پاداشتی ئەو سەرەخۆشیکەرە وەکو پاداشتی ئەوکەسە وایە کە کارەساتەکەی بەسەر هاتووە).(٨٨)

لەمەراسیمی ماتەمینی ماڵە مردوویەکدا، نابێت خواردن درووست بکرێت، بەلأم دەوروبەرو جیرانەکانیان، بۆیان هەیە خواردن دروست بکەن و بۆیان ببەن، شین و بابەڕۆو لەخۆدان بە بنبڕی قەدەغەیە، تازیەدانان و لەبەرکردنی جلی ڕەش، لە سێ ڕۆژ زیاتر حەرامە، مەگەر ژنێك لە ماتەمینی مێردەکەیدا، چوار مانگ و دەڕۆژان لە تازیەداریدا بمێنێتەوەو، خۆی نەڕازێنێتەوەو چاوەڕێ بکات بزانێت لەو ماوەیەدا هیچ شتێك لە منداڵدانیدا دروست بووە یان نا، جا ئەگەر دوای ئەو چوارمانگ و دە ڕۆژە، دەرکەوت ئەوئافرەتە دووگیان نیە، ئەوە مافی خۆیەتی و بۆی هەیە یەکسەر شوو بکاتەوە، ئەگەر ئافرەتەکەش نەچووبێتە لای مێردەکەی و نەگوازرابێتەوە، ئەوە فەرمانی خوایە دەبێت ئەو ئافرەتە چوار مانگ و دە ڕۆژەکە تازیەدار بێت.

## نوێژی فەرز لەکاتی ترسێکدا

وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ أَسْلِحَتَهُمْ ...(١٠٢ النساء)

﴿جا(ئـەی محەمـەد)، کـە تـۆ لەناویانـدا بـووی و نوێژەکـەت ئەنجامـدا، بـا دەستەیەکیان لەگەڵ تۆدا نوێژەکە دابەستێت و چەکەکانیشیان لەلابێت...﴾.

واتـە: جێبـەجێ کردنـی نوێـژ لـە کاتێکـدا کـە دەسـتەی موسـڵمانان مەترسـیان هەبێت لە هێرشی دووژمنەکانیان، ئەویش بە پێی هێزو ئاراستەی دوژمن بە چەند شێوەیەك دەبێت:

**یەکەم:** ئەگەر مەترسی دوژمن هەبوو لەوەی لە ئاراستەی قیبلەوە هێرش بکات، ئەوا ئیمام دەتوانێت خەڵکەکە بکات بە دوو بەشەوەو لەگەڵ هـەر بەشـەیاندا بـە جیا نوێژەکەی بکات، لە هەردووك جارەکاندا، بەشێك نوێژ دەکات و بەشێکیش پاسەوانە.

**دووەم:** ئەگـەر مەترسـی دوژمـن هـەبوو لـەوەی لـە ئاراسـتەی قیبلـەوە هێـرش بکـات، ئـەوا ئیمـام دەتوانێـت خەڵکەکـە بکـات بـە دوو ڕیـزەوە بەیەکـەوە نوێـژ دادەبەستن، کە گەیشتنە سوجدەی ڕکاتی یەکەم، ڕیزی پێشەوە لەگەڵ ئیمامدا دەچێتە سـوجدەوەو ڕیـزی دواوە بەوەسـتاوی دەمێننـەوە بـۆ پاسـەوانی کـردن، جـا کـە ئیمـام و ڕیـزی یەکـەم ڕاسـتبوونەوە بـۆ ڕکـاتی دووەم، ڕیزەکـەی دواوە دەچنە سوجدەی ڕکاتی یەکەمەوەو هەڵدەستنەوەو دەگەنـەوە بـە ئیمـام، کاتێك ئیمام دەچێتە سوجدەی ڕکاتی دووەمەوە، ئەمجارەیان ڕیزی پێشـەوە دەبـن بـە پاسـەوان و ڕیـزی دواوە لەگـەڵ ئیمـام دەچـنە سـوجدەوە، ئینجـا کـە ئیمـام و ڕیزەکەی سەریان لـە سـوجدە بـەرز کـردەوەو دانیشـتن بـۆ تـەحیات، ئـەوا ڕیـزی پاسـەوان دادێنـەوەو سـوجدەکەیان دەبـەن و تەحیاتەکـەیان دەخـوێنن و ئیمـام بوارێکیان دەداتێ و سەلام بە هەموویان دەداتەوە.

سێیەم: لە کاتێکدا دەکرێت ئاراستەی دوژمن لەگەڵ ئاراستەی قیبلەدا نەبێت، ئەوا ئیمام نوێژکەرەکان دەکات بە دوو پۆلەوە، لەگەڵ هەرپۆلەی بەشە نوێژێکی لەگەڵدا دەکات، بۆنموونە: ئیمام لەگەڵ بەشێکیان نوێژ دادەبەستێت، کە ئیمام ڕکاتی یەکەمی تەواو کرد، پۆلی یەکەم لەدڵی خۆیاندا نیەتی جیابوونەوە بێنن لە ئیمامو بە تەنها نوێژەکەیان تەواو بکەنو پاشان بچن بە پاسەوانی ئیمامو پۆلەکەی تر، پۆلی دووەمیش دێن لە پشتی ئیمامەوە نوێژەکەیان دادەبەستن، کاتێکیش ئیمام دادەنیشێت بۆ تەحیات ئەوان بەرز دەبنەوەو ڕکاتی دووەمیان تەواو دەکەنو ئیمامیش لە چاوەڕوانیادا دەبێت هەتا تەحیاتەکەیان دەخوێنن، پاشان ئیمام سەلامیان پێ دەداتەوە، واچاکە لە نوێژی مەغریبدا ئیمام دوو ڕکاعەت لەگەڵ پۆلێکیان بکاتو ڕکاتێکیش لەگەڵ پۆلەکەی ترو لە نوێژی بەیانیشدا هەر پۆلەی ڕکاتێكو لە نوێژە چواریەکانیشدا دەتوانرێت نوێژکەرەکان بکرێن بە دوو پۆل یان چوار پۆلەوە.

فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَاناً فَإِذَا أَمِنتُمْ فَاذْكُرُواْ اللّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ

(٢٣٩)البقرة

﴿جا لە کاتێکدا کە ترستان هەبوو(نەتانوێرا لە ترسی دوژمنەکان وەکو ئەو شێوەیەی سەرەوە نوێژەکانتان بکەن)، ئەوا بە پیادەیی یان بە سواری بیانکەن، جا کە دڵنیابوونەوە(لە مەترسی دوژمن)، ئەوا یادی خوا بکەنەوەو نوێژەکانتان بکەن، بەو شێوەیەی کە فێری کردن کە پێشتر ئێوە نەتان دەزانین﴾.

چوارەم: ئەگەر شەڕ دەستی پێکردو پرژانە ناو یەکتریەوە، لەم بارەدا چۆن بگونجێت نوێژکردنەکە دروستەو ڕووکردنە قیبلەی ناوێتو بۆیان هەیە لە کاتی ڕکوعو کڕنوشەکاندا شیرو ڕمبەکانیان بوەشێنن، ئەم جۆرە نوێژکردنە قەزاکردنەوەشی ناوێت.

## نوێژی کەسێك کە نەخۆش بێت

**بڕگەی یەکەم:** ئەگەر کەسێك نەخۆش بوو نەیتوانی بەپێوە نوێژەکانی بکات، ئەوا دەتوانێت بە دانیشتنەوە بیکات، بە کۆمەڵ یان بە تاك.

**بڕگەی دووەم:** ئەگەر کەسێکی نەخۆش نەیتوانی بە دانیشتنەوە نوێژەکەی بکات، ئەوە دەتوانێت بە پاڵکەوتوویی بیکات.

**بڕگەی سێیەم:** ئەگەر بە دانیشتنیشەوە نەیتوانی بە تەواوی سوجدە بەرێت، ئەوا دەتوانێت سەرینێك دابنێت و سوجدەی لەسەر بەرێت.

**بڕگەی چوارەم:** ئەگەر هەر نەشیتوانی، ئەوا ملی ڕێك ڕادەگرێت و ڕوو لە قیبلە دەکات و لە شوێنەکەی خۆیەوە نوێژەکە دەکات.

**بڕگەی پێنجەم:** دەتوانێت لە ماوەی نەخۆشیەکەدا نوێژەکانی کۆ بکاتەوە، بەڵام ناتوانێت کورتیان بکاتەوە.

**بڕگەی شەشەم:** نوێژی هەینی لەماوەی نەخۆشکەوتنندا لەسەر نەخۆشەکە پێویست نابێت.

## سوجدەی سەهوو

ئەم سوجدەیە دوو جار سوجدە بردنە وەکو سوجدە بردنەکانی ناو نوێژ، دوای تەحیاتی دووەم پێش سەلامدانەوە جێبەجێ دەکرێن، ئەم سوجدەیە پارسەنگە بۆ هەڵەیەك کە لە نوێژدا دەکرێت، یان لە بیردەکرێت کە جێبەجێ بکرێت، وەکو خوێندنی(فاتحە)، یان لەبیرچوونی دانیشتن بۆ خوێندنی تەحیاتی یەکەم، یان لەبیرچونی یەکێك لە سوجدەکان یان رکوعەکان، جا ئەگەر هاتوو هەڵەیەك کراو ئیمام زۆر بە زوویی هەستی بەخۆی کرد، یان یەکێك لە موسوڵمانەکان بە(سبحان الله) کردنێك ئیمامی ئاگادار کردەوەو، ئیمامیش یەکسەر گەڕایەوە بۆ شوێنی هەڵەکە یان شوێنی لەبیرچوونەکە، ئەوە سوجدەی سەهوی ناوێت، بۆنموونە: ئیمام لە نوێژەکەدا بیری بێتەوە کە نیەتی نەهێناوە، ئەوە یەکسەر دەگەڕێتەوە سەرەتای نوێژەکەو نیەت دەهێنێت و سەرلەنوێ نوێژەکەی دەست

پێدەکاتەوەو ئەوەی پێشتر کردوویەتی حساب ناکرێت‌و بەردەوام دەبێت تا سەلام دەداتەوەو پێویست بە سوجدەی سەهوو ناکات، یان وەکو ئەوەی لە کۆتایی نوێژەکەدا لەبیری نەبێت سەلام بداتەوە، یەکسەر هەستێت‌و بڕوات، ئەوە کە بیری کەوتەوە یان بەبیری هێنرایەوە یەکسەر دەگەڕێتەوە ناو نوێژەکەو سەلام دەداتەوەو پێویست بە سوجدەی سەهووش ناکات، بەڵام ئەگەر لە ڕکاتی دووەمدا لەدوای سوجدەکان لەبیری نەبێت دانیشێت بۆ تەحیاتی یەکەم‌و یەکسەر هەستایەوە دەستی بە ڕکاتی سێیەم کرد، ئەگەر لەوێدا خۆی بەبیری بێتەوە یان لەلایەن موسوڵمانێکەوە ئاگادار بکرێتەوە، ئەوە تازە ناگەڕێتەوە سەر ئەو تەحیاتەو بەردەوام دەبێت لەسەر نوێژەکەی، بەڵام پێش سەلام دانەوە دوو سوجدەی سەهوو دەبات لەبری ئەو هەڵەیەی کە کردوویەتی، ئینجا نوێژکەرەکان پەیڕەوی ئیمامەکەیان دەکەن ئەگەر سوجدەکانی سەهوی برد ئەوانیش لەگەڵیدا سوجدەکان دەبەن، بەڵام لەکاتی کۆتایی نوێژەکەدا ئەگەر ئیمام هەڵەیەکی کردوو هەستایەوە بۆ ئەنجامدانی ڕکاتێکی تر، ئەوە گونجاونییە موسوڵمانەکان شوێنی کەون، بەڵکو بە(سبحان الله)یەك ئاگادار دەکرێتەوە، ئەگەر نەگەڕایەوە، ئەوە موسوڵمانەکان پێویستیان بە نیەت هێنانی جیابوونەوە نیە لەئیمام، بەڵکو خۆیان ڕاستەخۆ سەلام دەدەنەوەو نوێژەکەیان تەواو دەکەن، ئەو شتانەی کە کردنیان نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە، بە سوجدەی سەهو چارەسەر ناکرێن، سوجدەی سەهوش پارسەنگی (الله اکبر)ی سەرەتای نوێژ دابەستن ناکات.

هەڵەکردن لە خوێندنەوەی قورئاندا لە نوێژدا نابێتە هۆی بردنی سوجدەی سەهوو، بەڵکو کەسێکی شارەزا لە نوێژکەرەکان ئەگەر هەستی بە هەڵەیەك کرد، بە دەنگێکی بەرز هەڵەکە ڕاست دەکاتەوە، ئیمامیش دەگەڕێتەوە ئەو شوێنەو، بەڕاستی‌و دروستی بۆ جاری دووەم دەیخوێنێتەوە.

ئەگەر ئیمام لە نوێژی مەغریبدا ڕكاتی یەكەمی تەواوكردو هەستایەوە بۆ ڕكاتی دووەمو یەكسەر دەستی كرد بە قورئان خوێندن و لەبیری نەبوو فاتیحە بخوێنێت و ویستی دابێتەوە بۆ ركوع، لەوكاتەدا نوێژكەرێك (سبحان الله)یەكی كرد، ئەوا ئیمامەكە دەگەڕێتەوە باری ڕاوەستاوی سەرەتای ڕكاتی دووەم، جا ئەگەر بەبیری هاتەوە كە فاتیحەی لەبیر چووە، ئەوە لە فاتیحەوە دەست پێدەكاتەوە، ئەگەر بەبیری نەهاتەوە چی لەبیر چووە، ئەوا ئەو نوێژكەرەی كە (سبحان الله)كەی كردووە بە دەنگێكی نیمچە بەرز دەڵێت: (بسم الله الرحمن الرحیم، الحمد لله رب العالمین...) جا كە ئیمام بیری كەوتەوە، نوێژكەرەكە بێدەنگ دەبێت و ئیمامیش لە سەرەتاوە فاتیحەكە دەخوێنێت و بەردەوام دەبێت و نوێژەكەی تەواو دەكات و بەبێ سوجدەی سەهوو سەلام دەداتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو، لەدوای سوجدەكانی ڕكاتی دووەم ئیمام دانەنیشت بۆ تەحیاتی یەكەم و یەكسەر هەستایەوە بۆ ڕكاتی سێیەم، جا ئەگەر لە سەرەتای هەستانەوەكەیدا كە ئێستا نەكەوتۆتە سەر قاچەكانی هەستی بە هەڵەكە كرد، ئەوە بۆی هەیە بگەڕێتەوە شوێنی خۆی و سوجدەی سەهووشی ناوێت، بەڵام ئەگەر هاتوو تەواو ڕاست ببۆوە ئەوە بۆی نیە جارێكیتر بگەڕێتەوە، هەرچەند كەسێكیش(سبحان الله)ی بۆ بكات، لەوكاتەدا ئیمام نوێژەكەی تەواو دەكات و پێش سەلام دانەوە دوو سوجدەی سەهوو دەبات، دەبێت نوێژكەرەكانیش پەیڕەوی ئیمامەكەیان بكەن.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ئەگەر لە ڕكاتی دووەمدا ئیمام لەبیری كرد تەحیات بخوێنێت و ویستی هەستێتەوە، ئەگەر پێش ئەوەی هەستێتە سەرپێیان بیری كەوتەوە، با دانیشێتەوەو نوێژەكەی تەواو بكات، بەڵام ئەگەر وابوو تەواو هەستابۆوە، ئەوە نابێت بگەڕێتەوەو، لە كۆتایی نوێژەكەیدا دوو سوجدەی سەهوو دەبات).(٨٩).

مرۆڤ لەكاتی سوجدە بردندا لە هەموو كاتەكانی تر لە خواوە نزیكترە.

(ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێبێت)، دەڵێت: پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: بەندە لە کاتی سوجدە بردندا لە هەموو کاتەکانی تر لە پەروەردگارەکەیەوە نزیکترە، جا(ئێوەش) لەکاتی سوجدە بردندا زۆر بپاڕێنەوە).(٨٩ب)

سوجدە بردن لە کاتی خوێندنەوەی ئەوئایەتانەی باسی سوجدە بردن دەکەن:

لە قورئانی پیرۆزدا لە(١٤) شوێندا ئەم سوجدە بردنانە ناویان هاتووە:

یەکەم: سوورەتی العلق

كَلا لا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ (١٩)

﴿نەخێر، گوێڕایەڵی ئەو کەسە مەبەو، کڕنووش بۆ پەروەردگاری خۆشت بەرەو لێی نزیك بەوە﴾.

دووەم: سوورەتی الانشقاق

وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لا يَسْجُدُونَ (٢١)

﴿کاتێکیش قورئانیان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، کڕنووش بۆ پەروەردگاریان نابەن﴾.

سێیەم: سوورتی النجم

فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا (٦٢)

﴿جا(مادام پێدەکەنن و ناگرین و بێ ئاگان، هەتا زووە) کڕنووش بۆ پەروەردگارتان بەرن و بیپەرستن﴾.

چوارەم: سوورەتی فصلت

فَإِنِ اسْتَكْبَرُوا فَالَّذِينَ عِنْدَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُمْ لا يَسْأَمُونَ (٣٨)

﴿ئەگەر (بێباوەڕەکانیش) خۆیان بە گەورەزانی (لە پەرستنی پەروەردگاردا)، ئەوا ئەو فریشتانەی کە لای پەروەردگاری تۆن، بە شەوو ڕۆژ، پاك و بێخەوشی بۆ دەردەبڕن و، بێزاریش نابن﴾.

پێنجەم: سوورەتی الم السجدە

إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِهَا خَرُّوا سُجَّدًا وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لا يَسْتَكْبِرُونَ(١٥)

﴿بەڕاستی ئەوانەی کاتێك بەڵگەونیشاکانی ئێمەیان بیر دەهێنرێتەوە باوەڕیان پێ دەهێنن و بە خاکدا دەکەون و کڕنووش دەبەن و بە سوپاس و ستایش کردن پاك و بێخەوشی بۆ خوا دەردەبڕن و خۆشیان بە گەورە نازانن﴾.

**شەشەم: سوورەتی النمل**

اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ (٢٦)

﴿خوا ئەو پەرستراوەیە هیچ پەرستراوەێکی تر نیە تەنها ئەو نەبێت، خاوەنی عەرشی پیرۆزە﴾.

**حەوتەم: سوورەتی الفرقان**

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اسْجُدُوا لِلرَّحْمَنِ قَالُوا وَمَاالرَّحْمَنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا(٦٠)

﴿ئەگەر بەو بێباوەڕانەش گوترا: کڕنووش بۆ (الرحمن) بەرن، ئەوا لە وەڵامدا دەڵێن: الرحمن کێیە؟ ئایا ئێمە کڕنووش بەرین بۆ ئەوکەسەی کە تۆ فەرمانمان پێدەکەیت کڕنووشی بۆ بەرین؟ ئەم داوا لێکردنەش وای لێکردن کە ئەوەندەی تر دوور بکەونەوە﴾.

**هەشتەم: سوورەتی مریم**

.....إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَنِ خَرُّوا سُجَّدًا وَبُكِيًّا(٥٨)

﴿ئەوانە ئەو پێغەمبەرانەن کە خوا نازونیعمەتی خۆی بەسەردا ڕشتوون لە نەوەکانی ئادەم و لەوانەی لەگەڵ نووح(لە کەشتیەکەدا) هەڵمانگرتن و لە نەوەکانی ئیبراهیم و لە نەوەکانی یەعقوب، لەوانەی کە ڕێگەی ڕەوشەنی خۆمان نیشاندان و هەڵمان بژاردن، کاتێك کە بەڵگەو نیشانەکانی(الرحمن)یان بەسەردا بخوێنرێتەوە بە کڕنووش بردن و گریانەوە خۆیان بە زەویدا دەدەن﴾.

**نۆیەم: سوورەتی الاسراء**

وَيَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعاً (١٠٩)

﴿بەســەر دەمو چــەنەگەیاندا خــۆ لــە زەوی دەدەنو دەگریەنو(فرمێســکیش دەڕێژن)، خوێندنەوەی ئەم قورئانەش بەسەریاندا وایان لیٚ دەکات کە زیاتر بۆ خوا ملکەچ بن﴾.

**دەیەم: سوورەتی النحل**

يَخَافُونَ رَبَّهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ (٥٠)

﴿لــە ســەروی خۆشــیانەوە لــە پــەروەردگاری خۆیــان دەترســێنو، ئــەوەی فەرمانیشیان پیٚ بکرێت جێبەجێی دەکەن﴾.

**یازدە: سوورەتی الرعد**

وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعاً وَكَرْهاً وَظِلالُهُمْ بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ (١٥)

﴿هـەموو ئەوانـەش کـە لـە ئاسمانـەکانو زەویـدانو سێبەرەکانیشـیان لـە کـاتی بەیانیانو ئێوارانـدا پێیـان خۆشـبێت یـان پێیـان ناخۆشـبێت کڕنـووش بـۆ خـوا دەبەن﴾.

**دوازدە: سوورەتی الاعراف**

إِنَّ الَّذِينَ عِنْدَ رَبِّكَ لا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَيُسَبِّحُونَهُ وَلَهُ يَسْجُدُونَ (٢٠٦)

﴿بەڕاسـتی ئـەو فریشـتانەی لای پـەروەردگارتن لـە پەرسـتنی پـەروەردگاریان خۆیان بەگەورە نازاننو پاكو بێگەردیی بۆ دەردەبڕنو کڕنووشی بۆ دەبەن﴾.

**سێزدە: سوورەتی الحج**

أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ وَمَنْ يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ (١٨)

﴿ئایا ئەوە نابینی هەرچی لە ئاسمانەکانو هەرچی لە زەویدایەو ڕۆژو مانگو ئەستێرەکانو چیاکانو دارو درەختەکانو جوولـەدارەکانو زۆرینەیەکیش لـە خـەڵکی کڕنـووش بـۆ خـوا دەبـەن؟ زۆرینەیەکیشـیان سـزای خوایـان بەسـەردا

سەپێنراوەو، هەر کەسێکیش خوا سوك و ڕیسوای بکات، کەس ناتوانێت ڕێزداری بکات، بە ڕاستی خوا ئەوەی بیەوێت دەیکات﴾.

**چواردە: سوورەتی الحج**

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ(٧٧)

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بە چۆکدا وەرن و کڕنووش بەرن و پەروەردگارتان بپەرستن و خێرو چاکەش بکەن بەو هیوایەی سەرفرازو سەرکەوتوو دەبن﴾.

سوجدەیەك هەیە لە سوورەتی (ص)دا، ئەوە سوجدەی خوێندنەوە نیە بەڵکو سوجدەی شوکرانەیە بۆ خوا، ئەوکەسەی کە قورئانەکە دەخوێنێ ئەگەر گەیشتە ئەو شوێنەی کە ناوی سوجدەکەی تێدایە، ئەوا لەوێ قورئان خوێندنەکە ڕادەگرێت و سوجدەیەك دەبات وەکو سوجدەی نوێژو سەلام دەداتەوە، لەم بارەدا ئەو کەسەش کە گوێی لە قورئان خوێندنەکەیە، ئەویش دەتوانێت نیەتی ئەو سوجدەبردنە بێنێت و لە جێگەی خۆیەوە ڕوو بکاتە قیبلەو (الله اکبر) بکات و بچێتە سوجدەوەو پاشان (الله اکبر)بکات و سەری ڕاست بکاتەوەو سەلام بداتەوە، ئەگەر ئیمام لە نوێژەکەیدا قورئانی خوێندو گەیشتە ئەوشوێنەو بۆ سوجدە بردن داهاتەوە، واپێویست دەکات هەموو ئەو خاوەنباوەڕانەی لەدوای ئەوئیمامەوە نوێژەکانیان دابەستوون، هەموویان پەیڕەوی ئیمامەکەی خۆیان بکەن و، ئەوانیش سوجدەکە بەرن و، نیەت هێنانیشی ناوێت، لەبەرئەوەی سوجدە بردن و قورئان خوێندنەکەش خۆیان بەشێکن لە نوێژەکە، لەم بارەدا هەر کەسێك پەیڕەوی ئیمامەکە نەکات نوێژەکەی بەتاڵ دەبێت، بۆنموونە: ئەگەر لەبارێکی ئاوەهادا ئیمام سوجدەکەی نەبردو یەکێك لە نوێژکەرەکان سوجدەکەی برد، ئەوا ئەو کەسە نوێژەکەی لەگەڵ ئەو ئیمامەدا دەپچڕێت، ئەوەی لە سوجدەی نوێژدا فەرزە لەم سوجدەیەشدا فەرزە، لە نوێژدا بێت یان لەدەرەوەی نوێژ، سوننەتە لەم سوجدە

بردنەدا بڵێیت: (سجد وجهي للذي خلقه وصوره وشق سمعه و بصره بحوله وقوته، فتبارك الله احسن الخالقين)، گونجاویشه دوای ئەوە بێدەنگ بیت، یان به شێوەیەکی باشتر یادی خوا بکەیت، ئەم سوجدەیە لە دەرەوەی نوێژیشدا، ئەگەر ئەو کەسە خۆی قورئانەکە بخوێنێت، یان وەکو گوێگرێك گوێی گرتبێت، پێویستی به دەستنوێژ هەیە.

## سوجدەی شوکرانە

وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ (٧)ابراهيم

﴿(ئەوەش بێننەوەبیری خۆتان)، کاتێك کە پەروەردگارتان ڕایگەیاند: ئەگەر بێت و سوپاسی من بکەن، ئەوا نازونیعمەتەکانی خۆمتان بۆ زیاد دەکەم، ئەگەر بێباوەڕیش بوون، ئەوا به ڕاستی سزای من توندو تیژه﴾.

مەبەست لەم سوجدە بردنە، سوپاسکردنی خوایە لەلایەن بەندەکەیەوە، ئەم سوجدەیە لەنوێژدا نابرێت، بەڵکو لە دەرەوەی نوێژدا دەکرێت لە هەموو کاتێك و لە هەموو شوێنێکی پاکدا، دەتوانیت وێردەکانی ناو سوجدەی نوێژ بڵێیت، هەروەها دەتوانیت، ئەوەی ناو سوجدەی خوێندنەوەی قورئان بڵێیت، هەروەها دەتوانیت هەموو ئەو شتە چاکانە بڵێیت کە ڕێزو سوپاس و ستایشن بۆ خواو بەندەیی و ملکەچین بۆ بەندەکەی، ڕوو دەکرێتە قیبلەو بە نیەت هێنانێك دەست پێدەکات و دەڵێ: (نیەتم وایە سوجدەیەکی شوکرانە دەبەم بۆ خوای خۆم، الله اکبر، سوجدەکە دەبەیت و بە(الله اکبر)ێك سەرت بەرز دەکەیتەوەو سەلام دەدەیتەوەو چەندی بۆت دەکرێت دەپاڕێیتەوە).

## کورت کردنەوەی نوێژ

وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُواْ لَكُمْ عَدُوّاً مُّبِيناً (١٠١)النساء

﴿ئەگەر بەسەر زەویشدا ڕۆیشتن، مەترسی ئەوەتان هەبوو بێباوەڕەکان لە کاتی نوێژکردن تووشی ئاژاوەیەکتان بکەن، ئەوا تاوانتان لەسەر نییە نوێژەکانتان کورت بکەنەوە، بەڕاستی بێباوەڕەکان دوژمنێکی ئاشکران بۆئێوە﴾.

مەبەست لە کورت کردنەوەی نوێژە فەرزەکانە، بەخشینێکە لەلایەن خواوە بۆ بەندەکانی، بۆئەوەی لەکاتی سەفەر کردندا بەهۆی نوێژەکانەوە تووشی نارەحەتی نەبن، ئەم کورتکردنەوەیەش بۆ نوێژە چوار ڕکاتیەکانە، مەرجێك هەیە بۆ گەیشتن بە ئامانجێك، مەرجەکە ئەوەیە: دەبێت مرۆڤ بکەوێتە سەفەرەوە ئینجا دەگات بە ئامانجێك کە مافی کورتکردنەوەی نوێژە چوار ڕکاتیەکانی دەبێت، بۆیە لە کاتی سەفەردا نوێژی فەوتاوی ناو ماڵەکان ناتوانرێت بە کورتکراوەی بگێڕدرێنەوە، بەڵام نوێژی فەوتاوی سەفەرەکانی پێشتر دەتوانرێت لەم سەفەرەدا بە کورتکراوەیی بگێردرێنەوە، جا کاتێك کە مرۆڤ نیەتی سەفەری هێناو، ئەگەر مەیلی لێبوو دوو ڕکات نوێژی سوننەتی سەفەر بکاتو ئینجا لە شارەکەی بڕواتە دەرەوە، دەبێت لە سەفەرەکەیدا ئەم مەرجانەی خوارەوە بێنەدی، ئەوسا مافی کورتکردنەوەو کۆکردنەوەی نوێژەکانی دەبێت:

**یەکەم:** دەبێت سەفەرەکە لە(١٦) فەرسەخ، یان لە(٤٨)میلی هاشمی یان لە دوو قۆناغ ڕێگە کەمتر نەبێت، کە دەکاتە: (٨٨,٧٠٤ کیلو متر).

(ویعادل الفرسخ الواحد (٥٥٤٤مترا)، فعلى هذا تكون أقل مسافة القصر (١٦ فرسخا) = (٨٨,٧٠٤ كيلو مترا)

**دووەم:** دەبێت سەفەرەکە بۆ مەبەستێکی حەڵاڵ بێت، وەکو بازرگانیو چوون بۆ فێربوونی زانستو سەردانی خەڵکانێکی ناسیاو، ئەوە بۆیان ڕەوا دەبێت نوێژەکانیان کورتو کۆ بکەنەوە، ئەگینا ئەگەر بۆ ئارەزووبازیو کەیفو سەفا بێت، ئەوا ئەو مافەیان نادرێتێ.

**سێیەم:** کە لە سنووری شارەکەت چوویتە دەرەوە، مافی ئەوەت هەیە نوێژەکان کورت بکەیتەوە، پێویستیت بە بڕینی (١٦)فەرسەخەکە نیە، ئەگەر واڕێککەوت هۆکاری گواستنەوەکە لە کاتی نوێژی نیوەڕۆدا ڕانەوەستا، ئەوا پێش ئەوەی کاتی نوێژەکە بەسەربچێت پێویستە نوێژکەکەرەکە بە دڵ نیەتی ئەوە بێنێت کە نوێژی نیوەڕۆ دەخاتە پاڵ نوێژی عەسر، جا کە کاتی نوێژی عەسر هات، ئەوا دەتوانێت نوێژەکە بە کوتکراوەیی لەگەڵ کورتکراوەی نوێژی عەسردا کۆ بکرێتەوە، لەم بارەشدا دوو ڕکاتەکەی نیوەڕۆ دەکرێت ئینجا بەدوایدا دوو ڕکاتەکەی عەسر دەکرێت، بە پێچەوانەشەوە هەر دروستە، لەبەرئەوەی کاتی ئەنجامدانی هەردووك نوێژەکە هاتووە.

**چوارەم:** پێویستە نوێژکەرەکە لەسەرەتای نوێژەکانیدا نیەتی کورتکردنەوە بهێنێت، بۆنموونە: لە نوێژی نیوەڕۆدا هەر کە دەستنوێژی هەڵگرتو ڕووی کردە قیبلە، دەڵێت: نیەتم وایە دوو ڕکات نوێژی نیوەڕۆ دەکەم بە کورتکراوەیی بۆ خوای گەورە(الله اكبر)، ئینجا دوو ڕکاتەکە تەواو بکاتو سەلام بداتەوە.

**پێنجەم:** ئەگەر نوێژکەرێك ویستی نوێژەکەی بە کورتکراوەیی بە جەماعەت بکات، ئەوا دەبێت ئیمامەکەشی لە سەفەر دابێت، نوێژ لەدوای ئیمامی نیشتەجێوە کورت ناکرێتەوە.

**شەشەم:** بۆ کورتکردنەوەی نوێژ نابێت نوێژکەر بە هیچ شێوەیەك نوێژ لەدوای ئیمامێکەوە دابەستێت کە نەزانێت ئەو ئیمامە نوێژ کورت دەکاتەوە یان نا،

نوێژکەر لە سەفەریشدا دەتوانێت نوێژەکانی بە جەماعەت لەدوای ئیمامێکەوە بکات بە کورت نەکراوەیی.

حەوتەم: نوێژێك کە نیەتی کورتکراوەی لێ هێنرابێت و لە نوێژەکەدا نوێژکەرەکە بڕیاری ئەوە بدات نوێژەکەی بە چوار ڕکاتی بکات، یان دوو دڵبێت لەوەی کە ئاخۆ سەفەرەکەی تەواو بووەو گەیشتۆتەوە شارەکەی خۆی یا نا، ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، ئەو ڕکاتانەی کە کردونی بۆی حیسابەو دەبێ بەدوایاندا نوێژەکەی تەواو بکات وەکو نوێژێکی ئاسایی.

هەشتەم: پێویستە نوێژکەرەکە شارەزابێت لە ئەنجامی کورتکردنەوەی نوێژدا، ئەگەر کەسێك شارەزا نەبێت نوێژ کورت بکاتەوە، ئەوا نوێژەکەی دانامەزرێت.

هەموو کەسێکی نوێژکەر بێجگە لەو ڕۆژەی کە سەفەرەکە دەکات و بێجگە لەو ڕۆژەش کە دەگەڕێتەوە، بۆی هەیە ماوەی(١٩)ڕۆژ بە بەردەوامی نوێژەکانی کورت بکاتەوە، جا کەسێك کە ماوەیەکی زیاتر مایەوە، ئەوا وەکو نیشتەجێی ئەو شوێنە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت هەتا ئەو ڕۆژەی دەگەڕێتەوە.

(ئیبن عەباس (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە لە شوێنێك دەمایەوە، (١٩)ڕۆژان نوێژەکانی دوو ڕکات دوو ڕکات دەکردن، ئێمەش ئەگەر (١٩)ڕۆژان ماباینەوە نوێژەکانمان دوو ڕکات دەکردن، ئەگەر زیاتریش ماباینەوە، ئەوا نوێژەکانمان چوار ڕکات دەکرد). (٩٠)

ئەکەر کەسێك نیەتی مانەوەی چوار ڕۆژی هێنا لە جێگایەك، ئەوا بە گەیشتنی بەو شوێنە سەفەرەکەی کۆتایی دێت.

نۆیەم:

دەبێت بزانرێت سەفەرەکە بەرەو کوێیەو وڵاتێکی دیاریکراو دەستنیشان کرابێت و بزانرێت دوایین شوێن کوێیە کە بۆی دەچیت، واتە: کاتێك بەدوای هەڵاتوویەك دەکەویت، ئەگەر (١٦)فەرسەخیشت زیاتر بڕیت، ئەوە ناتوانیت نوێژەکانت کورت بکەیتەوە.

## کورتکردنەوەو کۆکردنەوەی نوێژ

**بڕگەی یەکەم:**

ئەو کەسەی سەفەر دەکات سەرەتا نیەتی سەفەر کردن بێنێت و دوو ڕکات نوێژی سەفەر کردن ئەنجام بدات، ئینجا دەست بە سەفەرەکەی بکات.

**بڕگەی دووەم:**

کۆکردنەوەی نوێژەکان.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ئەگەر لە ڕۆیشتنەکەیدا پەلەی بایە، ئەوا نوێژی مەغریب و عیشای کۆ دەکردەوە). (٩١)

دەکرێت لە کاتی سەفەردا دوو نوێژی دوای یەك کۆ بکرێنەوە، بۆنموونە: لەکاتی سەفەردا دەکرێت نوێژی نیوەڕۆ لەگەڵ نوێژی عەسردا جووت بکرێن، ئینجا ئەگەر تەنها کۆ کردنەوەی نوێژەکان بێت، ئەوا بەم شێوەیە دەبێت:

یەکەم: نوێژی نیوەڕۆ عەسر

تۆ کە لە سەفەر دابوویت سەرنج دەدەیت کە کاتی نیوەڕۆ سەرقاڵ نیت و کاتی عەسر بوارت نابێت نوێژەکەت ئەنجام بدەیت، ئەوا لەم کاتەدا، دەکرێت نوێژی عەسر بێنیتە گەڵ نیوەڕۆو سەرەتا نیەتی نوێژی نیوەرۆ بێنیت و بڵێیت: (نیەتم وایە چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆ دەکەم بە کۆکراوەیی، بۆ خوای گەورە (الله اکبر))، جا کە سەلامت دایەوە یەکسەر هەستەوەو نیەتی نوێژی عەسر بێنەوەو بڵێ: (نیەتم وایە چوار ڕکات نوێژی عەسر دەهێنمە پێش بە کۆکراوەیی لەگەڵ نوێژی نیوەڕۆدا فەرزە لەسەر من بۆ خوای گەورە (الله اکبر))، ئینجا نوێژەکەت تەواو دەکەیت.

جا کاتێك کە زانیت کاتی نوێژی نیوەڕۆیەو بەڵام سەرقاڵیت و ناتوانیت نوێژەکەت ئەنجام بدەیت، یان لە ڕێگەدایت و لە هاوڕێکانت دوادەکەویت، ئەوا دەتوانیت نوێژی نیوەڕۆ بنێریتە پاڵ نوێژی عەسر، هەرئەوەندە لە کاتی نوێژەکەدا دەبێت بڵێیت: (ئەوە نوێژی نیوەڕۆم بردە پاڵ نوێژی عەسر)، جا کە

بانگی عەسریدا، سەرەتا نیەتی نوێژی نیوەڕۆ دێنیت‌و دەڵێیت: (نیەتم وایە چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆ بە هەڵگیراوی دەهێنمە پاڵ نوێژی عەسر، فەڕزە لەسەر من بۆ خوای گەورە(الله اكبر))، جا کە نوێژی نیوەڕۆت تەواوکرد یەکسەر هەڵدەستیتەوەو دەڵێیت: (نیەتم وایە چوار ڕکات نوێژی عەسر دەکەم، فەڕزە لەسەرمن بۆ خوای گەورە(الله اكبر))، چوار ڕکات نوێژەکەت تەواو دەکەیت‌و سەلام دەدەیتەوە.

دووەم: نوێژی مەغریب‌و عیشا.

لە نێوان نوێژی مەغریب‌و عیشادا بەپێی کاتەکەی خۆت لە سەفەرەکەتدا، دەتوانیت پاش‌وپێش بە نوێژەکان بکەیت، بۆنموونە: دەتوانرێت نوێژی عیشا پێش بخرێت‌و بهێنرێتە دوای مەغریب، لەم بارەدا دوای بانگی مەغریب نیەتی نوێژی مەغریب دەهێنیت‌و دەڵێیت: (نیەتم وایە سێ ڕکات نوێژی مەغریب دەکەم، فەڕزە لەسەر من بۆ خوای گەورە(الله اكبر))، ئینجا کە نوێژەکەت تەواو کرد، یەکسەر هەڵدەستیتەوەو دەڵێیت: (نیەتم وایە چوار ڕکات نوێژی عیشا دەهێنمە پێش بە کۆکراوەیی لەگەڵ نوێژی مەغریبدا ئەنجامی دەدەم، فەڕزە لەسەر من بۆ خوای گەورە(الله اكبر))، جا نوێژەکەت تەواو دەکەیت‌و سەلام دەدەیتەوە.

ئەمە لەبارێکدایە تەنها کۆکردنەوەیە، بۆ سەفەریش ئەنجام دەدرێت بۆ هەندێك باری تایبەتی نیشتەجێکانیش ئەنجام دەدرێت، بۆنموونە: ئەگەر لە شارێکدا کاتی نوێژی نیوەڕۆ بەفرو باران‌و تۆف بوو، ئەوا ئیمامەکە دەتوانێت نوێژی عەسریان بۆ بێنێتە پێش لەگەڵ نوێژی نیوەڕۆدا ئەنجامی بدات، یان نوێژی عیشایان بۆ بێنێتە پێش لەگەڵ مەغریبدا ئەنجامی بدات، بەو شێوەیەی کە لەسەرەوە باسکرا، ئەویش بە مەرجێك دەبێت ئیمامەکە بۆخۆی یان نێردراوێکی خۆی دوای نوێژە یەکەمەکەیان بێتەدەرەوەو دڵنیابێت لەوەی باوبارانەکە بەردەوامە یان نا، ئەگەر بارانەکە بەردەوام بوو، ئەوا کۆکردنەوەکە

ئەنجام دەدرێت، هەروەها بۆ نەخۆشێکیش کە پزیشکێکی باوەڕپێکراو بڕیاری بۆ دابێت دەتوانێت نوێژەکان کۆ بکاتەوە، بەڵام ناتوانێت کورتیان بکاتەوە.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نوێژی نیوەڕۆو عەسری بە یەکەوە کرد، مەغریب و عیشاشی بە یەکەوە کرد، بەبێ ئەوەی لە سەفەردا بێت یان هیچ مەترسیەکی هەبێت). (٩٢)

**بڕگەی سێیەم:**

کورتکردنەوەو کۆکردنەوە.

لە کاتێکدا تۆ لە سەفەرێکی خێریت، وا پێویست دەکات نوێژەکان کورتیش بکەیتەوە کۆشیان بکەیتەوە، وەکو باری حاجیەکان لە نیوەڕۆی عەرەفەوە بۆ بەربەیانی جەژن، دەتوانیت، نیوەڕۆ کورت بکەیتەوەو بیکەیت بە دوو ڕکات و بەم شێوەیە نیەتەکەی بێنیت و بڵێیت: (نیەتم وایە دوو ڕکات نوێژی نیوەڕۆ دەکەم بە کورتکراوەیی لەگەڵ نوێژی عەسردا، فەرزە لەسەر من بۆ خوای گەورە(الله اکبر))، ئینجا دوو ڕکاتەکە تەواو دەکەیت و هەڵدەستیتەوەو دەڵێیت: (نیەتم وایە دوو ڕکات نوێژی عەسر بە کورتکراوەیی و بە کۆکراوەیی دەهێنمە گەڵ نوێژی نیوەڕۆ، فەرزە لەسەر من بۆ خوای گەورە(الله اکبر))، ئینجا دوو ڕکات نوێژەکەت تەواو دەکەیت، یان لە شوێنێکدا واپێویست دەکات نوێژی عیشا بە کورتکراوەیی و بە کۆکراوەیی بهێنرێتە پاڵ مەغریب، ئەوا نوێژی مەغریب بە هیچ شێوەیەك کورت ناکرێتەوە تەنها کۆ دەکرێتەوە، بەم شێوەیە نیەت دەهێنیت: (نیەتم وایە سێ ڕکات نوێژی مەغریب دەکەم، فەرزە لەسەرمن بۆ خوای گەورە(الله اکبر))، ئینجا سێ ڕکاتەکە تەواو دەکەیت و سەلام دەدەیتەوەو، یەکسەر هەڵدەستیتەوەو دەڵێیت: (نیەتم وایە دوو ڕکات نوێژی عیشا بە کورتکراوەیی و بە کۆکراوەیی دەهێنمە پاڵ نوێژی مەغریب، فەرزە لەسەر من بۆ خوای گەورە (الله اکبر))، جا دوو ڕکات نوێژ دەکەیت و سەلام دەدەیتەوە.

### بڕگەی چوارەم:

دەكرێت نوێژەكان بە كورتكراوەیی و بە كۆكراوەیی بە كۆمەڵ بكرێن، بە مەرجێك ئیمامەكەشیان لە سەفەردا بێت، واتە كەسێك لە سەفەردا بێت ناتوانێت نوێژەكانی لە دوای ئیمامێكی نیشتەجێ ئەنجام بدات.

### بڕگەی پێنجەم:

دەرچوون لە سنووری ئەوشوێنەی لێی نیشتەجێیت و بزانیت ئەو شوێنەی بۆی دەچی دوو قۆناغ یان (٤٨)میلی هاشمیە، مافی ئەوەت دەدەنێ نوێژەكانت كورت بكەیتەوەو كۆیان بكەیتەوە.

### بڕگەی شەشەم:

كەسێك ماوەی مانەوەكەی دیاری بكات بە چوار ڕۆژ، ئەوا تەنها لە ڕێگا مافی كورتكردنەوەی هەیە، كە گەیشتە شوێنەكە وەكو نیشتەجێ مامەڵەی لەگەڵ دەكرێت، وەكو ئەو حاجیانە كە لە دەرەوەی مەككەوە دەچنەناو مەككە، بۆیان هەیە دوای حەجەكە سێ ڕۆژ لە مەكەدا بمێننەوە، ئەگەر بوو بە چوار ڕۆژ مافی كورتكردنەوەو كۆكردنەوەیان نامێنێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: مانەوەی كۆچكەرەكان لە شاری مەككەدا لەدوای جێبەجێ كردنی ڕێوڕەسمی حەجەكەیان سێ ڕۆژە). (٩٣)

### بڕگەی حەوتەم:

بۆ ئەوانەش كە چاوەڕێن ئیمڕۆ یان سبەی كاركەیان تەواو ببێت و لە گەشتەكەیاندا ماوەی مانەوەیان دیاری نەكرد، دەتوانن نۆزدە ڕۆژ نوێژەكانیان كورت بكەنەوەو كۆیان بكەنەوە، بێجگە لەو ڕۆژەی كە دەگاتە ئەوێ و ئەو ڕۆژەش كە تێیدا دەگەڕێتەوە.

(ئیبن عەباس (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نۆزدە ڕۆژان مایەوە نوێژەكانی كورت دەكردنەوە، ئێمەش ئەگەر سەفەرێكمان كردبا نۆزدە

ڕۆژان نوێـژەکانمان کـورت دەکردنـەوەو ئەگـەر زیـاتریش مابایـنەوە، ئـەوا نوێژەکانمان بەتەوای ئەنجام دەدان). (٩٤)

برگەی هەشتەم:

کەسێك گەشتەکەی بە نیازی ئەوە بوو ماوەیەکی زۆر لەو شـوێنەدا بمێنێتـەوە، وەکو ئەوەی قوتابیەك بـۆ خوێـندن بچێت بۆ شـوێنێك یـان ولاّتێك، ئـەوە تـەنها ماوەی ڕێگاکە مافی کورتکردنەوەو کۆکردنەوەی نوێژی هەیە، هەر کە گەیشتە شوێنەکەی وەکو جێنیشینێکی ئەو شوێنە دادەنرێت.

برگەی نۆیەم:

ئەگەر لە گەشتەکەدا بۆ شارێك گەشتێکی تر هاتە پێشەوە بۆ شارێکی تر، ئەوا کورتکردنەوەو کۆکردنـەوەکان بـەردەوام دەبن، تـا مـاوەی نـۆزدە ڕۆژەکـە تـەواو دەبێت.

## مانەوە لەمزگەوتەکان بۆ خواپەرستی

## (الاعتکاف)

برگـەی یەکـەم: مانـەوەی نـاو مزگەوتـەکان یەکێکـە لـە خواپەرسـتیەکان، بـەلاّم پەروەردگار خاوەنباوەڕەکانی سەربەست کردووە لەوەی ئەنجامی بدەن یان نا، مانەوەش لە مانگی ڕەمەزاندا پاداشتەکەی زۆر زیاترە، بە تایبەتی لـە دە ڕۆژی کۆتایی مانگەکەدا.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان لەمزگەوتدا دەمایەوە).(٩٥)

برگەی دووەم:

تەنها موسوڵمانانی خاوەن ژیری بۆیان هەیە واز لە هەموو شتێك بێنن و خۆیان تایبەت بکەن بە خواپەرستیەوە، لە مزگەوتەکاندا.

**بڕگەی سێیەم:**

ئافرەت بەبێ پرسی مێردەکەی ناتوانێت بۆ ماوەیەك خۆی تایبەت بكات بە خواپەرستیەوە لە مزگەوتەکاندا.

**بڕگەی چوارەم:**

کۆیلە بەبێ پرسی خاوەنەکەی ناتوانێت بۆ ماوەیەك خۆی تایبەت بكات بە خواپەرستییەوە لە مزگەوتەکاندا، مەگەر کۆیلەکە لەوانەبێت کە نامەی پێدراوە بەرامبەر ئەوەندە ماڵە ئازاد دەکرێت.

**بڕگەی پێنجەم:**

وا گونجاوترە موسوڵمان لە کاتی خۆ تایبەتمەند کردن بۆ خواپەرستی لە مزگەوتەکاندا بە ڕۆژو شەو بێت.

**بڕگەی شەشەم:**

موسوڵمانەکان لە هەر کاتێدا بیانەوێت دەتوانن خۆیان تایبەتمەند بکەنو بۆ ماوەیەك لە مزگەوتەکاندا خەریکی خواپەرستی بن.

**بڕگەی حەوتەم:**

مانەوەی دە ڕۆژ، واتە مانەوەی دە شەو ڕۆژ بە بەردەوامی، مانەوەی ڕۆژێکیش واتە لە دوای نوێژی بەیانیەوە هەتا خۆر ئاوابوون، مانەوەی شەوێکیش واتە لە دوای خۆرئاوابوونەوە هەتا دوای نوێژی بەیانی.

**بڕگەی هەشتەم:**

ئەم مانەوەیە لە مزگەوتەکاندا پێویستی بە نیەت هێنان هەیە، بەوەی هەر لە سەرەتاوە بڵێت: نیەتم وایە ئەوەندە ڕۆژە لە مزگەوتدا بمێنمەوە بۆ خواپەرستی.

**بڕگەی نۆیەم:**

لەوماوەی مانەوەدا بۆی نیە بە بێ هۆیەك مزگەوت جێهێڵێت، بەڵام ئەگەر بە هۆیەکەوە بوو کە هەر دەبوو بۆماوەیەك بێتە دەرەوە، ئەوە گونجاوە، وەکو

ئەوەی بۆ نانخواردن بێتەوەماڵەوەو پاشان بگەڕێتەوە، هەرچەندە دەتوانێت لە مزگەوتیشدا خواردنەکەی بخوات، یان بەهۆی نەخۆشیەکەوە ناچاربێت مزگەوتەکە جێهێڵێت، یان بچێت بۆ نوێژی هەینی، یان لە مزگەوت بێتە دەرەوە بۆ بانگدان، یان بۆ نوێژکردن لەسەر مردوویەك، ئەوە گونجاوە، بە مەرجێك پێشتر خۆی بڕیارێکی وەهای نەدابێت کە بۆ سەردانی نەخۆش یان بۆ نوێژی مردوو مزگەوت جێ نەهێڵێت.

**بڕگەی دەیەم:**

ئەگەر ئافرەتێك لە مزگەوتدا مابۆوەو تووشی خوێنی بێ نوێژی هات، ئەوا ماوەی مانەوەکەی دەپچڕێت و دەبێت مزگەوت جێهێڵێت.

**بڕگەی یازدە:**

ئەگەر کەسێك لە بێ ئاگایی مزگەوتی جێهێشت و هاتە دەرەوە، ئەوە ماوەی مانەوەکە ناپچڕێت.

(پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: گوناحی هەڵەکردن و شت لەبیرچوون و ئەنجامی ئەو کردەوانەش کە بە تۆبزی بە مرۆڤ دەکرێن، لەسەر ئوممەتەکەی من هەڵگیراون). (٩٦)

**بڕگەی دوازدە:** ئەگەر بەهۆی ترسێکەوە هاتە دەرەوەو خۆی شاردەوە، ئەوە ماوەی مانەوەکەی ناپچڕێت.

**بڕگەی سێزدە:**

ئەگەر لەو ماوەی مانەوەدا چووە پاڵ خێزانەکەی، ئەوا ماوەکە دەپچڕێت، هەروەك خوا دەفەرموێت:

وَلا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنْتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ...(١٨٧ البقرة)

﴿...مەچنە لای خێزانەکانیشتان لە کاتێکدا ئێوە لەنێو مزگەوتەکاندا خۆتان بۆ خواپەرستی هێشتۆتەوە....﴾.

**برگەی چواردە:**

**ئەگەر کەسێك مانەوەکەی لە ئەستۆی خۆی گرتبێت و بە هۆیەکەوە نەیتوانی بمێنێتەوە، ئەوا پێویستە لە کاتێکی تردا دووبارەی بکاتەوە.**

**(ئەنەسی کوڕی مالیك**(ڕەزای خوای لێبێت) **دەڵێ: پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندا لە مزگەوتدا دەمایەوە،ساڵێکیان نەیتوانی بمێنێتەوە، بۆیە ساڵی داهاتوو بیست ڕۆژ مایەوە).** (٩٧)

## بابەتی سێیەم

## زەكات

خوا دەفەرموێت:

إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ وَأَقَامُواْ الصَّلاَةَ وَآتَوُاْ الزَّكَاةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ (٢٧٧)(البقرة)

﴿بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو كردەوە چاكەكانیان كردوون‌و نوێژەكانیان بەجێهێناون‌و زەكاتیان داوە، پاداشتیان لەلای پەروەردگاریان هەیەو ترسیان لەسەر نییەو خەفەتبار نابن﴾.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: باشترین بەخشین یان باشترین چاكە (ئەوەیە كە ئەوكەسەی دەبەخشێت) لە باری دەوڵەمەندی دابێت‌و لەسەر تێری بێت، دەستێكیش كە لە سەرەوەیەو(دەبەخشێت)، لە دەستێك باشترە كە لە ژێرەوەیەو (وەردەگرێت)، بەوانەش دەست پێبكە كە بەخێویان دەكەیت).(٩٨)

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: دەوڵەمەندیی بە زۆربوونی ماڵ‌و سامان نییە، بەڵكو دەوڵەمەندیی، دەوڵەمەندیی دەروونە).(٩٩)

ئەوەی دەروونەكەی دەوڵەمەند بێت وادەزانێت هەموو دنیا هی ئەوە لەبەرئەوە ئەوەندەی پێی بكرێت خێرو چاكە دەكات، ئەوەش كە دەروونەكەی هەژارە ئەگەر هەموو دنیاش هی ئەو بێت وادەزانێت هیچی نیەو چاوی لە ماڵ‌و سامانی زیاترەو هەرگیز نایگاتیٚ.

(صاع)پێوەرێكی تایبەتی شاری مەدینەیە، دانوێڵەی پیٚ دەپێورێت جێگەی (٤) چوار (مد)دەبێتەوە،

هەر(مد)ێك دەكاتە( ٣ /٤ ) ڕتڵی بەغدادی = ١,٣٣ڕتڵی بەغدادی،

هەر ڕتڵێكی بەغدادی = ١٣٠ درهەم

واتە هەرمەدێك = ١,٣٣٣ × ١٣٠ درهەم = ١٧٣,٣٣ درهەم،

هەر درهەمێك = ٣,٥ گرام

واته هەریەك مەد = ١٧٣,٣٣ × ٣,٥ = ٦٠٦,٦٦٦ گرام

کەواتە هەرصاعێك = ٦٠٦,٦٦٦ ×٤

= ٢٤٢٦,٦٦ گرام

﴿الوسق = ٦٠ صاع = باری حوشترێك . ( الصحاح ٧٢١ ) .﴾

= ٦٠ × ٢٤٢٦,٦٦ گرام = ١٤٥,٦ کیلۆ خورما.

﴿الاوقية = چل درهەم لە زیو. ( الصحاح / وقى / ٧٣٣ ) .﴾

= ٤٠ × ٣,٥ گرام = ١٤٠ گرام زیو.

## ئەوانەی زەکاتیان پێدەدرێت:

خوا دەفەرموێت:

إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٦٠)(التوبة)

﴿بەڕاستی زەکات بۆ ئەوانەیە کە(خەڵکی) لات و گەدان، بۆ ئەوانەش لە کۆکردنەوەی زەکات کار دەکەن و، بۆ نوێ موسوڵمانە دڵ ڕاگیراوەکان و، بۆ بەندەو(کۆیلەو)، بۆ قەرزدارەکان و، بۆ(خەرجکردنی) لە ڕێگەی خواداو، بۆ ئەو ڕێبوارانەش کە لە ڕێگادا تووێشویان لێ دەبڕێت و ناگەنەوە جێگەی خۆیان، (زەکات لەسەر پەیڕەوانی ئاینی ئیسلام) لەلایەن پەروەردگارەوە پێویست کراوە، بەڕاستی پەروەردگار زاناو شارەزاو کاردروستە﴾.

بڕگەی یەکەم: (لات) واتە: کەسێك لە ماڵ و سامان هیچ شتێکی نەبێت.

بڕگەی دووەم: (گەدا) واتە: کەسێك لە ماڵ وسامان شتێکی هەبێت بەلاّم بەشی نەکات.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی بڕگەی یەکەم و بڕگەی دووەم پەیڕەوی ئەم خالآنەی خوارەوە دەکرێت:

خاڵی یەکەم:

ئەگەر کەسی لات یان کەسی گەدا خانوویەکی هەبێت کە تیایدا نیشتەجێ بێت بە مەرجێك خانووەکە بگونجێت لەگەڵ باری لاتیەکەی یان گەداییەکەیدا، هەرچەندە واش گونجابێت خۆیان لە خانووی بەکرێدا دانیشتبن و لە خانووەکەی خۆیاندا نەبن، ئەوا لە لات و گەدایی ناکەون و زەکاتیان دەدرێتێ.

خاڵی دووەم:

ئەگەر کەسی لات یان کەسی گەدا کتێبی زانستی و ئایینیان هەبێت هەرچەندە زۆریش بن، بەو مەرجەی لە ساڵێکدا جارێك پێویستی بەو کتێبانە هەبێت، یان چەند دەستە جل و بەرگیان هەبێت بۆ کەسایەتی وەکو خۆیان دەست بدەن، ئەوا لە لات و گەدایی ناکەون و زەکاتیان دەدرێتێ.

خاڵی سێیەم:

ئەگەر کەسی لات یان کەسی گەدا ماڵ و سامانێکی وایان هەبێت بەڵام دەستیان پێی نەگات، یان قەرزێکیان هەبێت وادەی وەرگرتنەوەی نەهاتبێت، ئەوا لە لات و گەدایی ناکەون و زەکاتیان دەدرێتێ.

خاڵی چوارەم:

ئەگەر کەسی لات یان کەسی گەدا پیشەیەکی وەها بزانن کە خۆیانی پێ بژیەنن بەڵام ئێستا نەتوانن بیکەن، یان بتوانن بەڵام شایستەی کەسایەتی ئەوان نەبێت، ئەوا لە لات و گەدایی ناکەون و زەکاتیان دەدرێتێ.

خاڵی پێنجەم:

مامۆستاو قوتابی لات و گەدا ئەگەر توانای کارکردنیان هەبێت، بەڵام ئەم کارکردنە ڕێگە لە وانە گوتنەوەکەیان یان خوێندنەکەیان بگرێت، ئەوا وەکو لات و گەدا تەماشا دەکرێن و زەکاتیان دەدرێتێ.

خاڵی شەشەم:

ئەگەر كەسی لات یان كەسی گەدا بەهۆی خەریك بوون بە نوێژكردن یان قورئان خوێندنەوە كاری پێ نەدەكرا، ئەوا زەكاتی نادرێتێ و ناچار دەكرێت كار بكات، چونكە ئیسلام زەكات بە كەسێك نادات بە ئارەزووی خۆی كار ناكات.

خاڵی حەوتەم:

ئەگەر كەسێك ژیانی لەسەر كەسێكی تر بێت و ئەو پێژیوەی كە دەیدرێتێ بەشی دەكرد، وەكو ئافرەت كە مێردەكەی دەیژیەنێ، یان دایك و باوك كە كوڕ دەیانژیەنێت، ئەوا بەو پێژیوە لە لات و گەدایی دەردەچن و زەكاتیان پێ ناشێت، بەڵام ئەگەر ئەم پێژیوە كە دەیدرایە بەشی نەدەكرد، ئەوا وەكو لات و گەدا زەكاتیان دەدرێتێ.

خاڵی هەشتەم:

ئەگەر كەسێك پێژیوی لە یەكێك وەردەگرت كە پێویست نەكرابوو لەسەری ئەم پێژیویە بدات، وەكو پێژیوی دان بە براو خوشك و برازاو خوارزا، هەموو ئەم خوشك و براو برازاو خوارزایانە زەكاتیان دەدرێتێ.

خاڵی نۆیەم:

باوك بۆی هەیە زەكات بدات بە كوڕەكەی بۆ دابینكردنی پێداویستیەكانی هاوسەرەكەی، یان ئەگەر كوڕەكەی خەریكی خوێندن بێت بۆ كڕینی كتێب و پێداویستیەكانی، هەروەها دروستە باوك زەكات بدات بە ڕۆڵەكانی خۆی نەك لەبەرئەوەی لات یان گەدان، بەڵكو لەبەر هەر هۆیەكی تر كە زەكات بە مرۆڤ ڕەوا دەكات.

بڕگەی سێیەم:

فەرمانبەرانی كۆكردنەوەی زەكات.

ئەو كەسانە دەگرێتەوە كە فەرمانڕەوا دەستنیشانیان دەكات و دەسەڵاتیان دەداتێ بۆ ئەم مەبەستە، ئەم فەرمانبەرانە هەرچەندە خۆشیان خاوەنی ماڵ و سامان بن زەكاتیان هەر دەدرێتێ.

بۆ دەستنیشانکردنی ئەم فەرمانبەرانە پێویستە پەیڕەوی ئەم خالأنە بکرێت:

خاڵی یەکەم:

پێویستە ئەم فەرمانبەرانە کەسانی شارەزاو دەست پاك و خاوەن ڕەوشتی بەرزبن.

خاڵی دووەم:

ئەم فەرمانبەرانە هیچ مافێکیان نیە لەسەر خاوەن ماڵ و سامانەکە، بەوەی کە داوای زیادەی لێ بکرێت لە ئەندازەی بڕە زەکاتی دیاریکراو.

خاڵی سێیەم:

ئەم فەرمانبەرانە لە هەموو بارێکدا ئەگەر باوەڕیان بە خاوەن ماڵ و سامانەکە نەکرد، بۆیان هەیە سەرژمێری ماڵ و سامانەکە بکەنەوە، خاوەن ماڵ و سامانی ڕاستگۆش باوەڕی پێ دەکرێت.

خاڵی چوارەم:

ئەم فەرمانبەرانە دەبێت بە زمانێکی شیرین لەگەڵ خاوەن ماڵ و سامانەکەدا بدوێن و، بۆیان نیە ببن بە ئەرکێکی قورس بەسەریانەوە، مەگەر بە ڕەزامەندی خاوەن ماڵەکە.

بڕگەی چوارەم: قەرزدار.

واتە: ئەو کەسەی کە ماڵ و سامانی لە کەسێکی تر وەرگرتبێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە بێ قازانج و زەرەر.

ئەگەر کاتی دانەوەی قەرزەکە هات و ئەو قەرزدارە نەیبوو بیداتەوە، ئەوا پەیڕەوی ئەم خالأنەی خوارەوە دەکرێت:

خاڵی یەکەم:

ئەو قەرزە کە کردویەتی لە ڕێگەی خراپەکاریدا خەرجی نەکردبێت، یان ئەگەر لە ڕێگەی خراپەکاریدا خەرجی کردبێت و پاشان پەشیمان بووبێتەوە، ئێستاش نەیبێت قەرزەکە بداتەوە، ئەوا زەکاتی دەدرێتێ.

خاڵی دووەم:

ئەگەر کەسێك بۆ قازانجی کۆمەڵ قەرزدار بوو، وەك ئاشت کردنەوەی دوو کۆمەڵ یان دوو کەس کە شەڕو ئاژاوەیان لەنێواندا بووبێت، یان لە دروستکردنی قوتابخانەو نەخۆشخانەو پردو ڕێگەوبان تووشی قەرزکردن بووبێت، یان بۆ میوانداریو ناندان بە خەڵك قەرزی کردبێت، ئەوە دروستە ئەوەندە زەکاتەی بدرێتیٚ کە هەموو قەرزەکەی پیٚ بداتەوە، مەبەست لەم جۆرە زەکاتە ئاوەدان کردنەوەی وڵاتو گەشانەوەی ڕەوشتو هاندانی موسوڵمانانە بۆ چاکەکردن.

خاڵی سێیەم:

ئەگەر کەسێك قەرزدار بێت وەکو ئەوانەی لە خاڵی یەکەمو دووەمدا ڕوونکراونەتەوە بەڵام ماڵو سامانی تری هەبێت کە بتوانێت قەرزەکەی پیٚ بداتەوە، ئەوا ئەوکەسە ناچێتە ڕیزی ئەو قەرزدارانەی کە زەکاتیان پێدەشێت.

برگەی پێنجەم: ڕێبوار:

واتە: کەسێك خەڵکی ئەم وڵاتە، یان هی دەرەوەی ئەم وڵاتە بێت، لە گەشت دا بێت یان بیەوێت بۆ مەبەستێك گەشتێك بکات.

بۆ دیاریکردنی ئەم مەبەستە پێویستە پەیرەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت:

خاڵی یەکەم:

ئەگەر ئەو ڕێبوارە گەشتەکەی بۆ گەڕان بە دوای فێربوونی بیروباوەڕو ئادابی ئایینی ئیسلامدا بێت، ئەوا زەکاتی دەدرێتیٚ، ئینجا گەشتەکە دوو قۆناغ ڕێگە زیاتر بێت یان کەمتر بێت.

خاڵی دووەم:

ئەگەر ئەو ڕێبوارە گەشتەکەی بۆ فێربوونو شارەزابوونی کارو پیشەك بێت کە کۆمەڵگای موسوڵمانان کەڵکی لیٚ وەربگرن، زەکاتی دەدرێتیٚ، ئینجا گەشتەکە دوو قۆناغ ڕێگە زیاتر بێت یان کەمتر بێت.

**خاڵی سێیەم:**

ئەگەر ئەم ڕێبوارە گەشتەکەی بۆ سەردانی خزمو دۆستان یان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی بێت، بە مەرجێك نیازی کاری نادروستی نەبێت، زەکاتی دەدرێتێ، ئینجا گەشتەکە دوو قۆناغ ڕێگە زیاتر یان کەمتر بێت.

**خاڵی چوارەم:**

ئەو ڕێبوارەی بە بێ مەبەست دەسووڕێتەوە زەکاتی نادرێتێ.

**بڕگەی شەشەم:** بەندەی نامە پێدراو

مەبەست لەو مرۆڤەیە کە بەندەیە (عبد) کە لەلایەن خاوەنەکەیەوە نامەیەکی پێدراوە، تێیدا ڕوونکراوەتەوە ئەگەر ئەم بەندەیە بە جارێك یان بە چەند جارێك ئەو بڕە ماڵە دیاریکراوەی بۆ بەرێت ئەوا ئازادی دەکات، زەکات بە تەواوی دەدرێت بەو بەندەیە بۆئەوەی ڕزگاری بێت لە بەندایەتی.

**بڕگەی حەوتەم:** تازە موسوڵمانی دڵڕاگیراو:

ئەو موسوڵمانانە دەگرێتەوە کە تازە هاتوونە سەر بەرنامەی ئاییینی ئیسلامو بە تەواوی ڕانەهاتوونو دڵ ناسکن، زەکاتیان دەدرێتێ بۆئەوەی بتوانن خۆیان ڕابگرنو بەردەوام بنو، زەکات دانەکەش زیاتر سەرنجی خەڵکی تر ڕابکێشێت بۆ هاتنە ناو ئاییینی ئیسلامەوە.

**بڕگەی هەشتەم:** خەرج کردنی زەکات لە پێناوی خوادا:

ئەو موسوڵمانانە دەگرێتەوە کە لە پێناوی خوادا تێدەکۆشن بێ ئەوەی مووچەیان بۆ بڕابێتەوە، ئەوانە ئەوەندەیان زەکات دەدرێتێ کە بەشی خۆیانو ماڵو منداڵیان بکات تا لە ئەنجامدانی کارەکەی تەواو دەبێت، ئەو سەربازو ئەفسەرانەش کە سنووری وڵات دەپارێزنو زەکات نەدەر دەترسێننو بەرپەرچی مشەخۆرو کەللەڕەقی ناوخۆ دەدەنەوەو ناهێڵن زیادەڕەوی بکەن، زەکاتیان دەدرێتێ.

## مەرجەكانی زەكاتدەرو زەكات وەرگرو ئەوماڵەی كەدەدرێت بەزەكات.

## ئەوكەسەی زەكات دەدات

فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٦٠)التوبة

﴿(زەكات لەسەر پەیڕەوانی ئاینی ئیسلام) لەلایەن پەروەردگارەوە پێویست كراوە، پەروەردگاریش زاناو شارەزاو كاردروستە﴾

### بڕگەی یەكەم:

پێویستە زەكات دەر مرۆڤێكی موسوڵمانی سەربەستو ئازاد بێتو باوەڕی بە بەجێهێنانی هەر پێنج بابەتەكانی خواپەرستی هەبێتو ڕاستگۆ بێت، كەواتە كەسێك كە باوەڕی بە خواو پێغەمبەرەكانی و كتێبەكانی و فریشتەكانی و ڕۆژی دوایی نەبێتو نوێژ نەكاتو بەڕۆژو نەبێتو باوەڕی بە سەردانی ماڵی خوا نەبێت، ئەگەر هەموو دنیاش هی ئەوبێت زەكاتی لێ وەرناگیرێتو، ئەوكەسە لەڕیزی موسوڵمانان دانانرێت.

### بڕگەی دووەم:

ئەو زەكات دەرەی پابەند بوو بە مەرجی بڕگەی یەكەمەوە، ئەوا ئەو زەكاتەی كە لە ماڵەكەی دەیدات دەبێت تەنها بۆ ڕەزامەندی خوا بێت نەك بۆ بەرزكردنەوەی پلەوپایەی خۆی.

### بڕگەی سێیەم:

نابێت زەكاتدەر ڕۆژێك لەڕۆژان لەبەرچاوی كۆڕوكۆمەڵ بەچاوی زەكات وەرگری دابداتەوە كە زەكاتی داوەتێ.

### بڕگەی چوارەم:

پێویستە زەكاتدەر ئەو بڕە زەكاتەی كە هەیەتی بیدات بە( بيت المال) دابەشی بكات، ئەگەر (بيت المال) نەبوو، ئەوا ئەوكەسە دەتوانێت خۆی دابەشی بكات بە مەرجێك زەكات دانەكە ئەو كەسانە بگرێتەوە كە زەكاتیان دەدرێتێ.

**بڕگەی پێنجەم:**

زەكاتدەر ئەگەر ویستی دەتوانێت كەسێكی تر بكات بە وەكیلی خۆی بۆ دابەشكردنی بڕە زەكاتەكەی لە كاتێكدا كە(بیت المال) نەبێت.

**بڕگەی شەشەم:**

زەكاتدەر دەتوانێت سەرەتا زەكات بدات بە خزم‌و كەس‌وكارە نزیكەكانی خۆی لەوانەیان كە زەكاتدانەكە دەیانگرێتەوەو پێویستە زەكاتدانەكە لە كاتی خۆیدا جێبەجێ بكرێت‌و دوا نەخرێت.

## مەرجەكانی زەكات وەرگر

إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ ......(٦٠)التوبة

﴿بەڕاستی زەكات بۆئەوانەیە كە(خەڵكی) لات‌و گەدان، بۆئەوانەش لەكۆكردنەوەی زەكات كاردەكەن‌و، بۆ تازە موسوڵمانە دڵ ڕاگیراوەكان‌و، بۆبەندەو(كۆیلەو)، بۆقەرزدارەكان‌و، (بۆ خەرجكردنی) لەڕێگەی خواداو، بۆئەو ڕێبوارانەش كە لەڕێگادا تووێشویان لێدەبڕێت‌و ناگەنەوە جێگەی خۆیان﴾.

**بڕگەی یەكەم:**

پێویستە زەكات وەرگر مرۆڤێكی موسوڵمان بێت‌و باوەڕی بە بەجێ هێنانی هەر پێنج پایەكەی ئیسلام هەبێت‌و ڕاستگۆبێت، كەواتە كەسێك باوەڕی بە خواو پێغەمبەرەكانی‌و كتێبەكانی‌و فریشتەكانی‌و ڕۆژی دوایی نەبێت‌و نوێژ نەكات‌و بەڕۆژوو نەبێت‌و باوەڕی بە سەردانی ماڵی خوا نەبێت، زەكاتی نادرێتێ‌و ئەوكەسەش لەڕیزی موسوڵمانان دانانرێت.

**بڕگەی دووەم:**

دەبێت ئەوكەسەی كە زەكاتەكە وەردەگرێت یەكێك بێت لەوانەی لە بەشی دووەمدا ڕوون كراونەتەوەو كەسێكی كامڵ‌و ژیر بێت، لەبەرئەوە زەكات نادرێت بە منداڵ و شێت.

**بڕگەی سێیەم:**

نابێت زەكات وەرگر لە نەوەكانی (هاشم و عبدالمطلب)بن، یان كەسانی هەتیو (بێ باوك)بن، ئافرەتی خاوەن هەتیو ئەگەر لەو كەسانە بێت كە زەكات دەیانگرێتەوە دەتوانێت زەكاتەكە وەربگرێت و وەكو ماڵی خۆی بۆ منداڵەكانی خەرج بكات، زەكاتیش دەدرێت بە سەرپەرشتی كەری هەتیوەكان بۆئەوەی بۆ هەتیوەكانی سەرف بكات و بە هیچ شێوەیەك ڕاستەوخۆ نادرێتە دەست هەتیوەكان.

**بڕگەی چوارەم:**

زەكات وەرگرێكی لات یان گەدا بۆی هەیە ڕاستەوخۆ داوا لە زەكات دەر بكات بۆئەوەی بەشە زەكاتی بداتیٚ و هیچ نەنگیەكی تێدانیەو داوای شاهیدو سوێندخواردنی لیٚ ناكرێت.

**بڕگەی پێنجەم:**

ئەگەر كەسێكی خاوەن ماڵ وسامان وای ڕاگەیاند ماڵ و سامانەكەی فەوتاوەو داوای زەكاتی كرد، ئەوا دەبێت بە شاهید بیسەلمێنێت كە ماڵ و سامانەكەی فەوتاوە.

**بڕگەی شەشەم:**

ئەگەر كەسێكی زەكات وەرگر وای ڕاگەیاند كە منداڵ و خێزانی زۆری هەیەو هیچ زانیاریەك لە بارەیەوە نەدەزانرا، ئەوا دەبێت بە شاهید بیسەلمێنێت، بۆئەوەی بڕی زیاتر زەكاتی بدرێتیٚ.

**بڕگەی حەوتەم:**

لە كاتێكدا كە(بيت المال) هەبێت، دەبێت لات و گەدا ئەوەندەیان زەكات بدرێتیٚ زۆرینەی تەمەنیان لە(٦٠ – ٧٠)ساڵ پێی بژین، بەم جۆرەی ئەگەر توانای كاسپی كردنیان هەبوو سەرمایەیان بۆ دیاری دەكرێت، بۆئەوەی كاسپی پێوە

بکەن، ئەگەرتوانای کاسپی کردنیشیان نەبوو، ئەوا باخێك یان دوکانێك یان چەند مالأتێکیان بۆ دەکڕدرێت تا بە بەروبوومەکەی بژیەن.

**بڕگەی هەشتەم:**

زەکات وەرگر دەتوانێت ڕاستەوخۆ زەکاتەکە لە زەکاتدەر یان لە وەکیلی زەکاتدەر وەربگرێت، هەروەها بۆی هەیە ئەویش وەکیلێك بۆخۆی دابنێت زەکاتەکەی بۆ لە زەکاتدەر یان وەکیلی زەکاتدەر وەربگرێت.

## مەرجەکانی ئەوماڵەی کە دەدرێت بەزەکات

**بڕگەی یەکەم:**

دەبێت ئەو ماڵەی بۆ زەکات جیا دەکرێتەوە لەهەمان بەروبوومی زەکاتدەرەکە بێت و نەگۆڕابێتەوە بە جۆرو بابەتی تر، گەنم لە جیاتی گەنم، جۆ لە جیاتی جۆ، زێڕ لە جیاتی زێڕ، زیویش لە جیاتی زیو، مەڕ لەجیاتی مەڕ، بزن لە جیاتی بزن و بەم پێیە.

**بڕگەی دووەم:**

دەتواندرێت لەلایەن زەکاتدەرەکەوە پارە بخەملێنرێت بەرانبەر نرخی ئەو ماڵەی بۆ زەکات داندراوە بەپێی نرخی ئەو ڕۆژەی کە زەکاتەکەی تێدا پێویست بووە، بەمەرجێك ئەو پارەیەی لەبری ئەم بڕە زەکاتە دەدرێت پارەیەکی پاکی بە ڕەواجی ئەم ولأتە بێت.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەو ماڵەی کە بۆ زەکات دیاریکراوە لە شارێکەوە بۆ دابەشکردنی لە شارێکی تر، یان لە ولأتێکەوە بۆ ولأتێکی تر ناگوازرێتەوەو مافی خەڵکی ئەو ناوچەیەیە، بەڵام ئەگەر بارێکی سەخت لە ژیانی موسوڵمانانی شوێنێك ڕوویدا دەتوانرێت زەکات لە شوێنەکانی ترەوە بگوازرێتەوە بۆ ئەو شوێنە بۆ فریاکەوتن و یارمەتی دانیان.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەو ماڵەی کە بۆ زەکات جیا دەکرێتەوە دەبێت لەشوێنی شیاودا هەڵبگیرێت تا دابەش دەکرێت و دەگاتە دەستی زەکات وەرگر.

## ئەو سامان و سەروەتانەی زەکاتیان لێ وەردەگیرێت

**زەکاتی ئاڵتوون و زیو:**

وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (٣٤)التوبة

﴿...ئەوانەش کە زێڕو زیو دادەکەن و نایبەخشنەوە لەڕێگەی خوادا، جا مزگێنیان بدەیە بە سزایەکی ئازاراوی﴾.

**بڕگەی یەکەم:**

بڕی ئەو ئاڵتوونەی کە زەکاتی لێ وەردەگیرێت دەبێت لە (٢٠) بیست مسقاڵ کەمتر نەبێت.

**بڕگەی دووەم:**

بڕی ئەو زیوەی کە زەکاتی لێ وەردەگیرێت دەبێت لە(٢٠٠) درهەم یان (١٤٠) مسقاڵ کەمتر نەبێت.

**بڕگەی سێیەم:**

سەنگی مسقاڵ بە( ٥ )پێنج گرام دادەنرێت.

سەنگی درهەم: هەر(١٠)دە درهەم یەکسانە بەحەوت مسقاڵ،

(٧) حەوت مسقاڵ = ٧ × ٥ = ٣٥ گرام ،

کەواتە کێشی یەك درهەم = ٣٥ ÷ ١٠ = ٣,٥ گرام.

هەموو کاتێك : (١) یەك درهەم + ٣/٧ ی درهەمێك = مسقاڵێك،

واتە: ٣,٥ گرام + (٣,٥ گرام × ٣/٧) = ٣,٥ گرام + ١,٥ گرام

= ٥ پێنج گرام = یەك مسقاڵ .

هەموو کاتێك : (١) یەك مسقاڵ − ٠,٣ ی مسقاڵێك = درهەمێك

واتە: (٥) گرام – (٥ گرام × ٠,٣) = (٥) گرام – (١,٥) گرام

= (٣,٥) گرام = یەك درهەم.(بنەمای ئەم زانیاریانە لەکتێبی مغنى المحتاج الى معرفة معانى الفاظ المنهاج ص ٥٢٤ الجزء الاول) وەرگیراوە.

## بڕگەی چوارەم:

ئەو ئاڵتوون و زیوەی کە گەیشتنە ئەندازەی وەرگرتنی زەکات وەکو لە بڕگەی یەکەم و دووەمدا ڕوون کراوەتەوە، ئەوا بۆ هەر چل مسقاڵ لە ئاڵتوون یان لە زیو، (١) یەك مسقاڵ زەکات دەدرێت.

## بڕگەی پێنجەم:

ئاڵتوون یان زیو ئەگەر کانزایەکی تری لەگەڵ تێکەڵ کرابێت و دارێژرابێت، ئەوا تەنها ئەندازەی ئاڵتوونەکە یان زیوەکە دەکێشرێت بۆ پێویستبوونی گەیشتن بە ئەندازەی زەکاتدان و، کانزاکە ناکەوێتە ژێر یاسای زەکات دانەوە.

## بڕگەی شەشەم:

ئەو ئاڵتوون و زیوەی کە زەکاتی لێ دەردەکرێت، دەبێت لای خاوەنەکەی ساڵێکی تەواوی بە ساڵی کۆچی (هجری) بەسەردا تێپەڕبووبێ.

## بڕگەی حەوتەم:

خشڵی ئافرەتان ئەگەر زیادەڕەوی تێدا نەکرێت زەکاتی لەسەرنیە، واتە ئەوەی کە باوە لەنێو کۆمەڵدا وەکو ملوانکەی زێڕو گەردانەو دوگمەو دۆلاب و بازن و گوارەو ئونگوستیلەو ئەلقەی دەست، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم بڕگەیە پێویستە پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت:

### خاڵی یەکەم:

کەوش و نەعلی زێڕو زیوو تاجە زێڕینەو ئەو لیرە زێڕو زیوانەی کە نەکراون بە خشڵی ژنان، زەکاتیان لێ دەردەکرێت.

(ئاینی ئیسلام دنەی پەیڕەوەکانی دەدات لە هەموو سەردەمێکدا کە کەسانی سادەو گەل و نەتەوەیەکی مامناوەند بن و لە ژیانتاندا زیادەڕەوی نەکەن،

کەواتە دەبێت سنوورێك هەبێت بۆ خشڵی ژنان بۆئەوەی هەرنەبێت هەستو سۆزی ژنانی بێ دەرامەت بریندار نەکرێت کە توانای کڕینی خشڵی زێڕو زیوو جوانکارییەکانی تریان نیەو، بۆئەوەی ماڵو سامانەکان نە بەسترێنەوەو بخرێنە گەڕو داهاتی تریان پێ پەیدا بکرێت بۆئەوەی هەموو کۆمەڵ بە هەژارو دەوڵەمەندەوە کەڵکی لێ وەربگرنو، پێتەویی باوەڕی ئافرەتانیش بە خواو ڕۆژی دوایی باشترین پارسەنگن بۆ دیاریکردنی ئەو خشڵو جوانکارییانە﴾.

**خاڵی دووەم:**

ئەو خشڵەی کە پیاوێك بۆ خێزانەکەی دەکڕێت، یان ئافرەتێکی خاوەن ماڵو سامان بۆخۆی دەیکڕێت بە پارەیەك بە مەبەستی ئەوەی لەکاتی زەکاتی ئەم پارەیەدا ماڵەکەی خشڵی ژنان بێت بۆئەوەی زەکات نەیگرێتەوە، دوای تێپەڕبوونی وادەی زەکاتدانەکەش ئەو زێڕە بفرۆشێتەوە، ئەوا ئەو زێڕە ناچێتە ڕیزی خشڵی ئافرەتانەوە، ئەو زێڕە وەکو هەموو بەشێك لە ماڵو سامانی ئەوکەسە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێتو زەکاتی لێ وەردەگیرێت بە پێی بڕگەکانی زەکاتی زێڕو زیو.

**خاڵی سێیەم:**

دوڕو یاقووتو پیرۆزەو مورووە بەهادارەکانی تر، زەکاتیان لەسەر نییە.

**بڕگەی هەشتەم:**

هەموو کەرەسەیەك لە ئاڵتوون یان زیو دروست کرابێتو بەکارهێنانی لە ئیسلامدا چ بۆ پیاوانو چ بۆ ئافرەتان قەدەغە کرابێت وەکو قاپو کەوچكو کەلو پەلو لغاوی ئەسپ، یان پشتێنو بازنو پاوانە بۆ پیاوان، یان زیادەڕەوی لە خشڵی ئافرەتان زەکاتیان لێ وەردەگیرێت.

**بڕگەی نۆهەم:**

پاره لە زەکاتدا وەکو ئاڵتوون و زیو تەماشا دەکرێت، واتە: هەموو پارەی کەسێك کە گەیشتە ئەندازەی (٢٠) بیست مسقاڵ ئاڵتوون، ئەوا لە هەر چل دینار یەك دینار زەکاتی لێ وەردەگیرێت کە دەکاتە ڕێژەی (٢,٥ ٪) لە سەدا دوو دینارو نیو.

**بڕگەی دەیەم:**

کەل وپەلی بازرگانی بە پارە دەخەمڵێنرێت و زەکاتی لێ دەردەکرێت.

**بڕگەی یازدە:**

هەموو ماڵ و سامانی کەسێك بەیەکەوە سەرژمێر دەکرێت بۆ گەیشتن بە ئەندازەی زەکاتدان.

**بڕگەی دوازدە:**

لە ماڵە بازرگانییەکاندا پێویستە ئەم خاڵانە لەبەرچاو بگیرێن:

**خاڵی یەکەم:**

هەر ماڵێك بۆ کڕین و فرۆشتن بێت زەکاتی لێ وەردەگیرێت.

**خاڵی دووەم:**

هەر ماڵێك بۆ خزمەتی ماڵ و منداڵ و ڕاپەڕاندنی کارەکانی بێت، ئەگەر زیادەڕەوی تێدا نەکرێت زەکاتی لێ وەرناگیرێت.

**(پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: کۆیلەو ئەسپی کەسی موسڵمان یاسای زەکات نایان گرێتەوە).** (١٠٠)

**خاڵی سێیەم:**

ئەگەر ماڵی بازرگانی بە میرات بۆ کەسێك بەجێما، ئەوا ساڵی زەکاتەکە دەپچڕێت و لەو ڕۆژەوە کە دەکەوێتە دەست میراتگرەکە ساڵی تازەی بۆ دیاری دەکرێت.

**خاڵی چوارەم:**

ئەو ماڵە ماوەی ساڵێك بێت لەژێر دەستی خاوەنەکەیدا بێت.

خاڵی پێنجەم:

دوکان‌و خانوو گەراج‌و مەیدان‌و زەوی هەروەها ئامرازو ئامێرو ئۆتۆمۆبیل بۆ کـرێ، زەکاتیـان لـێ وەرناگیرێـت لەبەرئـەوەی زەکـات لـە بەروبومـەکانیان وەردەگیرێت.

خاڵی شەشەم:

ئەگـەر هـاتوو کەسـێکی خـاوەن ماڵ‌وسـامان، پـێش تـەواوبوونی سـاڵی زەکاتەکەی، ماڵێکی لەو ماڵانە کڕی کە لە خاڵی پێنجەمدا ڕوون کراوەتەوە، بۆئەوەی پارەکانی لە یاسای زەکاتدان دەرباز بکات‌و، دوای تێپەڕبوونی ساڵی زەکاتەکـە ماڵەکـەی فرۆشـتەوە، ئـەوا هـیچ بوارێـك نیـە بـۆ دەربـازبوون لـە زەکاتدانەکە لە کۆتایی ساڵی دیاریکراوی زەکاتی ماڵ‌و سامانەکەیدا.

خاڵی حەوتەم:

ئەو ماڵانەی کە لە خاڵی پێنجەمدا ڕوون کراونەتەوە، یان هاووێنەی ئەو ماڵانە دوای فرۆشتنەوەیان یەکسەر زەکاتێکیان لێ دەردەکرێت‌و ئەو بڕەپارەیەی کە لەدوای زەکاتدانەکە دەمێنێتەوە ساڵی تـازەی زەکاتـدانی بۆ دادەندرێتـەوە لەو ڕۆژەوە کە ماڵەکەی دەفرۆشێت.

بڕگەی سێزدە:

ئەگەر منداڵ‌و شێت ماڵ‌وسامانێکیان هەبوو دەگەیشتە ئەندازەی زەکاتدان، ئەوا بەخێوکەرەکەیان ئەم ئەرکە دەگرێتە ئەستۆو زەکاتەکەیان بۆ دەردەکات.

بڕگەی چواردە:

ماڵێکی بزربوو، یان داگیرکراو، کە ئەندازەکەی لەگەڵ ماڵ‌و سامانەکەی تردا دەگەیشـتە ئەنـدازەی زەکاتـدان، ئـەوا کاتێـك کـە دەدۆزرێتـەوە، یـان وەردەگیرێتەوە، زەکاتی هەموو ساڵەکانی ڕابردووی لێ دەردەکرێت.

بڕگەی پازدە:

مارەیی ئافرەت زەکاتی لێ وەردەگیرێت ساڵانە تا ئەوەندە کەم دەبێتەوە دەگاتە ژێر بیست مسقاڵ، ئەوسا بەپێی بڕگەی یەکەم لە بەشی یەکەم لەم یاسایە زەکاتدان نایگرێتەوە، ئەگەر ساڵانەش زەکاتەکەی نەدابێت، ئەوا وەکو قەرز لە ئەستۆیدا دەمێنێ.

﴿مەبەست لەزەکاتی مارەیی ئافرەت زەکاتی ئەو بڕە پارەیەیە کە ماوەتەوە لە ئەستۆی مێردەکەیداو نەیدراوەتێ دوای شووکردنی، کەواتە ئەم بڕە مارەییە قەرزە بەسەر مێردەکەیەوە کەی دەستی بکەوێتەوە دەبێت هەموو ئەو زەکاتانەی ساڵانی پێشووی لێ بدات، یان لەسەرەتاوە خۆی لەسەر (١٩) نۆزدە مسقاڵ مارە بکات، بۆئەوەی زەکاتدان نەیگرێتەوەو خێزانەکەی نەخاتە ژێر بارێکی قورسەوە، ئەو پێشەکیەی ئافرەت لەمارەییەکەیدا وەری دەگرێت زەکاتی لەسەرنیە هەرچەندە بگاتە ئەندازەی زەکاتدانیش لەبەرئەوەی ساڵێکی بەسەردا تێنەپەڕیوە لای ئافرەتەکە، جا کە لە ماوەی ئەم ساڵەدا ئەو ئافرەتە ئەو پارەیەی بە ئارەزووی خۆی خەرج کرد، ئەوا لە کۆتایی ساڵی زەکاتەکەدا هیچی نەماوە هەتا زەکاتی لێ دەربکات، بەڵام ئەگەر هاتوو ئەو ئافرەتە، دەستکاری پارەکەی نەکردبوو یان خستبویە ئیشێکەوە، ئەوا دوای تەواوبوونی ساڵێك ئەگەر هاتوو پارەکە بە ئەندازەی خۆی یان بەو قازانجەوە کە کردویەتی دەگەیشتە ئەندازەی زەکاتدان، دەبێت زەکاتی لێ دەربکات، ئەم یاسایە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ بەهێزکردنی باری ئابووری خێزانەکانە، بۆئەوەی هەر لەسەرەتای ژیانیانەوە نەکەونە ژێر باری قەرزدارییەوەو مافی ئافرەتەکانیش نەفەوتێت﴾.

**بڕگەی شازدە:**

لە زەکاتی ماڵی (وقف کراو) پێویستە پەیڕەویی ئەم خاڵانە بکرێت:

**خاڵی یەکەم:**

ماڵێك یان پارەیەك بۆ كارێكی چاكەی وەكو دروستكردنی مزگەوت و قوتابخانەو نەخۆشخانەو پردو ڕێگەوبان وەقف كرابێت، زەكاتیان لێ وەرناگیرێت.

**خاڵی دووەم:**

ماڵێك یان پارەیەك، لەسەر منداڵێك وەقف كرابێت كە لە زگی دایكیدابێت، زەكاتی لێ دەرناكرێت تا منداڵكە لەدایك دەبێت و ساڵی زەكاتی بۆ دادەندرێت.

**خاڵی سێیەم:**

ماڵێكی وەقف كراو لەسەر كەسێك یان چەند كەسێك و بەشی هەمووشیان بەیەكەوە دەگەیشتە ئەندازەی پێویستبوونی زەكاتدان، ئەوا زەكاتدان لەو ماڵەدا پێویست دەبێت دوای تێپەربوونی ساڵێك لە خاوەنداریەتییان بۆ ماڵە وەقف كراوەكە.

## زەكاتی ئاڵتوون و زیوی شاراوەی دێرین

**بڕگەی یەكەم:**

پێویستە ئەم ئاڵتوون و زیوە دۆزراوەیە دروستكراوو نەخشێنراوی دەستی مرۆڤ بێت.

**بڕگەی دووەم:**

ئەگەر ئاڵتوون یان زیوەكە هی سەردەمی پێش ئیسلام بێت، ئەوا پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەكرێت:

**خاڵی یەكەم:**

ماڵە دۆزراوەكە دەبێت بە ماڵی ئەو كەسەی كە دۆزیویەتیەوە، ئەگەر لە وێرانەیەكی بێ خاوەن یان خاكێك كە ئەو كەسە ئاوەدانی كردبێتەوە بدۆزرێتەوە.

**خاڵی دووەم:**

ئەگەر ئەو ماڵە لە شوێنێکی گشتی وەکو مزگەوت یان نەخۆشخانە..... دۆزرایەوە، ئەوا وەکو ماڵی دۆزراوە تەماشا دەکرێت و پێویستە پەیڕەوی بڕگەکانی ماڵی دۆزراوە بکرێت لە یاساکانی ئیسلامدا.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەگەر ئاڵتوون و زیوەکە هی سەردەمی ئیسلام بوون، ئەوا پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکرێت:

**خاڵی یەکەم:**

ئەگەر زانرا خاوەنەکەی کێیە، دەیدرێتەوەو خاوەنەکەی زەکاتی هەموو ئەو ساڵانەی لێ دەردەکات کە لێی بزربووە.

**خاڵی دووەم:**

ئەگەر نەزانرا خاوەنەکەی کێیە، ئەوا وەکو ماڵی دۆزراوە تەماشا دەکرێت و پێویستە پەیڕەوی بڕگەکانی ماڵی دۆزراوە بکرێت لە یاساکانی ئیسلامدا.

**بڕگەی چوارەم:**

زەکاتی ئەم ئاڵتوون و زیوە دۆزراوەیە پێنج یەکە، ئەو ڕۆژەی کە زەکاتەکە دەدرێت دەبێت بە سەرەتای ساڵی زەکات بۆ ئەو بڕەی کە لەو ماڵە دۆزراوەیە ماوەتەوە، ئەم بەشەش کە دەمێنێتەوە لەدوای پێنج یەکەکە، دەچێتە پاڵ سامان و سەروەتی ئەوکەسە بۆ زەکاتی ساڵی داهاتوو، سەرەتای ساڵی زەکاتیشی لەو ڕۆژەوە بۆ دادەنرێت کە ماڵەکەی تێدا دۆزیوەتەوە.

### بڕگەی یەکەم:

ئەگەر کەسێك یان کۆمەڵێك لە خاکێکی تایبەت بەخۆیاندا کانێکی ئاڵتوون یان زیویان دۆزییەوەو ئەندازەی ماڵە دۆزراوەکە دەگەیشتە ئەندازەی زەکاتدان، یەکسەر پێویستە بە یەکجار زەکات لە هەمووی دەربکرێت و، ئەو ڕۆژە دەبێت بە سەرەتای ساڵی زەکاتی ئەوماڵە، لە زەکاتدانەکەشدا پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکرێت :

### خاڵی یەکەم:

ئەگەر ئەوکەسەی لە دەرهێنانەوەی ئەوماڵەدا تووشی هیلاکی و ماندوبوونێکی زۆر بوو، ئەوا لە چل بەش بەشێکی دەدرێت بە زەکات.

### خاڵی دووەم:

ئەگەر ئەوماڵە بە ئاسانی بەبێ ماندوبوون کەوتە دەست، ئەوا لە پێنج بەش بەشێکی دەدرێت بە زەکات.

### خاڵی سێیەم:

پێویستە ئەو ئاڵتوون و زیوە، کەرەسەی خاوی ئاڵتوون و زیوی ناو زەوی بن، نەك دروستکراوی دەستی مرۆڤ.

### خاڵی چوارەم:

ئەگەر ئەو بڕە ماڵە دۆزراوەیەی کە دەرهێنراوە، نەدەگەیشتە ئەندازەی پێویست بوونی زەکاتدان و، لەبەر هۆیەك کارەکە وەستا، دوای دەست پێکردنەوەی کارەکە، هەموو ئەو ئاڵتوون و زیوەی کە دەدۆزرێتەوە، دەخرێتە پاڵ ئاڵتوون و زیوە دۆزراوەکەی یەکەم جار، ئینجا کە گەیشتە ئەندازەی زەکات هەمووی بەیەکەوە زەکاتی لێ دەردەکرێت.

## زەکاتی حوشتر

### بڕگەی یەکەم:

ئەندازەی زۆروکەمی حوشترەکان کە زەکاتیان تێدا پێویست دەبێت (٥) سەرە.

### بڕگەی دووەم:

بۆ زانینی ئەندازەی زەکاتدان، پێویستە پەیڕەویی ئەم خالأنە بکرێت:

### خاڵی یەکەم:

لەهەر (٥)پێنج سەر حوشتر، کاوڕێکی تەمەن (١)یەك ساڵ دەدرێت لە زەکاتیان، (شەش وحەوت وهەشت ونۆ) هەر هەمان زەکاتیان لیٚ وەردەگیرێت.

ئەگەر کاوڕێکی یەك ساڵە دەست نەکەوت، دەتوانرێت بزنێکی(٢) دوو ساڵەی نێر یان میٚ بدرێت.

### خاڵی دووەم:

کە ژمارەیان بوو بە(١٠) دە سەر، (٢) دوو کاوڕی تەمەن یەك ساڵ دەدرێت لە زەکاتیان. (یازدەو دوازدەو سیازدەو چواردە)، هەر هەمان زەکاتیان لیٚ وەردەگیرێت.

### خاڵی سێیەم:

کە ژمارەیان بوو بە(١٥)پازدە سەر، (٣) سیٚ کاوڕی تەمەن یەك ساڵ دەدرێت لە زەکاتیان. (شازدەوحەڤدەو هەژدەو نۆزدە)هەرهەمان زەکاتیان لیٚ وەردەگیرێت.

### خاڵی چوارەم :

کە ژمارەیان بوو بە(٢٠)بیست سەر، (٤) چوارکاوڕی تەمەن یەك ساڵ دەدرێت لەزەکاتیان. (بیستویەكو بیستودوو بیستوسیٚو بیستوچوار)، هەرهەمان زەکاتیان لیٚ وەردەگیرێت.

### خاڵی پێنجەم:

کە ژمارەیان بوو بە(٢٥) بیستو پێنج سەر، (١) یەك بەچکە حوشتری مێیەی تەمەن (١) یەك ساڵ دەدرێت لەزەکاتیان.

ئەگەر بەچکە حوشتری مێیەی تەمەن (١) یەك ساڵ دەست نەكەوت، ئەوا دەتواندرێت بەچكە حوشتری نێرەی تەمەن (٢) دووساڵ بدرێت لە زەكاتیان.
ئەگەر بەچكە حوشتری مێیەی تەمەن (١) یەك ساڵو بەچكە حوشتری نێرەی تەمەن (٢) دووساڵ دەست نەكەوتن، ئەوا دەتوانرێت نێریی تەمەن (٣) سێ ساڵ بدرێت لە زەكاتیان، هەتا (٣٥)سیو پێنج سەر، هەمان زەكاتیان لێ وەردەگیرێت.

خاڵی شەشەم:

كە ژمارەیان بوو بە(٣٦) سیو شەش سەر، (١) یەك بەچكە حوشتری مێیەی تەمەن (٢) دوو ساڵ دەدرێت لە زەكاتیان، هەتا(٤٥)چلو پێنج سەر هەمان زەكاتیان لێ وەردەگیرێت.

خاڵی حەوتەم:

كە ژمارەیان بوو بە(٤٦) چلو شەش سەر، (١) یەك بەچكە حوشتری مێیەی تەمەن (٣) سێ ساڵ دەدرێت لە زەكاتیان، هەتا(٦٠) شەست سەر هەمان زەكاتیان لێ وەردەگیرێت.

خاڵی هەشتەم:

كە ژمارەیان بوو بە(٦١) شەستو یەك سەر، (١) یەك حوشتری مێیەی تەمەن (٤) چوار ساڵ دەدرێت لە زەكاتیان، هەتا(٧٥) حەفتاو پێنج سەر هەمان زەكاتیان لێ وەردەگیرێت.

خاڵی نۆیەم:

كە ژمارەیان بوو بە(٧٦) حەفتاو شەش سەر، (٢) دوو بەچكە حوشتری مێیەی تەمەن (١) یەك ساڵ دەدرێن لە زەكاتیان، هەتا(٩٠) نەوەد سەر هەمان زەكاتیان لێ وەردەگیرێت.

خاڵی دەیەم:

کە ژمارەیـان بـوو بـە(٩١) نـەوەدو یـەك سـەر، (٢) دوو بەچـكە حوشـتری مێیـەی تەمەن (٣) سیٚ ساڵ دەدرێن لە زەكاتیان، هەتا (١٢٠) سەر هەمان زەكاتیان لیٚ وەردەگیرێت.

**خاڵی یازدە:**

كە ژمارەیان بوو بە(١٢١) سەدو بیست و یەك سەر، (٣) سیٚ بەچكە حوشتری مێیەی تەمەن (١) یەك ساڵ دەدرێن لە زەكاتیان.

**خاڵی دوازدە:**

كە ژمارەیان لە(١٢١) سەدو بیست و یەك سەر زیاتر بوو، ئـەوا پـەیڕەوی یـەكێك لەو شێوانەی خوارەوە دەكرێت بە مەرجێك كامەیان لە بەرژەوەندیی هەژاران دابێت ئەوەیان جێبەجیٚ دەكرێت:

**شێوەی یەكەم:**

هەر(٤٠) چل سەر حوشتر (١) یەك بەچكە حوشتری مێیـەی تەمـەن(١)یـەك ساڵ دەدرێت لە زەكاتیان.

**شێوەی دووەم:**

هەر (٥٠)پەنجا سەر حوشتر، (١) یـەك بەچكە حوشـتری مێیـەی تەمـەن(٣)سیٚ ساڵ دەدرێت لە زەكاتیان.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەگـەر خـاوەنی حوشـترەكان بەچـكە حوشـتری وەهـای نـەبوو بـە ئەنـدازەی زەكاتەكە بێت، ئەوا پەیڕەوی ئەم خالآنەی خوارەوە دەكرێت:

**خاڵی یەكەم:**

ئەگـەر ئـەو بەچـكە حوشـترەی لـەبری زەكاتەكـە دراوە، لـە ئەنـدازەی زەكاتەكـە زیاتر بوو، ئەوا خاوەنی حوشترەكان بۆی هەیە داوای ئەو زیادەیە بكاتەوە.

**خاڵی دووەم:**

ئەگەر ئەو بەچكە حوشترەی لەبری زەكاتەكە دراوە، لە ئەندازەی زەكاتەكە كەمتر بوو، ئەوا كارمەندانی كۆكردنەوەی زەكات بۆیان هەیە داوای ئەو بەشە ماوەی لێ بكەن، لە هەردووك خاڵەكاندا هەردووك لا پابەندی خەملاَندن دەبن بە پارە یان بە ئاژەڵی بچوكتر.

**برگەی چوارەم:**

حوشتری نەخۆش لەبری زەكاتی حوشترە نەخۆشەكان و حوشتری ساغیش لە جیاتی برە زەكاتی حوشترە ساغەكان وەردەگیرێن.

## زەكاتی رەشەوولاَخ

**برگەی یەكەم:**

بۆ زانینی ئەندازەی زۆروكەمی ئەو رەشە ولاَخانەی كە زەكاتیان لێ دەردەكرێت و ئەندازەی ئەو برە زەكاتەی كە وەردەگیرێت، ئەوا پەیرەوی ئەم خالاَنەی خوارەوە دەكرێت:

**خاڵی یەكەم:**

ئەندازەی ئەو رەشە ولاَخانەی زەكاتیان لێ دەردەكرێت(٣٠) سی سەرە، (واتا تێكرا ئەگەر بوون بە سی سەر، زەكاتیان تێیدا وەردەگیرێت).

**خاڵی دووەم:**

لە(٣٠)سی سەر رەشە ولاَخ هەتا (٣٩) سی و نۆ سەر، گوێرەكە نێرێكی تەمەن (١)یەك ساڵ دەدرێت لە زەكاتیان.

**خاڵی سێیەم:**

لە(٤٠)چل سەر هەتا(٥٩) سەر رەشە ولاَخ، (نێنگونێكی)گوێرەكە مێیەی تەمەن(٢) دووساڵ دەدرێت لە زەكاتیان.

**خاڵی چوارەم:**

لە(٦٠) شەست سەر ڕەشە ولاّخ هەتا(٦٩) شەستو نۆ سەر، (٢)دوو گوێرەکە نێری تەمەن(١) یەك ساڵ دەدرێن لە زەکاتیان.

**خاڵی پێنجەم:**

لە(٧٠)حەفتا سەر ڕەشە ولاّخ هەتا(٧٩)حەفتاو نۆ سەر، گوێرەکە نێرێکی تەمەن(١)یەك ساڵو (نێنگونێکی)گوێرەکە مێیەی تەمەن(٢) دووساڵ دەدرێن لە زەکاتیان.

**خاڵی شەشەم:**

لە(٨٠) هەشتا سەر ڕەشە ولاّخ بۆ(٨٩) هەشتاو نۆ سەر، (٢)دوو(نێنگوون) گوێرەکە مێیەی تەمەن(٢) دووساڵ دەدرێن لە زەکاتیان.

**خاڵی حەوتەم:**

لە(٩٠)نەوەد سەر ڕەشە ولاّخ بۆ(٩٩)نەوەدو نۆ سەر، (٣)سێ گوێرەکە نێرەی تەمەن (١)یەك ساڵ دەدرێن لە زەکاتیان.

**خاڵی هەشتەم:**

لە(١٠٠)سەدو سەر ڕەشە ولاّخ بۆ(١٠٩) سەدو نۆ سەر، (٢)دوو گوێرەکە نێری تەمەن (١)یەك ساڵ و (١)یەك (نێنگوون) گوێرەکە مێیەی تەمەن (٢)دووساڵ دەدرێن لە زەکاتیان.

**خاڵی نۆیەم:**

لە(١١٠) سەدو دە سەر ڕەشە ولاّخ بۆ(١١٩) سەدو نۆزدە سەر، (١)یەك گوێرەکە نێری تەمەن (١)یەك ساڵو (٢)دوو(نێنگوون) گوێرەکە مێیەی تەمەن(٢) دوو ساڵ دەدرێن لە زەکاتیان.

**خاڵی دەیەم:**

لە(١٢٠)سەدوبیست سەر ڕەشە ولاّخ، (٤)چوار گوێرەکە نێرەی تەمەن (١)یەك ساڵ دەدرێن لە زەکاتیان.

**خاڵی یازدە:**

ئەگەر ژمارەی ڕەشە وڵاخەکانیش لە(١٢٠)سەر زیاتر بوون، ئەوا ئەندازەی بڕە زەکاتەکە بە یەکێك لەم شێوانەی خوارەوە دەبێت، بە مەرجێك کامەیان لە بەرژەوەندیی هەژاراندا بێت پەیڕەوی ئەو شێوەیەیان دەکرێت:

شێوەی یەکەم:

بۆ هەر(٣٠)سی سەر ڕەشە وڵاخ، گوێرەکە نێرێکی تەمەن(١)یەك ساڵ دەدرێت.

شێوەی دووەم:

بۆ هەر (٤٠)چل سەر ڕەشە وڵاخ، (نێنگوونێکی) گوێرەکە مێیەی تەمەن (٢) دووساڵ دەدرێت.

بڕگەی دووەم:

ڕەشە وڵاخەکان ئەگەر ماڵی بازرگانی بوون و ژمارەکەیان نەدەگەیشتە (٣٠)سی سەر بەڵام لەو ڕۆژەدا نرخەکەیان دەگەیشت بە ئەندازەی زەکاتدان، ئەوا ئەم بڕگەیە وەکو ماڵی بازرگانی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، واتە: دەخەملێنرێن بە پارەو زەکات لە پارەکەیان وەردەگیرێت.

بڕگەی سێیەم:

هەموو بەروبوومێکی ئەم ڕەشە وڵاخانە، لە شیرو ماست و پەنیرو قەیماغ، وەکو پارە مامەمەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

بڕگەی چوارەم:

ئەو ڕەشە وڵاخانەی کە ئالیك خۆرن و بۆ ئیش وکار بەکاردەهێنرێن، وەکو گای جووت و گای گێرە کردن زەکاتیان لێ وەرناگیرێت.

## زەکاتی مەڕو بزن

**بڕگەی یەکەم:**

دەبێت ژمارەی مەڕو بزنەکان بگات بە (٤٠)چل سەر.

**بڕگەی دووەم:**

بۆ زانینی ئەندازەی ئەو زەکاتەی کە وەردەگیرێت پێویستە پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت:

**خاڵی یەکەم:**

لە(٤٠ – ١٢٠) چل تا سەدو بیست سەر مەڕ یان بزن ،کاوڕێکی تەمەن(١)یەك ساڵ یان چێتیر بزنێکی(٢)دووساڵ دەدرێت لە زەکاتیان.

**خاڵی دووەم:**

لە(١٢١ – ٢٠٠) سەدو بیست ویەك بۆ دووسەد سەر مەڕ یان بزن، (٢) دوو سەر دەدرێت لە زەکاتیان، مەڕ لە جیاتی مەڕ وبزن لە جیاتی بزن.

**خاڵی سێیەم:**

لە(٢٠١ – ٣٠٠) دوو سەدو یەك بۆ سێ سەد سەر مەڕ یان بزن، (٣) سێ سەر دەدرێت لە زەکاتیان، مەڕ لە جیاتی مەڕو بزن لە جیاتی بزن.

**خاڵی چوارەم:**

لە(٣٠١ – ٤٠٠) سێ سەدو یەك بۆ چوار سەد سەر مەڕ یان بزن، (٤)چوار سەر دەدرێت لە زەکاتیان، مەڕ لە جیاتی مەڕ وبزن لە جیاتی بزن.

**خاڵی پێنجەم:**

ئەگەر ژمارەکەیان لە ژمارەی خاڵی چوارەم زیاتر بوو، ئەوا بۆ هەر(١٠٠) سەد سەر، (١)یەك سەر زەکات دەدرێت.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەگەر مالاتەکە تێکەڵ بوو، ئەوا پەیڕەوی ئەم دووخاڵە دەکرێت:

**خاڵی یەکەم:**

ئەگەر هەردووك جۆرەكە وەكو یەك بوون، ئەوا زەكاتی هەموویان لەو جۆرەیان وەردەگیرێت كە لە بەرژەوەندیی هەژارانە.

### خاڵی دووەم:

ئەگەر جۆرێكیان لە جۆرێكیان زیاتر بوو، ئەوا زەكاتی هەموویان لە جۆرە زۆرەكەیان وەردەگیرێت.

### بڕگەی چوارەم:

ماڵاتی نەخۆش و عەیبدار بۆ زەكات قبووڵ ناكرێت، مەگەر هەموو مێگەلەكە كە زەكاتەكەی لێ دەردەكرێت نەخۆش و عەیبدار بێت، هەروەها ماڵاتی نێرە نادرێت لەبری زەكات، مەگەر هەموو ماڵاتەكە نێرە بن.

### بڕگەی پێنجەم:

كارو بەرخ كە دوای ساڵی زەكاتی دایكەكانیان پەیدا دەبن، زەكاتیان لەسەر نیەو لەو ڕۆژەوە ساڵی زەكاتیان بۆ دادەندرێت كە لەدایكیان دەبن.

### بڕگەی شەشەم:

گونجاوە كاروبەرخ لەزەكاتی كاروبەرخ دا بدرێن، بەهەمان ڕێژەی باوانەكانیان.

### بڕگەی حەوتەم:

ئەو ماڵاتانەی كە بە بەخشین، یان بە كڕین دەست دەكەون، لەو ڕۆژەوە كە دەكەونە دەست خاوەنەكانیان، ساڵی زەكاتیان بۆ دادەنرێت.

### بڕگەی هەشتەم:

دەبێت ماڵاتەكان شوانیان هەبێت و، زۆرینەی كاتەكەیان لە لەوەڕدابن بەبێ ئەوەی لەلایەن خاوەنەكەیانەوە ئالف بدرێن، دەنا زەكاتیان لێ وەرناگیرێت.

### بڕگەی نۆیەم:

هەموو بەرووبوومی ئەو مەڕو بزنانە لە شیرو ماست و پەنیرو قەیماغ و كەشك و كەرەو دۆو خوری و پێست كە دەست خاوەنەكەی دەكەوێ و بە پارە دەفرۆشرێ وەكو زەكاتی پارە مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت.

## زەكاتی میوەو دانەوێڵە

### بڕگەی یەكەم:

بۆ زانینی ئەو میوەو دانەوێڵانەی كە زەكاتیان تێدا وەردەگیرێتو، ئەندازەی گەیشتن بە زەكاتو بڕی ئەو زەكاتەی كە لێیان وەردەگیرێت، پێویستە پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بكەین:

### خاڵی یەكەم:

زەكات لە دانەوێڵەدا، لەهەموو ئەوجۆرانەدا هەیە كە بۆ ژیان بەكاردێن وەكو: (گەنم، جۆ، برنج، نیسك، نۆك، ماش، فاسۆلیا، باقلە، گەنمەشامی، هەرزن)و هەموو دانەوێڵەیەكی تر.

### خاڵی دووەم:

زەكات لە میوەدا تەنها لە خورماو ترێ وەردەگیرێ و یەكلاكراوەتەوە لە هیچ میوەیەكی تردا وەرناگیرێت.

### خاڵی سێیەم:

ئەندازەی دانەوێڵەو میوە بۆ گەیشتن بەزەكاتدان (٥) وسقە.

یەك وسق = ٦٠ صاع.

كەواتە (٥) وسق = ٥ × ٦٠ = ٣٠٠ سێ سەد صاع.

یەك صاع = ٦٩٣,٣٣ درهەم.

یەك درهەم = ٣,٥ گرام.

كەواتە: یەك صاع = ٦٩٣,٣٣ درهەم × ٣,٥ گرام = ٢٤٢٦,٦٦ گرام

كەواتە: پێنج وسق = ٢٤٢٦,٦٦ گرام × ٣٠٠ صاع = ٧٢٨ كیلۆ گرام.

واتە هەر كاتێك كێشی هەموو دانەوێڵەكە گەیشتە ئەو ئەندازەیە، ئەوا زەكاتی لێ دەردەكرێت. (بنەمای ئەم زانیاریانە لەكتێبی مغنی المحتاج الی معرفة معانی الفاظ المنهاج ص ٥١٤ ، ٥٢٤ الجزء الاول ) وەرگیراوە.

### خاڵی چوارەم:

بۆ زانینی ئەو خورمایە تەڕەی کە دەهێڵدرێتەوە بۆئەوەی بە خورمایی بخورێت و ئەو ترێیەی کە دەهێڵدرێتەوە بۆئەوەی بکرێت بە مێوژ، ئەوا ئەندازەی پێویست بوونی زەکاتەکە لەسەر خورما هەڵگیراوو مێوژەکە (٥)پێنج وسقە، دەنا لێکۆڵینەوەو خەملاندن دەکرێت بۆئەوەی بزاندرێت چەند خورمای تەڕو ترێ (٥)پێنج وسق خورمای وشك و مێوژیان لێوە پەیدا دەبێت و لەسەر ئەو بنەمایە مامەڵە لەگەڵ زەکاتەکەدا دەکرێت.

### خاڵی پێنجەم:

بۆ زانینی بڕی زەکات لە میوەو دانەوێڵەدا، بەپێی شێوەی بەرهەمهێنانیان، پێویستە پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکرێت:

یەکەم:

بڕی زەکات لە میوەو دانەوێڵەدا (١/١٠) یەك لەسەر دەی بەرهەمەکەیە بۆ ئەو بەرهەمانەی کە پشت بە باران بارین دەبەستن، یان بەهۆی کارێزو ئاوی چەمو جۆگای هەڵگیراوەوە ئاودەدرێن.

دووەم:

بڕی زەکات لە میوەو دانەوێڵەدا (١/٢٠) یەك لەسەر بیستی بەرهەمەکەیە بۆ ئەو بەرهەمانەی بەهۆی کڕینی ئاو یان بەهۆی ناعور یان بەهۆی هەر هۆکارێکی دەستکردەوە ئاوبدرێن.

سێیەم:

ئەگەر شێوەی بەرهەمهێنان لەنێوان خاڵی یەکەم و دووەمی سەرەوەدا هاوبەش بوو، ئەوا پەیڕەوی ماوەی پەیدابوونی بەرهەمەکە دەکرێت لە سەرەتای ئامادە کردنیەوە تا بەرهەمهێنانی، بە ڕێژە مامەڵە لەگەڵ ئەم ماوەیەدا دەکرێت لەنێوان خاڵی یەکەم ودووەمدا.

بۆنموونە: ئەگەر دانەوێڵەیەك، یان میوەیەك، بە هەشت مانگ هاتە بەرهەم، چوار مانگی یەکەم پشت بە شێوەی خاڵی یەکەم بەستراو، چوار مانگی دووەم

به ناچاری پشت به شێوەی خاڵی دووەم بەسترا، واتە ماوەی بەرهەم هێناکە نیوە بە نیوە بوو، ئەوا بڕە زەکاتی دیاریکراو لەو بەروبوومەدا (چوار لەسەر سێی)ی دەیەکەکە دەبێت، کە ڕێژەکەی دەکاتە (١/١٣,٣٣) ی کۆی گشتی بەرووبومەکەو، ئەگەر ماوەی ئاودانەکان لەهەردووك شێوەی یەکەم و دووەمدا نەزانران، ئەوا بڕی خاڵی یەکەم (١/١٠) لەگەڵ بڕی خاڵی دووەم (١/٢٠) کۆدەکرێنەوەو دابەشی(٢) دوو دەکرێن دەبێت بە: ١/١٠ + ١/٢٠ = (١/١٥)ی کۆی گشتی بەرووبومەکە کە بڕە زەکاتی شێوەی خاڵی سێیەمە.

**بڕگەی دووەم:**

هەر دانەوێڵەیەك لە توێکڵدا هەڵنەگیرێت، وەکو (گەنم وجۆ)، ئەوا دەبێت بە پاککراوی بگاتە ئەندازەی زەکاتدان، ئینجا زەکاتی لێ دەربکرێت، بەڵام هەر دانەوێڵەیەك وەکو برنج کە بە توێکڵەوە دەتوانرێت هەڵبگیرێت، ئەگەر پاککرانەوە لە توێکڵەکانیان، ئەوا ئەندازەی گەیشتن بە زەکات(٥)پێنج (وسق)ە، بەڵام ئەگەر پاك نەکرانەوە، ئەوا ئەندازەی گەیشتن بە زەکات بە (١٠) (وسق) دادەنرێت.

**بڕگەی سێیەم:**

لە دانەوێڵەو میوەدا بۆ گەیشتن بە ئەندازەی زەکاتدان توخمێك ناخرێتە سەر توخمێکی تر، وەکو گەنم ناخرێتە سەر جۆ، بەڵام جۆرێك دەخرێتە سەر جۆرێکی تر، وەکو گەنمی قەندەهاری دەخرێتە سەر گەنمە زەردە، یان جۆی سپی دەخرێتە سەر جۆی ڕەش.

**بڕگەی چوارەم:**

میوەی ئەمساڵ ناخرێتە سەر میوەی ساڵێکی تر، بەڵام دوو میوەی ساڵێك هەرچەندە لەیەك کاتیشدا پێ نەگەن دەخرێنە پاڵ یەك بۆئەوەی بگەن بە ئەندازەی زەکاتدان.

**بڕگەی پێنجەم:**

لە زەکاتی دانەوێڵەو میوە پشت بە کاتی دروێنەو ڕنینەوەیان دەبەسترێت، (واتە تا کاتی پێگەیشتن و دروێنە یان ڕنینەوەیان نەیەت کاتی زەکات دانیان نایەت)و، لە زەکاتی میوەشدا کە سەرەتای پێگەیشتنی میوەکە دەردەکەوێت، نابێت هەوڵی خواردنی بدرێت لەبەرئەوەی بەشی هەژارانی لیٚ دیاری نەکراوە.

ئەگەر خاوەن میوەکەش ویستی لێی بخوات، یان ڕنینەوەکەی دوابخات، ئەوا پێویستە هەموو بەرهەمەکە بخەملێنرێت لە پێش ئەوەی کە هەر دەست تێوەردانێکی تێدا بکرێت، بە مەرجێك خاوەن میوەکە ڕازی بێت بە خەملاندنەکە.

**بڕگەی شەشەم:**

زەکاتی دانەوێڵە لەو کاتەوە پێویست دەبێت کە دەنکەکانی ڕەق ببن و خۆی بگرێت و هیچ بوارێك نیە بۆ خەملاندن، لەبەرئەوە دروست نیە خاوەن ماڵ دەستی تێوەربدات، مەگەر لەبەر ناچاری، چونکە حەقی زەکات بە هەموو بەشێکی ئەم دانەوێڵەوەیە.

**بڕگەی حەوتەم:**

هەموو خەرجییەك لە کێڵانی زەوی و چاندن و دروێنەو کێشانەوەو شەنەو خەرمان و چنینەوەو گواستنەوەو وشك کردنەوەو عەمبارکردنی، لە ئەستۆی خاوەن بەرهەمەکەدایەو، بە هیچ شێوەیەك ئەندازەیەکی دیاریکراو لەبری ئەم خەرجیانە هەڵناگیرێتەوە.

**بڕگەی هەشتەم:**

موڵکانە کە خاوەن زەوی بەشێك لە بەروبوومی داهاتەکە بەرێت لە جیاتی بەکرێدانی زەویەکە لە یاساکانی ئیسلامدا بە بەکرێدانی بەتاڵ دادەندرێت، لەم بارەدا پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکرێت:

**خاڵی یەکەم:**

ئەگەر خاوەن زەوی بەبێ ڕەزامەندی خاوەن تۆوەکە ئەندازەیەك لە بەرهەمەکەی بـرد، ئـەوا بەشـە زەکـات لـە ماڵـە بردراوەکـە وەکـو زەکـاتی مـاڵی زەوتکـراوی لێدێت، کەی دەستی کەوتەوە خاوەن تۆوەکە پێویستە زەکاتی ئەوماوەیەی لـێ دەربکات کە لێی زەوت کراوە.

**خاڵی دووەم:**

ئەگەر خاوەن تۆوەکە بە ئارەزووی خۆی هەندێك لـەو بەروبومـەی دا بـە خـاوەن زەوی، ئەوا زەکاتی هەموو بەرهەمەکە دەکەوێتە ئەستۆی خاوەن تۆوەکە.

## زەکاتی ماڵی هاوبەش

**بڕگەی یەکەم:**

لە ماڵی هاوبەشدا لەنێوان دووکەس (یان زیاتر)، لە هەموو بارێکدا هەمووماڵو سامانە هاوبەشەکە (هەموو بەشەکان)، وەکو یەك ماڵ زەکاتی لێ دەردەکرێت.

**بڕگەی دووەم:**

بۆ پێویست بوونی زەکات لە ماڵی هاوبەشدا، پێویستە پەیڕەویی ئەم خاڵانـەی خوارەوە بکرێت:

**خاڵی یەکەم:**

پێویستە هەموو خاوەن ماڵەکان کە بەشدارن لەو ماڵە هاوبەشەدا، موسڵمان بن ﴿لە پەیڕەوانی ئایینی ئیسلام بن﴾.

**خاڵی دووەم:**

لـە کاتێکـدا کـە بەشـی هـەر یـەکێك لـە هاوبەشـەکان دیـارو زانـراو بـوو لـە ماڵـە هاوبەشەکەدا، بارێکی وەهاش نەڕەخسا کـە ببێتـە هـۆی جیاکردنـەوەی ماڵەکـە وەکو ئەم شێوانەی خوارەوە:

**شێوەی یەکەم:**

ئەگەر لە مێگەلی مالاّتی هاوبەشدا، شوێنی ئاو خواردنەوەو لەوەڕگاو شوان و جێگەی دۆشین و جێگەی شەوو نێرییان یەك بێت.

**شێوەی دووەم:**

لە ماڵی بازرگانی هاوبەشدا، دوکان و پاسەوان و مەن پێوو تەرازوو کێشکردن و کیسەو قاسەو هەڵگرتنی پارە یەك بێت.

**شێوەی سێیەم:**

لە کشتوکاڵی هاوبەشدا ئاودێریی و دروێنەکەرو خەرمان یەك بن و، لە میوەی هاوبەشدا پەرژین و باخ و شوێنی وشك کردنەوەی میوەکە یەك شوێن بێت.

**خاڵی سێیەم:**

لەهەر سامانێکدا کە پێویست بێت بۆ زەکاتدان ساڵی بەسەردا تێپەڕێت، دەبێت هاوبەش کردنی بەشدار بووەکان لەماوەی ساڵ کەمتر نەبێت.

**خاڵی چوارەم:**

لە بەروبوومی کشتوکاڵدا پێویستە هاوبەشکردنی بەشداربووەکان لە سەرەتای چاندنی کشتوکاڵەکەوە هەتا کاتی کۆکردنەوەی بێت.

**خاڵی پێنجەم:**

لەبەروبوومی میوەی هاوبەشدا، پێویستە هاوبەشکردنی بەشداربووەکان بەلای کەمەوە لە سەرەتای پێگەیشتنی میوەکەدا بێت.

**خاڵی شەشەم:**

لە مێگەلی مالاّتی هاوبەشدا، پێویستە مالاّتەکان لەیەك جۆر بن، یان لە دوو جۆری وەهابن کە زەکاتدانیان لەیەکەوە نزیك بێت وەکو مەڕو بزن.

**خاڵی حەوتەم:**

هەر کاتێك ئەو پێنج خاڵەی سەرەوە جێبەجێ نەکرا، ئەوا ماڵەکە وەکو زەکاتی ماڵی هاوبەش مامەڵەی لەگەڵدا ناکرێت.

### بڕگەی سێیەم:

لە هەموو شێوازێكی ماڵی هاوبەشدا بەشەكان دیاربن یان دیار نەبن، هەتا ماڵەكە نەگاتە ئەندازەی پێویستبوونی زەكات دان، زەكاتی لێ وەرناگیرێت و بۆ زیاتر ڕوون كردنەوەش پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەكرێت:

#### خاڵی یەكەم:

ئەگەر ماڵەكە گەیشتە ئەندازەی پێویستبوونی زەكات دان، ئەوا بەپێی زەكاتدانی جۆری ماڵەكە زەكاتی لێ دەردەكرێت.

#### خاڵی دووەم:

ئەگەر ماڵەكە نەدەگەیشتە ئەندازەی پێویستبوونی زەكات، بەڵام یەكێك لە هاوبەشە بەشداربووەكان (یان هەر یەكێك لە هاوبەشە بەشدار بووەكان) كە ماڵ و سامانی تری هەبێت، ئەوا ئەو بەشەی خۆی لە ماڵە هاوبەشەكە دەخرێتە پاڵ ماڵ و سامانەكەی خۆی بۆئەوەی هەموو ماڵ و سامانەكەی بەیەكەوە بگاتە ئەندازەی پێویستبوونی زەكات، ئەوسا هەموو ماڵەكەی خۆی كە هەیەتی بەیەكەوە لەگەڵ بەشە هاوبەشەكە زەكاتی لێ دەدات.

### بڕگەی چوارەم:

لە كاتێكدا كە(بیت المال) هەبێت، هەموو بڕە زەكاتی ماڵە هاوبەشەكە دەدرێت بە(بیت المال)و، ئەگەر (بیت المال) نەبوو، ئەوا هەر یەكێك لە هاوبەشە بەشداربووەكان دەتوانێت بڕە زەكاتی دیاریكراوی خۆی دابەش بكات، بەسەر ئەو هەشت پۆلانەی كە زەكاتیان دەدرێتێ.

## زەكاتی ماڵی تالأنكراو

وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِنْ كُنْتُمْ آمَنْتُمْ بِاللَّهِ....(٤١)(الانفال)

﴿بشزانن هەر شتێكتان (لە كاتی جەنگدا) دەستكەوت، ئەوە بەدڵنیاییەوە پێنج یەكی ئەوماڵە (دەستكەوتوە) بۆ خواو پێغەمبەرو كەس‌وكاری پێغەمبەرو هەتیوو هەژارو ڕێبوارانە، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخوا هێناوە﴾.

### بڕگەی یەكەم:

پێویستە ئەو ماڵە بە تالأن هێنراوە لە شەڕی نێوان موسڵمانان‌و بێباوەڕەكاندا دەستكەوتبێت، بۆ زیاتر ڕوون كردنەوە پێویستە پەیڕەوی ئەم خالأنەی خوارەوە بكرێت:

### خاڵی یەكەم:

دەبێت ئەو شەڕە كە دەكرێت لەپێناوی خواو ئایینە پیرۆزەكەیدا بێت‌و، بە هیچ شێوەیەك نابێت لەپێناوی نەتەوەیەك یان سەركردەیەك یان دەستەیەكدا بێت.

### خاڵی دووەم:

ئەو شەڕە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ گەل‌و نەتەوەی موسوڵماندا ناكرێت، ئەگەر كراش دەستدرێژی كردنە بۆسەر ڕێزو حورمەتی هەموو مووسڵمانان، ئەو ماڵەش كە دەست دەكەوێت ناچێتە ڕیزی ماڵی تالأنكراو، دەبێت ماڵەكە بۆ خاوەنەكانی بگەڕێنرێتەوەو دەستدرێژكەریش سزا بدرێت.

### بڕگەی دووەم:

هیچ ماڵێكی تالأنكراو ئەندازەی گەیشتن بە زەكاتدانی نیە، واتە ئەوەی كە هێنراوە زەكاتی لیَ وەردەگیرێت.

### بڕگەی سێیەم:

بڕی زەكاتی پێویست لە ماڵی تالأن كراودا (١/٥)پێنجیەكی ماڵەكەیە، لەلایەن ئەو كەسەوە دەدرێت كە ماڵە تالأن كراوەكەی هێناوە.

## بڕگەی چوارەم:

بۆ دابەشکردنی ئەو پێنجیەکەی زەکاتی ماڵی تالآن کراو، پێویستە پەیڕەویی ئەم بەشانەی خوارەوە بکرێت:

### بەشی یەکەم:

لە ڕێگەی خواو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)خەرج دەکرێت.

### بەشی دووەم:

بۆ کەس‌وکاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) (لە نەوەکانی هاشم‌و عبدالمطلب) خەرج دەکرێت، کە بڕگە یاساییەکانی زەکاتی ماڵ‌و سامانەکان نایانگرێتەوە، ئەم زەکاتە فەقیرو دەوڵەمەندەکانیان دەگرێتەوەو، نێرینەیان دوو ئەوەندەی مێینەکانیانی دەدرێتیٚ‌و، بەری مێیەکانیان ئەم یاسایە نایانگرێتەوە ئەگەر لە نەوەکانی(هاشم وعبدالمطلب) نەبن.

### بەشی سێیەم:

بۆ هەتیوە بیٚ باوکەکان خەرج دەکرێت، کە بڕگە یاساییەکانی زەکاتی ماڵ‌و سامانەکان نایانگرێتەوەو، لە سنووری یاسای هەتیوی دان.

### بەشی چوارەم:

بۆ ئەو موسوڵمانە لاتانە خەرج دەکرێت، کە لە ماڵ‌و سامانی دنیا هیچیان نیە.

### بەشی پێنجەم:

بۆ ئەو ڕێبوارانە خەرج دەکرێت کە لە گەشتدان‌و بەم وڵاتەدا تێدەپەڕن، یان لەم وڵاتەوە دەیانەوێت گەشتێك ساز بکەن بۆ سەردانی خزم‌و دۆستان یان بۆ فێربوونی پیشەو زانستێك، ئەم بڕگەیە ئەو ڕێبوارانە ناگرێتەوە کە بەڕەڵآن‌و بە بێکاری دەسوڕێنەوە یان گەشتەکەیان بۆ کاری خراپەیە.

## یاسای ئەو سامانەی بەبێ شەڕ دەکەوێتە دەست موسوڵمانان

### بڕگەی یەکەم:

ئەگەر بێباوەڕان لە ترسی موسوڵمانان سەرو ماڵی خۆیان جێهێشت و هەڵاتن، ئەوا هەموو ماڵ و سامانەکانیان دەبێت بە هی خواو پێغەمبەرو(صلی الله علیه وسلم) کەس وکاری پێغەمبەرو هەتیوو هەژارو ڕێبواران، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلا رِكَابٍ (٦)الحشر

﴿ئەو ماڵ و سامانەی ئەوان (بەنو نەزیر) کە خوا بۆ پێغەمبەری گێڕاوەتەوە، ئێوە هیچ نارەحەتیەکتان پێوە نەدی بوو، نە بە سواری ئەسپ و نە بە سواری حوشتریش بە پەلە نەیگەیشتوونێ، (ئەو دەسکەوتە شەڕی تێدا نەکرا)﴾.

### بڕگەی دووەم:

ئەو سامانەش کە بەبێ شەڕ لە بێباوەڕان دەست دەکەوێت، وەکو سەرانەو دەیەکی بازرگانی و ماڵی کەسێکی ناموسوڵمان کە لە وڵاتی ئیسلامدا بمرێت و میراتگری نەبێت، هەموو ئەم ماڵانە دەکرێن بە پێنج بەشەوە بۆ خەرجکردنی لەڕێی خواو پێغەمبەرو(صلی الله علیه وسلم) کەس وکاری پێغەمبەرو هەتیوو هەژارو ڕێبواران، بەڵام ئێستا کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەژیاندا نەماوە، کەس نیە میراتی بگرێت، بۆیە دەخرێتە خەزێنەی موسوڵمانانەوە، تەنانەت لەسەردەمی خۆشیدا ڕازی نەبووە کە سامانەکەی بەسەر میراتگرەکاندا دابەش بکرێت.

(پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ئەوەی جێم هێشتووە خێرو خێراتە نە دینارو نە درهەمێکی لێ بەش ناکرێت، ئەوە خەرجی ئافرەتەکانمەو بژێوی ئەو کەسانەیە کە لە کۆکردنەوەی زەکاتدا کارم بۆ دەکەن). (١٠١)

## زەکاتیماڵی بە بارمتە دانراو (ڕەهن کراو)

### بڕگەی یەکەم:

هەموو ماڵ‌و سامانێکی بە بارمتە داندراو لەو جۆرانە بێت کە زەکاتیان لێ وەردەگیرێت‌و، خودی ماڵە بە بارمتە داندراوەکە یان لەگەڵ ماڵ‌و سامانەکەی تری خاوەنەکەیدا بگاتە ئەندازەی پێویست بوونی زەکات، ئەوا زەکات پێویست دەبێت لەسەر ئەو ماڵە بە بارمتە داندراوەو، ئەوەی کە دەمێنێتەوە دوای ئەوەی کە زەکاتەکەی لێ دەرکرا دەبێتەوە ماڵی بە بارمتە داندراو.

### بڕگەی دووەم:

کاتی پێویست بوونی زەکاتی ماڵە بە بارمتە داندراوەکە هیچ پەیوەندیەکی نیە بە کاتی گرێبەستی نێوان هەردووك لایەنەکەوە، بەڵکو ماڵە بارمتەکراوەکە لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا زەکاتەکەی لێ دەدرێت‌و، ماڵە بارمتەکراوەکە وەکو هەموو ماڵ‌و سامانێکی تری ئەو کەسە دادەندرێت کە ماڵەکەی خۆی خستۆتە بارمتەوە بەرامبەر پێداویستیەك بۆ کاتێکی دیاریکراو.

### بڕگەی سێیەم:

هەر ماڵێکی بارمتەکراو ئەگەر کەوتە بەر دەسەڵاتی بڕگەی یەکەمەوەو چەند ساڵ پێشتر زەکاتی نەدرابێت، ئەوا بڕە زەکاتی هەموو ساڵەکان دەبێت بە قەرز بەسەر خاوەنەکەیەوە.

**ڕوونکردنەوە:** کەسێك پێویستی بە بڕێکی چاك لە ماڵ‌و سامان هەیەو داوای قەرزێك دەکات، خاوەن پارە داوای بارمتەیەکی لێ دەکات بۆئەوەی وەرگرتنەوەی قەرزەکەی مسۆگەر بکات لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا، بۆیە ئەو کەسەی کە قەرزەکەی وەرگرتووە ناتوانێت ئەم بارمتەیە بفرۆشێت تا قەرزەکەی نەداتەوە، بەڵام بارمتەکەش هەر لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا دەمێنێتەوەو، ئەو کەسەی کە قەرزەکەی داوە هیچ مافێکی نیە بەسەر داهاتی ئەو بارمتەیەوە، بۆیە زەکاتی ئەو ماڵە بارمتەکراوە دەکەوێتە ئەستۆی

خاوەنەکەیەوە، هەر قازانجێك لەوماڵە بارمتەکراوە بکەوێتە دەست قەرزدەرەکە، ئەوا مامەڵەکە لە یاسای(رهن)ماڵی بارمتە داندراو دەچێتە دەرەوەو دەکەوێتە بەر زەبری یاساکانی ڕیبا.

## سەر فترەو خێرو خێرات

## سەرفترە

**بڕگەی یەکەم:**

ئەندازەی پێویستی سەرفترە بۆ هەر مرۆڤێك (١)یەك (صاع)ە لە پێژیوێك کە لە شوێنی پێویست بوونی سەرفترەکەدا لە هەموو پێژیوەکانی تر زیاتر بەکاربهێنرێت.

(صاعێك) = ٢٤٢٦,٦ گرام (واتە نزیکەی ٢,٥ کیلۆ).

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) زەکاتی سەرفترەی لەسەر موسوڵمانان بە(صاعێك) لە خورما یان جۆ پێویست کردوە، ئەو موسوڵمانە بەندە بێت یان ئازاد بێت گەورە بێت یان بچووك، نێربێت یان مێ، فەرمانیشی کردووە پێش ئەوەی خەڵکی لەماڵەکانیان بچنەدەرەوە بۆ نوێژی جەژن ئەو سەرفترەیە بدرێت).(١٠٢)

**بڕگەی دووەم:**

سەرفترە لەسەر گەورەو بچووکی موسوڵمانان پێویست دەبێت دوای خۆرئاوابوونی دوارۆژی مانگی ڕەمەزان، (واتە کەسێك پێش تەواوبوونی مانگی ڕەمەزان بمرێت، ئەگەر بە کاتێکی کەمیش بێت سەرفترەی لەسەر نیەو، کەسێك دوای تەواوبوونی مانگی ڕەمەزان لە دایك ببێت، ئەگەر بە کاتێکی کەمیش بێت سەرفترەی لەسەرنیە).

**بڕگەی سێیەم:**

سەرفترە پێژیوێکە بۆ فەقیرو هەژاران، بۆئەوەی ڕۆژی جەژن بەبێ خواردن نەمێننەوە، بۆیە قەدەغەیە دوابخرێت بۆ دوای نوێژی جەژن.

**برگەی چوارەم:**

بۆ مەرجەکانی پێویستبوونی سەرفترە، پێویستە پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت:

**خاڵی یەکەم:**

پێویستە ئەو کەسەی سەرفترەکە دەدات پێداویستی و پێژێوی شەوو ڕۆژی جەژن و زیادەی هەبێت لە ئەندازەی دەستەجلێك بۆخۆی و هەموو ئەوانەی لەژێر سایەی ئەودان، وەکو ژن و باوك و دایك و کوڕو کچ و، خزمەتکاری خۆی و کارەکەری ژنەکەی، ئەگەر بە نانەزگی و بێ بەرانبەر کاریان دەکردو، ژنی تەڵاقدراوی دووگیانیش بە تەڵاقی (رجعی)یان بەتەڵاقی(بائن).

**خاڵی دووەم:**

پێویستە ئەو کەسە زیادەی هەبێت لە کرێی خانوو ئەگەر لە خانووی بەکرێدا بوو، هەروەها پێویستە زیادەی هەبێت لە ئەندازەی قەرزێك کە وادەی دانەوەی هاتبێت.

**برگەی پێنجەم:**

ئەگەر کەسێك لات بوو، بەڵام ژنەکەی دەوڵەمەند بوو، ئەوا پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکرێت:

**خاڵی یەکەم:**

ئەو ئافرەتە سەربەستە لەوەی کە سەرفترەی خۆی بدات یان نەیدات، چونکە ئەو ئافرەتە لەژێر سایەی مێردەکەی دایەو، لەم کاتەشدا مێردەکەی لاتە.

**خاڵی دووەم:**

پێویستە لەسەر ئەو ئافرەتە سەرفترەی منداڵی هەژاری خۆی و سەرفترەی کارەکەرەکەشی بدات کە بە نانەزگی و بەبێ بەرانبەر کاری بۆ دەکات.

**برگەی شەشەم:**

کەسی خاوەن ماڵو سامان، لەسەری پێویست نیە سەرفترەی کوڕو کچی دەوڵەمەندی خۆی بدات(جا خۆیان ناسیبێت یان خۆیان نە ناسیبێت)، لەبەرئەوەی ئەوانە دەوڵەمەندنو سەرفترەکەیان لەسەر خۆیانە.

**بڕگەی حەوتەم:**

لەسەر باوك پێویست نیە سەرفترەی بووکەکەی (ژنی کوڕێکی هەژاری) خۆی بدات، مەگەر بە ڕەزامەندیی بووکەکەی.

**بڕگەی هەشتەم:**

لەسەر کوڕ پێویست نیە سەرفترەی باوەژنی (زڕ دایکی)بدات، مەگەر بە ڕەزامەندی باوەژنەکەی.

**بڕگەی نۆیەم:**

لەسەر برا پێویست نیە سەرفترەی خوشکی هەژاری خۆی بدات، مەگەر بە ڕەزامەندیی خوشکەکەی، ئەم بڕگەیە بە پێچەوانەشەوە کاری پێ دەکرێت.

**بڕگەی دەیەم:**

لەسەر هەژارێك پێویست نیە بۆ سەرفترە قەرز بکات، هەرچەندە بە پارەی ئەم قەرزەش سەرفترەکە دادەمەزرێت.

**بڕگەی یازدە:**

ئەگەر کوڕێکی هەژار سەری خۆی هەڵگرتو دیارنەماو هیچ هەواڵێکی لەبارەیەوە نەدەزانرا، ئەوا پێویستە تا هەواڵێکی لێوە دەزانرێت باوکەکەی سەرفترەکەی بۆ بدات.

**بڕگەی دوازدە:**

هەر کەسێك دەسەڵاتی نەبوو بە یەکجار سەرفترەی هەموو ئەوانە بدات کە لەژێر سایەی دان، ئەوا لە سەرەتاوە سەرفترەی خۆی دەدات، ئینجا هی ژنەکەی، ئینجا هی منداڵە بچووکەکانی، ئینجا هی باوکی، ئینجا هی دایکی، ئینجا هی منداڵە گەورەکانی.

**بڕگەی سێزدە:**

**هەر کەسێك لە توانایدا نەبوو سەرفترەی خۆی و ئەوانەی لەژێر سایەی ئەودان لەیەك جۆر پێژیو بدات، ئەوا بۆی هەیە سەرفترەی خۆی لە جۆرە پێژیوێك و هی ژنەکەی لە جۆرە پێژیوێکی تر بدات، ئەگەر ئەم کەسە لەو کاتی سەرفترەدا لەنێو ماڵ و منداڵەکەی خۆیدا نەبوو دەتوانرێت هەریەکەیان پێژیوی ئەو شوێنە بدەن لە زەکاتی سەرفترە.**

**بڕگەی چواردە:**

**سەرفترەی بەندە(عبد) لەسەر خاوەنەکەیەتی.**

**بڕگەی پازدە:**

**دروستە لە جیاتی پێژیو پارە بخەمڵێنرێت بەپێی نرخ و ئەندازەی ئەم بڕە پێژیوەی کە دیاریکراوە بۆ زەکاتی سەرفترە لەوکاتەدا کە سەرفترەکە پێویست دەبێت لەسەر موسوڵمانان.**

**ڕوونکردنەوە: خەملاندنی بڕی ئەوپارەیەی کە لەجیاتی ئەندازەی بڕە زەکاتی سەرفترە دیاری دەکرێت، لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر دەگۆڕێت بەهۆی نرخی ئەو پێژیوە لەو ساڵەدا، ئەم خەملاندنە لەلایەن زانایانی ئیسلامەوە بەپێی نرخی ئەم بڕە زەکاتە لەو ڕۆژەدا دیاری دەکرێت.**

**﴿ئەم خەملاندنە وا لەو هەژارو بێ دەرامەتانە دەکات، بە ئەندازەی پارە خەملێنراوەکە بە ئارەزووی خۆیان پێژیوی ڕۆژی جەژنی پێ بکڕن و، ناچاری خواردنی تەنها خورماو جۆ نەبن﴾.**

## خێرو چاکەکردن

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەو شەوەی کە شەوڕۆییم پێ کرا (بۆ عەرشی پەروەردگار)، بینیم لەسەر دەرگای بەهەشت نوسرابوو: خێرو چاکەکردن بە دە ئەوەندە پاداشتیان دەدرێتەوەو قەرزدانیش بە هەژدە ئەوەندە).(١٠٣)

واتە خێروچاکەیەك کە لەلایەن خواو پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) لەسەر موسوڵمانان پێویست نەکرابێت، یان خێروچاکەیەك کە لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەری مەزن بێت(صلى الله عليه وسلم) ئادەمیزاد سەربەستە لەوەی بیکات یان نەیکات، بەڵام کردنەکەی ڕەزامەندیی خواو پێغەمبەری پێوەیەو ڕاستکردنەوەی باری کەوتووی هەژارو لێقەوماوانیشە، خێروچاکە کردن تایبەت نیە تەنها بە موسوڵمانەکانەوە بەڵکو تێکڕای مرۆڤایەتی و زیندەوەران و دروستکراوە دیارو نادیارەکانی پەروەردگار دەگرێتەوە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، خێرو چاکە بکەن ئەگەر لە خشڵەکانی خۆشتان بێت).(١٠٤)

### بڕگەی یەکەم:

مرۆڤی موسوڵمان بۆ خێروچاکە کردن ناچار ناکرێت، لەبەرئەوەی لەلایەن خواو پێغەمبەرەوە لەسەری پێویست نەکراوەو لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەری مەزنمانە(صلى الله عليه وسلم)، گونجاوە هەژارو دەوڵەمەند، موسوڵمانان و(ئەهلی کتاب) پەیڕەوانی ئایینەکانی پێش ئیسلام و ئەو بێباوەڕانەش کە لەژێر سێبەرو سایەی دەسەڵاتی ئیسلامدا دەژین، کەڵکی لێ وەربگرن.

### بڕگەی دووەم:

خێرو چاکەکردن بەنهێنی یان بە ئاشکرا لە هەموو کاتێکدا لە لایەن پەروەردگارەوە پاداشتی خۆی هەیە، بەتایبەتی لە مانگی ڕەمەزاندا بۆ خزم و دراوسێ و هەژارو لێقەوماوان.

إِن تُبْدُواْ الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاء فَهُوَ خَيْرٌ لُّكُمْ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّئَاتِكُمْ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٢٧١)البقرة

﴿ئەگەر خێرو چاکەکانتان بەدەرخەن ئەوە کارێکی چاکەو، ئەگەر بشیان شارنەوەو بە نهێنی بیاندەن بە هەژاران، ئەوە بۆ ئێوە پاداشتی چاکترەو، تاوانەکانتانی پێ لادەچن، خواش زاناو شارەزایە بەوەی کە ئێوە دەیکەن﴾.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەوکەسەی کە خێروچاکە دەکات، دەبێت ژیانی خۆیوماڵو منداڵو دایكو باوکی دابین کردبێت، ئەوسا خێروچاکەکە بکات.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەوکەسەی کە خێروچاکە دەکاتو قەرزدارە، دەبێت لەپێشدا ئەرکەکەی سەرشانی جێبەجێ بکاتو، تەواوی قەرزەکە بداتەوە، ئینجا خێروچاکەکە بکات، لەبەرئەوە خێروچاکە لەم بارەدا قەدەغەیە.

**بڕگەی پێنجەم:**

خێروچاکە بەو کەسە دەدرێت کە خۆی داوای یارمەتی دەکات، یان کەسێك هیچی نییەو لەڕووی نایەت داوای یارمەتی بکات، بەتایبەتی کەسایەتی بە سەنگی لێقەوماوو خەڵکی پیرو خاوەن خێزانو کەسانی زانا، کە بوونیان بۆ ئاینو مرۆڤایەتی قازانج بێت، بەمەرجێك خێرو چاکەکردنەکە تەنها بۆ ڕەزامەندیی خوای گەورە بێت، نەك لەبەر بەرژەوەندییەکی تایبەتی ئەو کەسە کە خێروچاکەکە دەکات.

**بڕگەی شەشەم:**

هەموو کارێکی چاك، کە ئادەمیزاد دەیکات، خێرو چاکەکردنە، هەر یەکەیان بە ئەندازەی خۆی لەلایەن پەروەردگارەوە پاداشتی هەیە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەموو کارێکی باش خێرو سەدەقەیە).(١٠٥)

بۆ زیاتر ڕوونكردنەوەی ئەم بڕگەیە پەیڕەوی ئەم خالأنەی خوارەوە دەكرێت:

**خاڵی یەكەم:**

دروستكردنی مزگەوت بەمەرجێك خواپەرستیی تێدا بكرێت، ئەوا لە ژیانی دنیادا چەند كەس كەڵك لەو مزگەوتە وەربگرن بۆ خواپەرستی، ئەوەندە خێرو چاكەش بۆ ئەوكەسە دەنووسرێت كە ئەو مزگەوتەی دروست كردووە، هەتا ئەو مزگەوتەش هەبێت، ئەم خێرە بەردەوامە بۆ خاوەنەكەی دوای مردنیشی.

**خاڵی دووەم:**

دروستكردنی قوتابخانەیەك بەمەرجێك بۆ فێركردنی ئادابی دین و زانست و خۆشەویستی نیشتیمان بێت، ئەوا لە ژیانی دنیادا چەند قوتابی كەڵك لەو قوتابخانەیە وەربگرن بۆ فێربوونی زانستەكان، ئەوەندە خێروچاكەش بۆ ئەوكەسە دەنووسرێت كە ئەو قوتابخانەیەی دروستكردوە، هەتا ئەو قوتابخانەیە هەبێت، ئەو خێروچاكەیە بەردەوامە بۆ خاوەنەكەی دوای مردنیشی.

**خاڵی سێیەم:**

دروستكردنی نەخۆشخانەیەك بۆ مرۆڤ یان ئاژەڵ یان باڵندە، ئەوا لە ژیانی دنیادا چەند نەخۆش كەڵك لەو نەخۆشخانەیە وەربگرن بۆ چارەسەری نەخۆشیەكانیان، ئەوەندە خێروچاكەش بۆ ئەوكەسە دەنووسرێت كە ئەو نەخۆشخانەیەی دروست كردووە، هەتا ئەم نەخۆشخانەیەش هەبێت بۆ چارەسەری نەخۆشەكان، ئەم خێرو چاكەیەش بەردەوامە بۆ خاوەنەكەی دوای مردنیشی.

**خاڵی چوارەم:**

دروستكردنی پردو ڕێگاوبانێك بەمەرجێك بۆ ئاوەدان كردنەوەی وڵات بكرێت نەك بۆ شەڕو ئاژاوەو كاولكاری، ئەوا لە ژیانی دنیادا چەند كەس كەڵك لەو پردو ڕێگاوبانە وەربگرن بۆ مەبەستی ئاسانكاری هاتوچۆكردنیان ئەوەندە

خێرو چاکەش بۆ ئەوکەسە دەنووسرێت کە ئەو پردو ڕێگاوبانەی دروستکردووە، هەتا ئەم پردو ڕێگاوبانەش هەبن بۆ ئاسانکاریی هاتوچۆ، ئەم خێروچاکەیەش بەردەوامە بۆ خاوەنەکەی دوای مردنیشی.

**خاڵی پێنجەم:**

هەڵکەندنی بیرێك کە ئادەمیزادو ئاژەڵ و ڕووەك و هەمووخاوەن گیانێك کەڵکی لێ وەربگرێت، ئەوەندە خێروچاکەش بۆ ئەوکەسە دەنووسرێت کە ئەم بیرەی وەکو خێرو چاکەیەك هەڵکەندووە، هەتا ئەو بیرەش هەبێت ئەو خێرو چاکەیەش بەردەوامە بۆ خاوەنەکەی دوای مردنیشی.

**خاڵی شەشەم:**

پەروەردەکردنی منداڵێك بە پەروەردە کردنێکی ڕێك ودروست بۆئەوەی لە پاشەڕۆژدا ببێت بە نموونەی چاکە کردن و پیاوەتی، ئەوا هەموو ئەو خێرو کردەوە چاکانە کە ئەو منداڵە دەیکات لە درێژایی ژیانیدا بۆ باوکەکەش دەنووسرێت و لە ڕێگەی باوکەکەشەوە بۆ هەموو باپیرانی دەنووسرێت کە پشت بە پشت کاریگەرییان لەم چاکەکاریەدا هەبووەو، ئەم خاڵە بە پێچەوانەشەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

**خاڵی حەوتەم:**

چاپ کردنی قورئانی پیرۆز، یان کتێبێکی یاساکانی ئیسلام یان فەرموودەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، یان باس و بەسەرهاتی ژیانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەربێت)، یان هەر کتێبێکی زانستیی سوودی بۆ مرۆڤایەتی هەبێت، یان کتێبێکی مێژوویی ڕاستیەکان بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە، ئەوا هەتا ئەو کتێبانە هەبن و کەڵکیان لێ وەربگیرێت ئەوەندە خێرو چاکەش بۆ ئەوکەسە دەنووسرێت کە ئەم کتێبانەی چاپ کردوون، دوای مردنی خاوەنەکەشیان، ئەم خاڵە بە پێچەوانەشەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

**خاڵی هەشتەم:**

فێرکردنی خەڵکی بە زانستێك یان داهێنانێکی زانستی یان پیشەیەك کە خزمەت بە مرۆڤایەتی بگەیەنێت، چەند کەڵك لەم زانستو داهێنانە زانستیە وەربگیرێت ئەوەندە خێرو چاکەش بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێت لەلایەن پەروەردگارەوەو، هەتا کەڵکیان لێ وەربگیرێ، خێرو پاداشتەکەش بەردەوامە دوای مردنی خاوەنەکانیشیان، ئەم خاڵە بە پێچەوانەشەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

**خاڵی نۆیەم:**

فرێدانی هەر پاشماوەیەك کە نەبێتە هۆی پیسبوونی ژینگەو لە پێکهاتەکەیدا خۆراکێکی تێدا بێت بۆ باڵندەو ئاژەڵە کێویەکانو گیانەوەرانی ناو زەوی، لەڕێگەی خوادا بۆ ئەم مەبەستە فڕێ بدرێت، جا ئاو بێت یان خۆراك، ئەوا هەر باڵندەو ئاژەڵێك چەند کەڵك لەم ئاوو خۆراکە فڕێدراوە وەربگرێت، ئەوەندە خێرو چاکەش بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێت.

**بڕگەی حەوتەم:**

ئەندازەو کاتی خێرو چاکەکردن دیاریکراو نییەو تایبەت نیە بە شوێنێکی دیاریکراوەوە، بەڵکو بەئارەزووی ئەوکەسەیە کە خێروچاکەکە دەکات لە هەر خاكو وڵاتێکدا بێت یان لەنێو هەر گەلو نەتەوەیەکدا بێت، ئەگەر بە نهێنی بکرێتو تەنها بۆ ڕەزامەندی پەروەردگار بێت پاداشتی زیاترە، مەگەر ئەوکەسەی کە خێروچاکەکە دەکات مەبەستی ئەوەی هەبێت کۆمەڵانی خەڵکی چاو لەو بکەنو خێروچاکە زۆرتر بدرێت بە هەژارو کەم دەرامەتەکان.

**بڕگەی هەشتەم:**

جێبەجێ کردنی ئەرکە کۆمەڵایەتیەکان لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵەوە لەلای پەروەردگار وەکو خێروچاکە دەنووسرێن بە مەرجێك لە سنووری ڕێگە پێدراو تێنەپەڕن، وەکو سەردانی نەخۆشو سەرەخۆشی کردنی مردوو، دڵدانەوەی خەڵکی لاتو هەژارو زەرەر پێکەوتوو، دڵخۆشکردنی کەسێك بە هەواڵێکی

خـۆش، لادانـی بـەردێك لەسـەر ڕێگـەی گشـتی یـان تایبـەتی، ڕاسـتكردنەوەی هەڵەیـەكی كۆمەڵایـەتی لـەنێو كۆمەڵـداو ئاشـتكردنەوەی دوو كـەس یـان دوو خێزان یان دوو كۆمەڵ، دڵدانەوەی منداڵی(هەتیو)ی بێ باوك.

**بڕگەی نۆیەم:**

خێروچاكە كردن تەنها بۆ ڕەزامەندی پەروەردگار، مرۆڤ دەپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ، هەرچەند خێروچاكە كردنەكە لەتە خورمایەك یان وتەیەكی خۆشیش بێت.

**(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەریەكێك لە ئێوە ئەگەر بۆی بكرێت خۆی لە ئاگر بپارێزێت ئەگەر بە بەخشینەوەی لەتە خورمایەكیش بێت، با بیكات).**(١٠٦)

**بڕگەی دەیەم:**

هەر هەڵوێستەیەكی چاك لە دەروونی ئادەمیزادا كە بەرژەوەندیی گشتی تێدا بێت، لەلایەن پەروەردگارەوە بە چاكەیەك بۆ خاوەنەكەی دەنووسرێت، جا ئەگەر هاتوو ئەوكەسە ئەم هەڵوێستەی خۆی بەڕاستی جێبەجێ كرد، ئەوا چاكەیەكی تر لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ خاوەنەكەی دەنووسرێت.

**بڕگەی یازدە:**

هەر هەڵوێستەیەكی خراپ لە دەروونی ئادەمیزادا كە بەرژەوەندیی گشتی تێدا نەبێت، هیچ خراپەكارییەك لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ ئەو ئادەمیزادە نانووسرێت تا هەڵوێستەكەی بە ئەنجام دەگەیەنێت، ئەوسا تەنها یەك خراپەی بۆ دەنووسرێت، ئەگەر هاتوو لە هەڵوێستەكەشی پەشیمان بۆوە، ئەوا لەلایەن پەروەردگارەوە چاكەیەكی بۆ دەنووسرێت وەكو پاداشتێك بۆ گەڕانەوەی بۆسەر ڕێگای ڕاست.

**بڕگەی دوازدە:**

داواكــــردنو هانــــابردن بـــۆ پـــەروەردگارو يادكردنـــەوەو ناوهێنـــانی نـــاوە پیرۆزەكـــانیو قوڵبوونـــەوەو بیركردنـــەوە لـــە چـــۆنیەتیی دروســـتكردنی دروســتكراوەكانی هـــەر یەكـــەیان خێـــرو چـــاكەیە بـــۆ دەروونەكـــەی خـــۆتو پاداشتەكەش لای پەروەردگارە.

## بڕگەی سێزدە:

ئەگەر كەسێك ماڵو سامانی هەبوو فریانەكەوت خێروچاكەیەك بكاتو مرد، ئەوا ئەگەر كەسوكارەكەی خێروخێراتی بۆ بكەن پێی دەگات.

(پیاوێك هـات بـۆلای پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا دایكـم كتـوپڕ گیـانی خـۆی لەدەسـتداو مـرد، وەسیەتیشـی نـەكردوە، وا هەستدەكەم ئەگەر فریا كەوتبا قسە بكات، ئەوا وەسیەتی دەكرد خێروچاكەی بۆ بكرێت، جا ئایا ئەگەر من ئەو خێروچاكەیەی بۆ بكەم پاداشتی بۆ دەبێت؟ فەرمووی: بەڵێ).(١٠٧)

## بڕگەی چواردە:

هەر كەسێك خێروچاكەیەك بكات شایستەی ئەوەیە سەڵاوەتی لەسەر بدرێت.

(عبداللـەی كوڕی ئـەبی ئـەوفا دەڵـێ: پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) ئەگـەر قـەومێك سەدەقەكەیان بۆ هێنابا دەیفەرمو: اللهم صَلِّ عليهم).(١٠٨)

# بابەتی چوارەم

## بەڕۆژووبوون

واتە خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوەو پابەند بوون بە یاساو ئادابە ئیسلامیەکانەوە، هەروەکو چۆن کۆئەندامی هەرس خۆی لە خواردن و خواردنەوە گرتۆتەوە، بەهەمان شێوە دەبێت زمانیش خۆیشی لە قسەی بێ کەڵك بگرێتەوەو، نابێت باسی خەڵکی پێ بکرێت، چاوەکان دەبێت بەڕۆژووبن، نابێت تەماشای شتە قەدەغەکراوەکانیان پێ بکرێت، دڵەکان دەبێت بەڕۆژوو بن و، ملکەچ بن بۆ یادی خوا، گوێچکەکان دەبێت پابەندبن و گوێ لە لۆمەو لۆمەکاری خەڵکی نەگرن، جوولەی دەست و پەنجەو قاچەکان، دەبێت بۆ یادی خواو چاکەکاری بێت.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك خۆی نەگرێتەوە لە قسەی درۆو کارکردن پێی، ئەوا خوا پێویستی بەوە نییە کە ئەوکەسە تەنها خۆی لە خواردن و خواردنەوە بگرێتەوە). (١٠٩)

بەڕۆژووبوون لەلایەن خواوە بەسەر پەیڕەوانی ئایینەکان پێویست کراوە، مانگی ڕەمەزانیش بۆ بەڕۆژووبوونی پەیڕەوانی ئایینی ئیسلام کاتێکی دیاریکراوە، لەو مانگەشدا هیچ ڕۆژوویەکی تر ناگیرێت لەبەرئەوەی کاتەکەی تایبەت کراوە بە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر مانگی ڕەمەزان هاتەناوەوە، ئەوا دەرگای ئاسمانەکان دەکرێنەوەو دەرگاکانی جەهەنەم دادەخرێن و شەیتانەکانیش زنجیر دەکرێن). (١١٠)

ئەو خواپەرستیەی کە لەو مانگەدا دەکرێت تایبەتە بە پەروەردگارەوە، بۆیە پێغەمبەری مەزنمان دەفەرموێت:

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەرکەسێك شەوی قەدر بە باوەڕەوە لەپێناوی خوادا بمێنێتەوە، ئەوە لە هەموو هەڵەکانی ڕابردووی دەبوردرێت،

هەر کەسێکیش بە باوەڕەوە لە پێناوی خوادا ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت، لە هەموو هەڵەکانی ڕابردووی دەبوردرێت کە پێشتر کردوونی).(١١١)

بڕگەی یەکەم:

ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لەلایەن خواوە پێویست کراوە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی کامڵی عاقڵی پاکی بە توانای جێنیشین.

بڕگەی دووەم:

کەسی بێباوەڕ لەو ڕۆژەوە ڕۆژووی لەسەر پێویست دەبێت کە واز لە بێباوەڕیەکەی دێنێت و دێتەناو ئایینی ئیسلامەوە، ڕۆژووەکانی پێشتریشی نابنە قەرز بەسەریەوەو دەکەوێتە بەر لێبووردەیی پەروەردگار، هەروەك خوا دەفەرموێت:

قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ وَإِنْ يَعُودُوا فَقَدْ مَضَتْ سُنَّةُ الأَوَّلِينَ (٣٨)الانفال

﴿بەوانە بڵێ کە بێباوەڕ بوون: ئەگەر واز لە بێباوەڕیەکەیان بێنن، ئەوا خوا لە تاوانە ڕابردووەکانیان خۆش دەبێت، ئەگەر بگەڕێنەوە سەری، ئەوە بەدڵنیاییەوە (وادەو پەیمان بێت) ئەو شێوازەی بەسەر پێشینەکانمان هێناو تێپەڕی (بەسەر ئێوەشیدا دێنین)﴾.

بڕگەی سێیەم:

کەسێك کە موسوڵمان بێت پاشان بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی و دواتریش پەشیمان ببێتەوەو بێتەوە سەر ئایینی ئیسلام، ئەوا هەموو ڕۆژووە لە دەستچووەکانی ماوەی بێباوەڕیەکەی دەبن بە قەرز بەسەریەوەو دەبێت دواتر بیانگرێتەوە.

بڕگەی چوارەم:

منداڵێك کە خۆی نەناسیبێت یان کەسێك لەهۆش خۆی نەبێت یان کەسێکی شێت، ڕۆژوویان لەسەر نیە، بەڵام هەوڵ دەدرێت منداڵەکان لە حەوت ساڵیەوە فێری بەڕۆژووبوون بن بۆئەوەی لە کاتی خۆناسینیاندا ئاسان بێت لەسەریان.

(پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (پێنووس لەسەر منداڵ و شێت و کەسی نووستو هەڵدەگیرێت). (١١٢)

**بڕگەی پێنجەم:**

کاتی بەڕۆژووبوونتان مانگی ڕەمەزانە، کە قورئانی تێدا هاتۆتەخوارێ، کە ڕێگەی ڕەوشەنکراوەی خوایە بۆ ئادەمیزادەکان، بەڵگەی ڕوون کراوەن بۆسەر ڕێگەی ڕاست، بەڵگەی ڕوون کراوەن بۆ ئاشکراکردنی ڕاستی و ناڕاستیەکان، پێویستە موسوڵمانەکان لە سەرەتای یەکەم ڕۆژی مانگەکەوە نیەتی بەڕۆژووبوون بێنن، یان ئێواران دوای نوێژی خەوتنتان نیەتی بەڕۆژووبوونی بەیانی بێنن.

**بڕگەی شەشەم:**

کێ لە سەرەتای مانگەکەدا مانگی دیت، با بەڕۆژو بێت، ئەگەر ئەو ڕۆژە مانگ نەدیترا، ئەوە وا دادەنرێت ئەو ڕۆژە تەواوکاری مانگی شەعبانەو بۆ ڕۆژی دواتر یەکەم ڕۆژی ڕەمەزانە.

پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: بەهۆی بینینی مانگەوە بەڕۆژووبن و بەهۆی بینینی مانگیشەوە ڕۆژوەکانتان بشکێنن، جا ئەگەر وابوو لە سەرەتادا نەتان دیت، ئەوا مانگی شەعبان بکەن بە (٣٠)ڕۆژ. (١١٣)

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: مانگی بیست و نۆ شەوەی (شەعبان)، ئێوە بەڕۆژوو مەبن هەتا دەیبینن، جا ئەگەر لێتان دیار نەبوو، ئەوا مانگی شەعبان بکەن بە (٣٠)ڕۆژی تەواو). (١١٤)

**بڕگەی حەوتەم:**

کێ نەخۆش بوو یان لە سەفەر دابوو، با لە ڕۆژەکانی دوای ئەم مانگە ڕۆژوەکانی بگرێتەوە، بەم بەڕۆژووبوون و مۆڵەتدانە خوا ئاسانکاری بۆتان دەوێت، تەنگانەو ناڕەحەتی بۆتان ناوێت، ئەو ئاسانکاریەش بۆئەوەی ماوەی

دیاریكراوی بەڕۆژووبوونەكە تەواو بكەن، لە هەموو بارەكانیشدا بەڕۆژووبوون باشترە لەبەر پیرۆزی ئەو مانگە.

**بڕگەی هەشتەم:**

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لەیاسای بەڕۆژووبووندا، بەڕۆژووبوونتان لەسەر نووسراوە، هەروەكو چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوەش نووسرابوو، بەڵكو بەم بەڕۆژووبوونەتان لە خوا دەترسێن‌و خۆتان لە سزاكانی دەپارێزن.

**بڕگەی نۆیەم:**

﴿ڕۆژووگرتن چەند ڕۆژێكی ژمێرراوی لەدوای یەكن، جا هەر كەسێك لەئێوە لە كاتی بەڕۆژووبووندا نەخۆش بوو، یان لە سەفەر دابوو، ئەوا چەند ڕۆژ بەڕۆژوو نەبووە با لە ڕۆژەكانی مانگەكانی دواتر ڕۆژووەكانی بگرێتەوە.

(پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەلای كەسێكدا تێپەڕی لە سێبەری دارێكدا ئاویان پێدا دەكرد، فەرمووی ئەوە ئەو هاوڕێیەتان چیەتی؟ گوتیان: بەڕۆژووە ئەی پێغەمبەری خوا، جا فەرمووی ڕۆژووگرتن لە كاتی گەشت كردندا باش نیە، ئەركی سەر شانیشتانە ئەو مۆڵەتەی خوا قبوول بكەن كە مۆڵەتی پێداون (لەسەفەردا بەڕۆژوو نەبن)). (١١٥)

**بڕگەی دەیەم:**

یاساكەش لەسەر ئەوانەی بە درێژیی ماوەی بەڕۆژووبوونەكە ناتوانن بەڕۆژوو بن بەهۆی پیری تەمەنیانەوە یان بەهۆی نەخۆشیەوە، لەبری هەر یەك ڕۆژ ڕۆژووگرتن خواردنی هەژارێكیان لەسەرە بیدەن، ئافرەتی دووگیان‌و ئافرەتی شیردەریش ئەگەر ڕۆژووگرتنەكە كار بكاتە سەر خۆیان دەتوانن بەڕۆژوو نەبن‌و لە كاتەكانی تردا ڕۆژووەكە بگرنەوە، بەڵام ئەگەر ڕۆژووگرتنەكەیان تەنها كاریگەری لەسەر كۆرپەكەیان هەبوو، دەتوانن بەڕۆژوو نەبن‌و لەبری هەر ڕۆژوویەكیش خواردنی هەژارێك بدەن‌و لە كاتەكانی تردا ڕۆژووەكانیان بگرنەوە.

**برگەی یازدە:**

(جا کێ وەکو خۆ بەختکردن خێرێك بکات، لە خواردنی هەژارێك زیاتر بێت، ئەوە خێرەکە بۆخۆیەتی، لە هەموو بارەکانیشدا بەڕاستی ئەگەر ئێوە دەزانن کاتی ئەم بەڕۆژووبوونە چەند پیرۆزە، ئەوا بەڕۆژووبوونتان چاکترە بۆئێوە).

**برگەی دوازدە:**

شەوی ئەو ڕۆژەی کە تیایدا بەڕۆژوو دەبن، بۆتان ڕەواکراوە بچنەلای خێزانەکانتان، ئەوان پۆشاکن بۆئێوەو ئێوەش پۆشاکن بۆئەوان.

**برگەی سێزدە:**

لەدوای ڕۆژوو شکاندنەوە بۆتان هەیە بخۆن و بخۆنەوە هەتا لە بەرەبەیاندا هێڵی سپی ڕووناکی لە هێڵی ڕەشی تاریکایدا دەردەکەوێت.

**برگەی چواردە:**

لە بەرەبەیانیشەوە لەسەر ڕۆژووەکەتان بەردەوام بن تا شەو دادێت، لەکاتێکدا لەنێو مزگەوتەکانیشدا دەمێننەوە بۆ خواپەرستی نە بە شەوو نە بە ڕۆژ مەچنە لای خێزانەکانتان.

**برگەی پازدە:**

ئەو هۆکارانە کە کار لە ڕۆژووەکە دەکەن:

**یەکەم:** هەر تەماشاکردنێك دڵی مرۆڤ ببزوێنێت بەرەو کاری جووت بوون، ئەوە ڕۆژوەکە بەتاڵ دەکاتەوە، واتە خێرەکەی نامێنێ.

**دووەم:** گوێڕاگرتن لە شتێك کە خواپەرستی و قورئان خوێندن و نیشاندانی ڕێگەی ڕاست نەبێت بۆ خەڵکی، ئەوە ڕۆژوەکە بەتاڵ دەکاتەوەو خێرەکەی نامێنێ.

**سێیەم:** هەر قسەکردنێك دەربارەی قورئان و ئیسلام و چاکەکاریەکان نەبێت، لە بەهای ڕۆژووەکە کەم دەکاتەوە، کورد گوتەنی: زۆرگوتن قورئان خۆشە.

چوارەم: لەکاتی بەربانگدا هیچ پەردەیەك نامێنێت لەنێوان پەروەردگارو بەندەدەکەیدا، ئەوەی بەندە داوای بکات هەر بۆی جێبەجێ دەکات.

پێنجەم: خوێن بەربوون، ڕۆژوو ناشکێنێت، بەڵام خوێن بەربوونی مانگانەی ئافرەتان نوێژکردنی لێ قەدەغە دەکات هەتا پاك دەبێتەوە، کە نوێژیش قەدەغەکرا ڕۆژوو قبووڵ نابێت، بۆیە ئافرەت لەم کاتانەدا بەڕۆژوو نابێت، بەڵام وەکو قەرز لە ئەستۆیدا دەمێننەوە دەبێت لە کاتەکانی تردا ڕۆژووەکانی ئەوماوەی بێ نوێژیە بگرێتەوە.

شەشەم: تف قوتدان ڕۆژوو ناشکێنێت، بەڵکو چونەژوورەوەی شتێکی دەرەوەی جەستەی مرۆڤ جگە لە هەوا، دەبێتەهۆی ڕۆژوو شکاندن، سیواك کردن ڕۆژوو ناشکێنێت، ئاو لەدەم وەرکردن هەتا نوێژی نیوەڕۆش گونجاوە بۆ کەسی بەڕۆژوو، لە دوای نیوەڕۆوە ناگونجاوە، بەڵام لە کاتەکانی دەستنوێژ گرتندا سوننەتە ئەگەر بەڕۆژووش بێت، بە مەرجێك کەمتەرخەم نەبێت لەوەی شتێك بچێتە خوارەوە.

حەوتەم: ڕشانەوەی بە عەمدی ڕۆژووەکە دەشکێنێت، شت بگەڕێتەوە بۆ ناوەوە یان نەگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر عەمدی نەبێت و شت نەگەڕێتەوە ناوەوە، ئەوا ڕۆژووەکە ناشکێت.

هەشتەم: جووتبوونی نێرو مێ ڕۆژو دەشکێنێت و سزادانیشی لەسەرە، سزاکەش ئەوەیە هەرکەسێك بە جووت بوون لەگەڵ ئافرەتەکەیدا ڕۆژووەکەی بشکێنێت، ئەوا لەسەرشانی پێویست دەبێت: بەندەیەك ئازاد بکات، بەڵام ئەگەر ماڵ و سامانی نەبوو بەندەیەك ئازاد بکات، ئەوا دەبێت دوومانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێت بەبێ ئەوەی بچێتە لای ئافرەتەکەی، ئەگەر نەشیتوانی دوومانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بێت، ئەوا پێویستە نانی شەست هەژار بدات لەو خواردنانەی کە کەس وکارەکەی خۆی پێ نان دەدات، جا هەر ڕۆژێك لە

ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزان ئەو کردەوەیە دووبارە بکاتەوە ئەوە هەمان سزا دەدرێتەوە، چونکە هەر ڕۆژەی حسابی خۆی هەیە.

نۆیەم: هەر کردەوەیەك لە خەودا ڕووبدات ڕۆژوو ناشکێنێت، هەر هەڵسوکەوتێکی لە کاتی بە خەبەریدا ئەگەر بەبێ ئاگایی ڕووبدات، ڕۆژووەکە ناشکێنێت، وەکوئەوەی نەزانێت بەڕۆژووەو ئاوێك بخواتەوە، یان خواردنێك بخوات، ئەوە هیچ دوودڵیەکی ناوێت دیاری خوایە پێت بەخشراوە، بە سەربەرزیەوە ڕۆژووەکە تەواو دەکرێت.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: کەسێك لەبیری کرد کە بەڕۆژووە، شتێکی خوارد یان خواردەوە، با ڕۆژوەکەی تەواوکات، ئەوە خوا نان و ئاوی پێ داوە). (١١٦)

دەیەم: ماچکردنی هاوسەرەکەت ئەگەر ئارەزووەت نەجووڵێنێت، ڕۆژووەکەت ناشکێنێت، ئەگەر ماچکردنەکە لە دەمیشەوە بێت.

(عائیشە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یەکێك لە ژنەکانی ماچ دەکرد، لەکاتێکدا کە بەڕۆژوو بوو). (١١٧)

یازدە: هەر هەڵسوکەوتێك ببێتەهۆی چوونە ژوورەوەی شتێك بۆنێو جەستە وەکو بنێشت جوون و جگەرەکێشان، ڕۆژوو دەشکێنن، بەڵام مەلەکردن هەرچەند فێنکایەتیش دەدات بە جەستە، ئەگەر ئاو نەچێتە نێوو دەمەوە، ئەوا ڕۆژووەکە ناشکێنێت.

وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ.....(٧٨ الحج)

﴿(خوا) لەئاییندا هیچ نارەحەتی و تەنگەبەریەکی بۆ دانەناون،﴾.

دەرزی لێدانیش ڕۆژوو ناشکێنێت، بە مەرجێك بۆ ناو مێشك و بۆشایی زگ نەبێت و چارەسەری بێت بۆ نەخۆشییەك.

برگەی شازدە:

واچاكە دوای بانگی مەغریب، بە ئاو یان بە سێ قل خورما یان بە هەر شیرینی و خواردنێكی ڕەوا ڕۆژووەكە بشكێنرێت، بەڵام خورماكە لە هەموو شتێك چاكترە، لەبەرئەوەی ئەو جۆرە شەكرەی كە لەنێو خورمادایە، یەكسەر لەنێو دەمەوە دەمژرێتە ناو خوێنەوەو، ڕۆژووەوان دوای خواردنی قلی یەكەم هەست بە بوژانەوە دەكات، خراپەكارییە ڕۆژوو شكاندنەكە دوابخرێت، قەدەغەشە بەهۆی جووتبوونەوە ڕۆژوو بشكێنرێت.

(پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر یەكێك لە ئێوە (لە بەربانگ) ڕۆژووەكەی شكاند، با بە خورما بیشكێنێت، ئەگەر خورماش دەست نەكەوت با بە ئاو بیشكێنێت، ئاویش پاكە). (١١٨)

**بڕگەی حەڤدە:**

هەتا ڕۆژوی ئیمڕۆ نەشكێنرێت، ئەوا بەڕۆژووبوونی ڕۆژی دواتر قبووڵ ناكرێت.

**بڕگەی هەژدە:**

پارشێوكردن پیرۆزیو خێرو بەرەكەت دەخاتە ڕۆژووەكانەوە.

(پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: پارشێو بكەن، چونكە پارشێوكردن خێرو بەرەكەتی پێوەیە). (١١٩)

**بڕگەی نۆزدە:**

زیندوو ڕاگرتنی شەوی قەدر كە یادی هاتنەخوارەوەی قورئانە پاداشتێكی زۆری تێدایە، ئەوشەوە دیاری نەكراوە، بۆیە واچاكە موسوڵمانەكان هەموو شەوەكانی ڕەمەزان بە خواپەرستیەوە خەریكبن، هەرچەندە دەستنیشانی ئەوەش كراوە كە یەكێكە لەشەوە تاكەكانی دە ڕۆژی كۆتایی مانگەكە، دەستكەوتنی خێری ئەوشەوە لەخێری هەزار مانگی خواپەرستی باشترە، خوا دەفەرموێت:

لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ (٣)القدر

﴿(خێرو پاداشتی خواپەرستی) شەوی قەدر، لە خێرو پاداشتی هەزار مانگی (کاتەکانی تر) باشترە﴾.

(پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: لە ڕۆژە تاکەکانی دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندا بۆ شەوی قەدر بگەڕێن). (١٢٠)

برگەی بیست:

کەسێك بمرێت و ڕۆژووی لەسەربێت، جێنیشینەکەی یان خزمێکی لەجیاتی ئەو ڕۆژووەکان دەگرێتەوە.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: کەسێك کە مردبێت و ڕۆژووی ڕەمەزان قەرزدار بێت، ئەوا جێنیشینەکەی ڕۆژووەکانی بۆ دەگرێتەوە). (١٢١)

## ڕۆژووە سوننەتەکان

مرۆڤەکان لەم ڕۆژووانەدا سەربەستن، بەڵام بە ڕۆژووبونیان خێرو پاداشتێکی زۆری تێدایە.

یەکەم: بەڕۆژووبوونی شەش ڕۆژ لەدوای جەژنی ڕەمەزان لە مانگی شەوال دا.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەرکەسێك هەموو ڕەمەزان بەڕۆژووبێت و شەش ڕۆژیش بەدوایدا لەمانگی شەوال بەڕۆژووبێت، وەکو ئەوە وایە هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو بووبێت). (١٢٢)

پاداشتی چاکەکان یەك بە دە یە، واتە پاداشتی مانگەکە دە مانگە، پاداشتی شەش ڕۆژەکەش شەست ڕۆژە، دەکاتە دوو مانگ، واتە پاداشتی بەڕۆژووبوونی ڕەمەزان و شەش ڕۆژەکەی شەوال دەکاتە (١٠+٢) = (١٢)مانگ.

دووەم: بەڕۆژووبەنی عاشورا، نۆیەم و دەیەمی مانگی موحەرەم

(پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عاشورا، تاوانەکانی ساڵێکی پێش خۆی دەسڕێتەوە). (١٢٣)

(پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر هەتا عاشورای داهاتوو بمێنم، ئەوە ڕۆژی نۆیەمیش بەڕۆژوو دەبم). (١٢٤)

سێیەم: بەڕۆژوبوونی ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممە لە هەفتەدا.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەموو دووشەممەو پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبوو، لەم بارەیەوە پرسیاری لێکرا، فەرموویەتی: کارو کردەوەکانی خەڵکی لە ڕۆژانی دووشەمەو پێنج شەممەدا دەخرێنە بەردەم پەروەردگار). (١٢٥)

چوارەم: بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عەرەفە.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عەرەفەش، تاوانەکانی دوو ساڵ دەسڕێتەوە: ساڵێك لەپێش خۆیەوە کە تێپەڕیوەو ئەو ساڵەش کە بەدوایدا دێت). (١٢٦)

پێنجەم: بەڕۆژووبوونی سێزدەو چواردەو پازدەی هەموو مانگێکی عەرەبی.

(ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێبێت)، دەڵێ: خۆشەویستەکەم (صلى الله عليه وسلم) سێ ڕاسپاردەی پێدام، لە هەر مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بم، (ڕۆژانە) دوورکاتی نوێژی چێشتەنگاو ئەنجام بدەم، (شەوانەش) پێش ئەوەی بخەوم سوننەتی وەتر بکەم). (١٢٧)

شەشەم: لەو ڕۆژووە سوننەتانەدا گونجاونیە ڕۆژی هەینی بە تەنها بەڕۆژوو بیت، پێویستە ڕۆژێك لەپێشیەوە یان لەپاشیەوە بەڕۆژوو بیت.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، فەرموویەتی: کەسێك با تەنها ڕۆژی هەینی بەڕۆژوو نەبێت، مەگەر ڕۆژێك لەپێشیەوە یان لەدوایەوە بەڕۆژوو بێت).(١٢٨)

حەوتەم: ڕۆژانی جەژنی ڕەمەزان و قوربان و ئەو ڕۆژوانەش کە دەکەونە ناو ئەو جەژنانە، ئەو ڕۆژەش کە جێگەی گومانە لەوەی کە یەکەم ڕۆژی ڕەمەزانە یان نا، گونجاونیە تێیاندا بەڕۆژوو بیت.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ڕێی نەداوە یەکەم ڕۆژانی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان بەڕۆژووبن). (١٢٩)

**هەشتەم: بەڕۆژووبونی ناوەڕاستی شەعبان.**

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر شەوی نیوەی شەعبان هاتەپێش، ئەوا شەوەکەی بمێننەوە بۆ خواپەرستی و ڕۆژەکەشی بەڕۆژووبن، خوا لە خۆرئاوابوونەوە دێتە ئاسمانی یەکەم و هەتا بەرەبەیان دەفەرموێت: ئەوە تۆبەکارێك نیە داوای تۆبەم لێ بکات، هەتا تۆبەی لێ قبوول بکەم؟ ئەوە کەسێك نیە داوای رزق و ڕۆژیم لێ بکات هەتا ڕزق و ڕۆژی پێ ببەخشم؟ ئەوە خاوەن گرفتێك نیە داوام لێ بکات هەتا لە گرفتەکەی ڕزگاری بکەم؟ ئەوە کەسێك نیە شتێکی بوویت...ئەوە کەسێك نیە شتێکی بوویت؟).(١٣٠)

**نۆیەم: گونجاونیە ژن بەبێ پرسی مێردەکەی ڕۆژووە سوننەتەکان بەڕۆژوو بێت.**

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەر ئافرەتێك مێردەکەی لەلای بێت، لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بەدەر بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی ڕۆژووەکانی تر بەڕۆژوو نابێت). (١٣١)

## بابەتی پێنجەم
## حەج كردن

**بڕگەی یەكەم:**

حەج پشت بەو كات و شوێنە دیاریكراوە دەبەستێت كە بۆی دیاریكراوە تێیدا ئەنجام بدرێت.

يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ (١٨٩ البقرة)

﴿(ئـەی محەمـەد)، لـە بـارەی شـێوەكانی مانگـەوە پرسـیارت لێدەكـەن، بڵـێ: دەركـەوتنی شـێوەكانی مـانگ (بە شێوەی جیاجیا) دیـاریكردنی كاتـەكانن بـۆ ئادەمیزادەكان و زانینی كاتەكانی حەج كردنە....﴾. (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأهِلَّةِ وهى جمع هلال هى مواقيت للناس والحج)، تفسير الواحدى/ جزء(١)ص١٥٣).

حەج كردن لەسەرەتای مانگی (ذالحجة)یە.

**بڕگەی دووەم:**

حەج كردن و سەردانی ماڵی خوا لەسەر موسوڵمانان پێویست كراوە:

وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً(٩٧)ال عمران

﴿سەردانی ماڵی خواش پێویست كراوە لەسـەر خـەڵكی، ئـەوەی توانـای هـەبوو بە ڕێگایەك بچێت بۆئەوی﴾.

(پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) پرسـیاری لێكـرا: ئایـا حـەج كـردن هـەموو ساڵێكە: فەرمووی نەخێر تەنها یەك جارە). (١٣٢)

مەرجەكانی حەج كردن یان سەردانی ماڵی خوا، پێنج مەرجن:

یەكەم: ئەوكەسە دەبێت موسوڵمان بێت.

دووەم: ئەوكەسە دەبێت خاوەن عەقڵ بێت.

سێیەم: ئەوكەسە دەبێت گەیبێتە قۆناغی خۆناسین.

چوارەم: ئەوكەسە دەبێت لەهەموو ڕووەكانی ژیانەوە سەربەست بێت.

پێنجەم: ئەوکەسە دەبێت توانای ماڵی هەبێت لەسەروی ئەرکەکانی سەر شانیەوە ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات.

کەسێك خۆی حەجی لەسەربێت، ناتوانێت حەج لەجیاتی یەکێکی تر بکات.

ئافرەتیش ئەگەر نێرینەیەکی لەگەڵدا نەبێت لە کەسوکارە نزیکەکانی وەکو مێردو باوكو مامو خاڵو براو برازا، نابێت بەتەنها بچێت بۆ حەج.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئافرەتێك باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێت بۆی ڕەوا نییە ماوەی یەك ڕۆژە ڕێ بەتەنیا گەشتێك بکات بەبێ ئەوەی نێرینەیەکی نزیکی خۆی لەگەڵدا بێت). (١٣٣)

کەسێك نیەتی هەبێت بچێت بۆ حەج دەبێت پێشتر خۆی بۆ ئامادە بکات، دەبێت ئەو قەرزانەی لە ئەستۆیدان بیانداتەوە، دەبێت گەردنی خۆی ئازاد بکات بە کەس و کارەکەی و خزمو دۆستو ئەوانەی مامەڵەی لەگەڵ کردوون.

کەسێك بیەوێت حەج بکات یان سەردانی ماڵی خوا بکات، سوننەتە دوو ڕکات نوێژ بکات، دوای پۆشینی بەرگی حەج.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): لەناوچەی (ذو الحليفة) دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان بەرگی حەجی پۆشی).(١٣٤)

ئینجا پێویستە خۆی بگرێتەوەو پابەند بێت بە داب و نەریتە ئیسلامیەکانەوە، بۆ ئەم مەبەستە پێویستە خۆی بشوات.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): بۆ ئیحرام بەستن خۆی شردووە). (١٣٥)

پاش خۆشردن واچاکە خۆی بۆن خۆش بکات و بە پۆشاکێکی نەدرواو جەستەکەی خۆی داپۆشێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەریەکێك لە ئێوە با بەرگی ئیحرامەکەی بە دوو پارچە قوماش و دوو تاك نەعلەوە بێت، پارچەی یەکەم لە سەرووی ناوکیەوە سینگ و پشتی داپۆشێت، پارچەی دووەمیش لە خوار ناوکیەوە هەتا ئەژنۆی داپۆشێت). (١٣٦)

وا باشه ئەم دوو پارچه قوماشه ڕەنگیان سپی بێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: باشترین بۆشاکەکانتان ئەوانەن کە ڕەنگیان سپییە، جا بیپۆشن‌و مردووەکانیشتانی پیٚ کفن بکەن). (١٣٧)

ئینجا بڵێت: لبيك اللهم عمرةً، او حجا، او حجا وعمرة، بەمانای: ئەی پەروەردگاری من بە دەنگ داواکەی تۆوە هاتم، سەردانێکی ماڵکەت بکەم، یان ئەی پەروەردگاری من بە دەنگ داواکەی تۆوە هاتم کە ڕێورەسمی حەج جێبەجیٚ بکەم، یان ئەی پەروەردگاری من، بەدەنگ داواکەی تۆوە هاتم، سەردانێکی ماڵەکەت بکەم‌و ڕێورەسمی حەجیش جێبەجیٚ بکەم.

ئەو کەسەش لەکاتی حەج کردندا سەردانی ماڵی خوا دەکات، بۆی هەیە بە سیٚ شێواز ئەرکەکانی جێبەجیٚ بکات:

یەکەم: (التمتع) ئەوە دەگەیەنێت کە کەڵك لەکاتی حەج کردنەکەی وەرگرێت، بۆ جێبەجیٚ کردنی سەردانێکی ماڵەکەی خواو پاشان دەرچوون لەو ڕێورەسمە، دوابەدواش پابەند بوون بە ڕێورەسمی حەج کردنەوە، واتە: لەکاتی حەجدا، سەرەتا عومرەکە جێبەجیٚ دەکرێت، ئینجا کۆتایی بە عومرەکە دەهێنرێت‌و یەکسەر مەراسیمی حەج کردنەکە دەست پێدەکات.

دووەم: (الافراد) ئەویش ئەوەیە عومرەکە نەکرێت‌و بە تەنها ڕێورەسمی حەجەکە جێبەجیٚ بکرێت، جا دوایی عومرەکە بکات.

سێیەم: (القِرَان): واتە جێبەجیٚ کردنی هەردووك ڕێورەسمەکان بەیەکەوە بکرێن، یان سەرەتا عومرەکە بکرێت‌و پێش ئەوەی تەوافەکەی بکرێت، ڕێورەسمی حەجەکەشی بخرێتە سەر.

## ئەوشتانەی لەکاتی پابەندبوونی حەج و عومرەدا قەدەغە دەکرێن لەسەر ئەو کەسەی حەج یان عومرەکە دەکات

یەکەم: موو تاشین.

دووەم: نینۆك کردن.

سێیەم: لەبەرکردنی جل‌وبەرگی درواو، هەروەها نابێت دەرزی و قۆپچەو ئەو هۆکارانە بەکاربهێنرێن کە پۆشاکەکانی ئیحرام بەیەکەوە ببەستێتەوە.

چوارەم: بۆندارکردنی جەستەی یان بۆشاکەکانی.

پێنجەم: داپۆشینی سەر بۆ پیاوان، ژنانیش هەر لەبنەڕەتدا سەر داپۆشینیان لەسەر پێویستکراوە.

شەشەم: ڕاوکردن بە هەموو جۆرەکانیەوە، تەنانەت نابێت هێلکەی باڵندە کورکەکانیش بشکێنێت.

حەوتەم: ژن مارەکردن بۆ پیاوان، یان شووکردن بۆ ژنان.

هەشتەم: کاری جووتبوون لەگەڵ هاوسەرەکەیدا.

نۆیەم: لادان لە یاساکانی ئیسلام و دمبەدمانێ و قرەقڕ.

الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَعْلُومَاتٌ فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلا رَفَثَ وَلا فُسُوقَ وَلا جِدَالَ فِي الْحَجِّ (البقرة ١٩٧).

﴿(کاتی)حەج چەند مانگێکی زانراون، هەر کەسێك لەو مانگانەدا جێبەجێ کردنی حەجی لەسەرخۆی پێویست کرد، ئەوا چوونە لای ئافرەتان و لادان لە یاساکانی ئیسلام و دمبەدمانە و قرەقڕکردن لە حەجدا نیە...﴾.

ئینجا هەندێك لەو قەدەغەکراوانە ئەگەر بەبێ ئاگایی کران، ئەوا بۆ پاك بوونەوەیان دەبێت شتێك لەبریدان بدرێت، بۆنموونە: مووتاشین و نینۆك کردن و سەردا پۆشین و لەبەرکردنی جل‌وبەرگی درواو، لەبریدانەکەیان سەربڕینی مەڕێکە، یان سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بوون، یان ناندانی شەش هەژارە، بەپێی توانای گیانی وماڵی ئەوکەسە، هەروەها لەبریدانی ڕاوکردن ئەوەیە کە

گیانەوەرێکی وەکو گیانەوەرە کوژراوەکە بکڕێتەوە، ئەگەر گیانەوەرێکی لەو شێوەیەش دەست نەکەوت، ئەوا نرخەکەی دیاری دەکرێت بە پارە دەدرێت، هەروەها لەبریدان بۆ هەڵبژاردنی شێوازی (التمتع) یان (القران) مەڕێکە بۆ ئەو کەسەی کە هەیبێت، یان دە ڕۆژ بەڕۆژوو بوونە، سیانیان لە ماوەی حەجەکەدا، حەوتیشیان دوای گەڕانەوەی.

## ئەوشوێنانەی کە دەکەونە سنووری پابەندبوون بە ڕێوڕەسمەکانی حەجەوە (المواقیت)

**یەکەم:** (ذو الحلیفة) کە (٢٨)کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە، کەوتۆتە باشووری خۆرهەڵاتی مەدینە.

**دووەم:** (الجحفة) گوندێکە (١٠)کیلۆمەتر لە دەریای سورەوە دوورە، ئێستا بەسەریەکدا ڕووخاوە، خەڵکی ئێستا لە ناوچەی (رابغ)جل و بەرگی حەج دەپۆشن کە (١٨٦)کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە، لە باکووری ڕۆژئاوای شاری مەککە.

**سێیەم:** (یلملم) دۆڵێکە لەسەر ڕێگەی یەمەن، (١٢٠)کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە، خەڵکی ئێستا لە گوندی(السعدیه)بەرگی حەج دەپۆشن، لە باشووری شاری مەککە.

**چوارەم:** (قرن المنازل)، ئێستا پێی دەگوترێت: (السیل الکبیر)، (٧٥)کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە، دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری مەککەوە.

**پێنجەم:** (ذات عرق)، ئێستا چۆڵەو هیچ ڕێگایەکی بەسەرەوە نیە، کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی شاری مەککە.

ئینجا ئەو شارانەی دەکەونە ناو ئەو سنوورەوە، وەکو مەککەو جدە، ئەوا لە شوێنەکانی خۆیانەوە بەرگی حەج کردن دەپۆشن.

ئەمانــە سـنووری دیـاری کـراون، بـۆ حـەج و عـومرە، ناتوانیـت بێیتـە نـاو ئـەو سنوورەوە بـەبێ پۆشـینی بـەرگی حـەج، بـەڵام دەكرێـت لـە وڵاتەكـەی خۆتـەوە بەرگی حەج بپۆشیت، یان لەنێو فڕۆكەدا كە گەیشتنە ئەوشوێنانە بەرگی حەج بپۆشن.

ئینجا دوای بەرگ پۆشینەكە واباشە بە بەردەوامی هەستی خۆت دەربڕی كە بە دەنگ داواكەی خواوە هاتویو بڵێیت: (لبيك اللهم لبيك، لبيك لاشريك لك لبيك، ان الحمد والنعمه لك والملك، لاشريك لك).

(پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: جبریل هات بۆلام و گوتی: ئـەی محەمەد: بە هاوڕێكانت بڵێ: لـە دەربڕینـی بەدەنگـەوەهاتنی خـوادا، با دەنگـی خۆیان بـەرز بكەنـەوە، لەبەرئـەوەی ئـەم بەدەنگەوەهاتنـە لـە دروشـمەكانی حـەج كردنە).(١٣٨)

## گەیشتن بە شاری مەككە

عـومرە هێنانـەوە لەسـەر موسـوڵمانان پێویسـت نـەكراوە، بـەڵام كردنەكـەی پاداشتێكی زۆری تێدایە:

(پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پرسیاری لێكرا: ئایا عومرە لەسـەر موسـوڵمانەكان پێویستكراوە؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام كردنەكەی خێری بۆتان هەیە). (١٣٩)

ئەو كەسەی بە مەبەستی ئەنجامدانی حەج و عومرە، پۆشاكی حەجی پۆشیوەو لە سەفەرەكەیدا گەیشتە شاری مەككە، ئەوا سەردانی مزگەوتی كەعبە دەكات و لەبەردەم دەرگاكەیدا دەڵێت: (اللهم أنت السلام ومنك السلام فحينا ربنا بالسلام وأدخلنا الجنة دار السلام تباركت ربنا وتعاليت يا ذا الجلال والإكرام. اللهم افتح لي أبواب رحمتك ومغفرتك وأدخلني فيها. بسم الله والحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله).

که چووه ژوورەوه بە ڕووی بەردە ڕەشەکە بچێتە پێشەوەو دەستی ڕاستی پێدا بخشێنیٚو ماچی بکاتو بڵێت: (الله اكبر)، ئەگەر بۆشی نەگونجا ماچی بکات، ئەوا لەپی دەستی پێدابێنیٚو پاشان ناولەپی دەستەکەی خۆی ماچ بکات، ئەگەر هەر نەشیتوانی بیگاتیٚ، ئەوا بەرانبەری ڕادەوەستیٚو دەستی ڕاستی بۆ درێژ بکاو بڵیٚ: (الله اكبر).

ئینجا لەو سوچەوە کە بەردەکەی لێیە بە پیادەیی دەست بکە بەسوڕانەوە بە دەوری ماڵەکەی خوادا، کاتێك دەگەیتە سوچەکەی باشوور کە بە(روکنی یەمانی ناسراوە)، ئەوا دەستی ڕاستت دەگەیەنێتە ئەو سوچەو بەردەوام دەبێت لە سوڕانەوەکەت هەتا دەگیتەوە بەردە ڕەشەکەو هەوڵی ماچ کردنو دەستلێدانی دەدەیتو (الله اكبر)دەکەیت، ئەگەر نەشتتوانی بگەیتەوە بەردەکە، ئەوا لە دوورەوە ڕادەوەستیتو ڕووی تێدەکەیتو دەستی بۆ درێژ دەکەیت، بەم پێیە حەوت جار بە دەوری کەعبەدا دەسوڕێیتەوە، دەتوانرێت لەنێوان بەردە ڕەشەکەو ڕوکنی یەمانیدا ئەم دوعایە بخوێندرێت: (ربنا اتنا في الدنيا حسنة وفي الاخرة حسنة وقنا عذاب النار).

ئەگەر کەسێك لەکاتی تەوافەکەدا کەوتە گومانەوە کە سیٚ جاری کردووە یان چوار، ئەوا بە لایە کەمەکەوە پابەند دەبێت.

دەست خشاندن لە بەردە ڕەشەکەو ماچ کردنی، یان دەستگرتن بە ڕوکنی یەمانی، لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەرن(صلى الله عليه وسلم)، خوا لەسەر خاوەن باوەڕەکانی فەڕز نەکردووە، بۆیە ئەگەر کەسێك نەیتوانی ئەنجامیشیان بدات، ئەوا هیچ تاوانێکی لەسەر نیە، مەرجە دەستنوێژەکەت دروست بێت، ئەگەر دەستنوێژەکەت نەما، تەوافەکە بپچڕێنەو بڕۆ دەستنوێژەکەت بگرەوەو بگەڕێوە تەوافەکەت تەواو بکە، لەسەرەتای هەر سووڕانەوەیەکیش بڵیٚ: (خوایە بەناوی تۆ، کە لە هەموو کەس گەورەتریو، وەکو باوەڕێك بە قورئانەکەتو وەفاداریەك بۆ وادەو پەیمانەکانتو وەکو پەیڕەوی کردنێك بۆ

ڕەوشتەکانی پێغەمبەرەکەت، من ئەم سووڕانەوەیە بە دەوری ماڵە پیرۆزەکەتدا دەکەم)، مەرجە حاجی لە سێ تەوافی یەکەمدا کە مێك لە ڕۆیشتنەکەی خێرا بێت‌و، لە چوارەکانی تریشدا ئاسایی ببێتەوە.

جا کە حەوت جارەکە تەواو بوو، دەچێتە(مەقامی ئیبراهیم) ئەم فەرموودەیەی خوا دەڵێتەوە: (واتخذوا من مقام ابراهيم مصلى)، ئینجا لەپاش مەقامەکەوە دوو ڕکات نوێژ دەکات، لە یەکەمیاندا(قل یاایها الکافرون)و لە دووەمیشیان(قل هو الله احد)دەخوێنێت، جا ئەگەر لەبەر قەرەباڵغی نەیتوانی نوێژەکە لە پاش مەقامی ئیبراهیمەوە بکات، ئەوا لەهەر شوێنێکی نێو مزگەوتەکەدا بیکات دروستە.

پاشان دەچێت هەندێك ئاوی زمزم دەخواتەوەو بەرەو بەردە ڕەشەکە دەگەڕێتەوەو هەوڵی ئەوە دەدات دەستی ڕاستی بگەیەنێتێ، بەڵام ئەگەر بۆی نەکرا خۆی بگەیەنێتێ، ئەوە کارێکی ئاساییە.

ئینجا لە دەرگای (باب الصفا)وە بەرەو تەپۆلکەی (سەفا) دەڕوات، بۆ یادکردنەوەی ئیسماعیل‌و هاجەرەی دایکی، هەر کە لێی نزیك بۆوە ئەم ئایەتە بخوێنێت:

(إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْراً فَإِنَّ اللّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ)

پاشان بڵێت: (نبدأ بما بدأ الله به)، واچاکە حاجی سەرکەوێتە سەر تەپۆلکەکەو ڕووی لە قیبلە بکات‌و دەستەکانی بەرز بکاتەوەو بەدەنگەوە بڵێت:

(الله أكبر الله أكبر، لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، لا إله إلا الله وحده، أنجز وعده، ونصر عبده، وهزم الأحزاب وحده).

ئینجا بەو شێوەیەی کە خۆی ئارەزووی لێیەتی بە نهێنی لە خوا دەپاڕێتەوە، پاشان بۆ جاری دووەم هەمان وێردی پێشو دەڵێتەوەو جارێکی تریش بە

نهێنی لەخوا دەپارێتەوە بەو شێوەیەی کە خۆی دەیەوێت، ئینجا بۆ جاری سێیەم هەمان وێردی پێشو دەڵێتەوە، ئەمجارەیان بەبێ ئەوەی دوعا بکات، دێتە خوارەوەو بەرەو تەپۆلکەی(مەروە) دەڕوات، ڕۆیشتنەکەی بە شێوەی نەرمەغار یان گورگەلۆقە دەبێت، تا دەگاتە گردۆلکەکە، لەوێش سەردەکەوێت و ڕوودەکاتە قیبلەو دەستەکانی بەرز دەکاتەوەو هەمان وێردو دووعاکانی سەر تەپۆلکەی (سەفا) دەڵێتەوە، بەم شێوەیە حەوت جار لە نێوان ئەم دوو تەپۆلکەیەدا دێت و دەچێت، واباشە لەم هاتن و چوونانەدا بە بەردەوامی یادی خوا بکات و لێی بپارێتەوە، بەڵام کە جاری حەوتەمی تەواوکردو گەڕایەوە بۆ تەپۆلکەی (سەفا)، پێویست ناکات ئەم وێردو پاڕانەوانە ئەنجام بدات، ئەگەر وا ڕێککەوت لە کاتی هاتوچونەکەدا بانگ درا بۆ نوێژێکی جەماعەت، ئەوا هاتوچونەکە واز لێدەهێنێت و جەماعەتەکەت دەکەیت، کەی نوێژەکە تەواو بوو، دەگەڕێیتەوە بۆ تەواوکردنی هاتوچوونەکانت لە نێوان سەفاو مەروەدا.

ئینجا پیاوان سەریان دەتاشن یان کورتی دەکەنەوە، ئافرەتەکان سەرتاشینیان لەسەر نیە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): (ليس على النساء حلق إنما على النساء التقصير)، بۆیە ئافرەتان بۆ کۆتایی هێنانی عومرەکەیان، واچاکە لە هەر بەرێکەوە بە ئەندازەی پەنجەیەك لە قژیان ببڕن، ئەوانەی کە بۆ عومرە هێنانەوە دەچن، لێرەدا کۆتایی بە ئەرکەکانی سەرشانیان دێت، ئەوانەش کە نیەتی ئەوەیان هێناوە حەج بکەن، ئەوا ڕۆژی هەشتی مانگ بەرگەکانیان دەپۆشن بۆ جێبەجێ کردنی ڕێوڕەسمەکانی حەج.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: عومرە هێنانەوەیەك لە ڕەمەزاندا، وەکو حەج کردنێك وایە).(١٤٠)

ڕۆژی هەشتی مانگ حاجیەکان دەکەونەڕێ بۆ (منى)، نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب و عیشاو نوێژی بەیانی ڕۆژی نۆی مانگ لەوێ دەکەن، بەشێوەیەك

نوێژەکانیان لە کاتەکانی خۆیاندا ئەنجام دەدەن، بەڵام نوێژە چوار ڕکاتیەکان بۆ دوو ڕکات کورت دەکرێنەوە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: حەج کردن ئامادەبوونە لە چیای عەرەفات، جا کێ گەیشتە عەرەفات پێش نوێژی بەیانی، ئەوە بە حەجەکەی گەیشتووە). (١٤١)

واتە کەسێك ڕۆژی نۆی مانگ فریا نەکەوت بگاتە عەرەفات، ئەوا هەتا نوێژی بەیانی ڕۆژی جەژن، کەی فریاکەوێت، حەجەکەی قبووڵە.

جا کە خۆری ڕۆژی نۆی مانگ هەڵات، ئەوا بەرەو عەرەفە دەکەونە ڕێ، کاتی وەستان لە عەرەفات لە نیوەڕۆی نۆی مانگەوە دەست پێدەکات هەتا نوێژی بەیانی ڕۆژی جەژن، بەڵام لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەرە((صلى الله عليه وسلم)) کە لە نیوەڕۆوە لە عەرەفات بوەستیت هەتا خۆر ئاوا دەبێت.

کاتێکیش کە بانگی نیوەڕۆیدا، نوێژی نیوەڕۆو عەسر بە کورتکراوەیی و بە کۆکراوەیی بە ئەنجام دەگەیەنن، واچاکە حاجیەکان لەپاش چیای عەرەفەوە ڕوو لە کەعبە بکەن و لە هەوڵ و تێکۆشاندابن بۆیادی خواو پارانەوەی گونجاو، سوننەتە سوورەتی(قل هو الله احد) و سوورەتی(الحشر) بخوێنرێت و، ئایەتی (ربنا اتنا في الدنيا حسنة وفي الاخرة حسنة، وقنا عذاب النار) بڵێتەوەو (لبيك الهم لبيك)بکات و سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر بدات.

پێغەمبەر لەم بارەیەوە فەرموویەتی: لە ڕۆژی عەرەفەدا باشترین پاڕانەوەو چاکترین وتەی من و پێغەمبەرەکانی پێش من ئەوەیە کە بڵێیت:

(لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، يحيي ويميت، وهو على كل شيء قدير).

ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (١٩٩)البقرة

﴿پاشان(دوای تەواوکردن و کۆکردنەوەی نوێژەکانی شێوان و خەوتنان و پاڕانەوە لە خواو بواریك بۆ پشوودان)، دابڕژێن هەروەکو چۆن خەڵکی پێش

ئێوە (لە مزدەلیفەوە) دارژان (بەرەو(منی) بۆ ڕەجم کردنی شەیتانی گەورە)، داوای لێبوردنیش لە خوا بکەن، بەڕاستی خوا لێبوردەو خاوەن بەزەییە﴾.

حاجیەکان تا خۆر ئاوابوون لە عەرەفە دەمێننەوەو پاشان بەرەو موزدەلیفە دادەڕژێن، هەر کە گەیشتنە ئەوێ، نوێژی مەغریب دوا دەخەن و لەگەڵ نوێژی عیشادا بە کۆکراوەیی و بە کورتکراوەیی ئەنجامیان دەدەن، لەوێ دەمێننەوە هەتا نوێژی بەیانی دەکەن، زۆر پێویستە حاجی کەمێك پاڵ بکەوێت و سەرخەوێك بشکێنێت، بۆ یادو بیرەوەریی ئادەم و حەوا، کە یەکەم کاری ژن و مێردایەتییان لەم شوێنەدا ئەنجامدا، کە بە (المشعر الحرام)ناسراوە، پاشان بەرەو شوێنە پیرۆزەکە(المشعر الحرام) دەڕۆن و لەوێ ڕوو لە قیبلە دەکەن و هەتا خۆر هەڵدێت بە ئارامی و هێدی و هێمنی دەپاڕێنەوە.

ئەوجا بەرەو (منی)دەکەو نەڕێ، کەسێك کە ئافرەتی لەگەڵ بێت یان نەخۆشی هەبێت دەتوانێت دوای تێپەڕبوونی دوو بەشی شەوەکە بەرەو (منی) بکەوێتەڕێ، بەڵام باشتر وایە حاجیەکان تا خۆرهەڵات لە (المشعر الحرام) بمێننەوە، هەر کەسێك شەوەکە لە موزدەلیفە نەمێنێتەوە، دەبێت لەبری نەمانەوەکەی ئاژەڵێك سەرببڕێت، ئینجا لە موزدەلیفە، یان لە(منی)، چۆن گونجا، هەندێك وردەبەرد کۆدەکەنەوە بۆ بەردباران کردنی شوێنی شەیتانەکان.

جا حاجیەکان دوای خۆرهەڵاتی ڕۆژی جەژن، بۆ یادو بیرەوەریی ئیبراهیم و هاجەرو ئیسماعیل، بەرەو شوێنی ڕەجمکردنی شەیتانەکان دەچن لە(منی)، لە ڕێگەدا بە بەردەوامی بەدەنگەوەهاتنی خۆیان ڕادەگەیەنن بۆ داواکەی خواو دەڵێن: (لبیك اللهم لبیك، لبیك لاشریك لك لبیك، ان الحمد والنعمە لك والملك، لاشریك لك).

جا کە گەیشتە ئەوێ سەرەتا حەوت بەرد دەگرێتە شوێنی شەیتانی گەورە، کە بە(جمرە العقبە)ناسراوە، مەرجە هەر حەوت بەردەکە بکەونە ناو شوێنە

دیاریکراوەکەوە، ئەگەر بەردێك لایدا، پێویستە بەردێکی تری لە جێگە بەکاربێنێت، لەگەڵ هەڵدانی هەر بەردێکدا حاجی دەستی بەرز دەکاتەوەو دەڵێت: (الله اکبر)، ئینجا حاجی دەگەڕێتەوەو دەچێت قوربانیەکەی سەردەبڕێت، واباشە قوربانیەکان پێش خۆرئاوابوونی ڕۆژی یەکەمی جەژن سەرببڕێن، دوای تێپەڕبوونی ڕۆژانی جەژنیش، ماوەی قوربانی کردنەکە بەسەر دەچێت، سەربڕینی ئەم قوربانیە یادی هەوڵی سەربڕینی ئیسماعیلە لەلایەن باوکیەوە، جا ئەگەر کەسێك ماڵوسامانی نەبوو قوربانیەك سەربڕێت، ئەوا (١٠)ڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت، سیانیان لەماوەی حەجەکەدا، واباشە لە سێ ڕۆژەکانی پێش عەرەفە بن، حەوتەکەی تریش دوای گەڕانەوەی بۆ ناو ماڵو منداڵەکەی.

ئینجا حاجی لە هەنگاوی یەکەمدا بۆ دەرچوون لە پابەند بوون بە ڕێوڕەسمی مەراسیمی حەجەکەدا، سەری دەتاشێت یان کورتی دەکاتەوە، هەموو ئەو شتانەش کە لێی قەدەغە کرابوون بۆی ڕەوا دەبنەوە، تەنها ئەوە نەبێت کە ناتوانێت بچێتە لای ئافرەتەکەی.

ئینجا حاجی خۆی پاكو بۆن خۆش دەكاتو بەرەو کەعبە دەچێت بۆ بەشداری کردن لەگەڵ تێکڕای حاجیەکان لە سوورانەوەیەکی حەوت جاریدا بە دەوری کەعبەدا، کە بە( طواف الافاضة) ناسراوەو هەموو حاجیەکان تێکڕا بە دەنگ داواکەی خواوە دەچنو دەڵێن: (لبیك اللهم لبیك، لبیك لاشریك لك لبیك، ان الحمد والنعمه لك والملك، لاشریك لك).

وَاذْكُرُواْ اللّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ اتَّقَى وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ (٢٠٣)البقرة

﴿یادی خواش بکەنەوە لە چەند ڕۆژێکی ژمێرراوو دیاریکراودا(کە ڕۆژانی جەژنو دوای جەژن دەگرێتەوە)، جا هەر کەسێك پەلەی کرد بۆ گەڕانەوە لە دوو ڕۆژی دوای جەژندا، ئەوە تاوانی لەسەرنیەو، هەرکەسێکیش لەوانەی کە

خۆیان دەپارێزن و ڕێزی ئەم شوێنە پیرۆزە دەگرن ئەگەر خۆی دواخست و زیاتر مایەوە، ئەوا تاوانی لەسەرنیە، لە خواش بترسن و بزانن(ڕۆژێك دێت) ئێوە بۆلای ئەو کۆدەکرێنەوە﴾.

جا کە ئەم تەوافە تەواو بوو، حاجی بەتەواوی ئازاد دەبێت لە هەموو ئەو مەرجانەی کە پێیانەوە پابەندبوو بەهۆی مەراسیمی حەجەکەوە و بۆی هەیە بچێتە پاڵ ئافرەتەکەشی، ئینجا حاجیەکان دەچنەوە بۆ(منی)، ئەوانەی کە پەلەیانە دەیانەوێت بگەڕێنەوە، لە ڕۆژی دووەمی حەجەوە تا ئێوارەی ڕۆژی سێیەم لەوێ دەمێننەوە، ئەوانەش کە پەلەیان نیە، لە ڕۆژی دووەمەوە سێ شەوو ڕۆژ لەوێ دەمێننەوە، لەو ماوەیەدا شوێنی هەرسێك شەیتانەکە بە حەوت بەرد ڕەجم دەکەن، سەرەتا شوێنی شەیتانی بچووك ڕەجم دەکرێت وەکو بیرەوەریەك بۆ یادی ئیسماعیل، کە شەیتان ویستی هەڵی بخەڵەتێنێ و بێ فەرمانی باوکی بکات، ئەویش ڕەجمی کرد، واچاکە حاجی لە کاتی هەموو رجم کردنەکاندا ڕووی لە قیبلە بێت و دوای تەواوکردنی ڕەجم کردنەکە دوعاو پاڕانەوە بکات، دواتر وەکو بیرەوەرییەك بۆ هاجەرە، حاجی دەچێت شەیتانی ناوەڕاست ڕەجم دەکات، پاشتریش وەکو بیرەوەرییەك بۆ ئیبراهیم، حاجی دەچێت شەیتانی گەورە ڕجم دەکات، لە ماوەی ئەو ڕۆژانەی کە حاجی لە (منی) دەمێنێتەوە، ڕۆژی جارێك شەیتانەکان ڕەجم دەکات.

فَإِذَا قَضَيْتُمْ مَنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا فَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الأَخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ (٢٠٠)البقرة

﴿جا کە ڕێوڕەسمەکانتان بە تەواوی بەجێهێنان، ئەوا ئەوکاتە یادی خوا بکەنەوە، وەکو یادکردنەوەی باوانەکانتان یان یادکردنەوەیەکی توندو بەهێزتر، جا لەنێو خەڵکیدا ئەوەی کە دەڵێت: ئەی پەروەردگاری ئێمە لە دنیادا (سامان وسەروەتمان پێ ببەخشە)و، لە دواڕۆژیشدا هیچ بەشێك بۆ ئەوکەسە نیە (لەبەرئەوەی خۆی داوای دواڕۆژی نەکردووە)﴾.

وِمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ(٢٠١)البقرة

﴿(لەنێو خەڵكیشدا) ئەوەیان كە دەڵێت: ئەی پەروەردگاری ئێمە لە دنیادا چاكەمان پێ ببەخشەو لە دوارۆژیشدا چاكەمان پێ ببەخشەو لە سزای ئاگریش بمانپارێزە﴾.

جا دوای ئەوەی كە هەموو شتێكی تەواوكردو بڕیاری گەڕانەوەی دا، پێویستە بۆ ماڵ ئاوایی تەوافێكی ماڵی خوا بكات، بە ڕووی بەردەكەدا پاشەوپاش لە مزگەوتەكە بێتە دەرەوە، ئافرەتی حەیزدار ئەم تەوافەی لەسەر نیە.

ئەمە ئەو بڕگە یاساییە پێوست كراوانە بوون بۆ جێبەجێ كردنی مەراسیمی حەج و عومرە، بەڵام چەندین ڕێورەسمی پیرۆزو شایستەش هەن كە پێویست نەكراون ئەنجام بدرێن، بەڵام ئەنجامدانیان لە بەهای حەجەكەو پاك بوونەوەی ویژدانی مرۆڤ زیاد دەكەن لەوانە:

یەكەم: سەردانی گۆڕی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەشاری مەدینە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: كەسێك سەردانی گۆڕەكەم بكات، دەكەوێتە بەر شەفاعەتی منەوە). (١٤٢)

سەردانێكی پێویست كراو نیە لەسەر موسوڵمانەكان، بەڵام بۆ كەسێكی موسوڵمان كە چووبێت بۆ حەج، یان ڕێگەی كەوتبێتە ئەو شارە، زۆر مەبەستە سەردانی مەدینە بكات و لەو مزگەوتەدا كە گۆڕەكەی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) تێدایە، نوێژو خواپەرستی ئەنجام بدات، چونكە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (نوێژێك لە مزگەوتی كەعبەدا، وەكو سەد هەزار نوێژی مزگەوتەكانی تر وەهایە، نوێژێكیش لە مزگەوتەكەی مندا، وەكو هەزار نوێژی مزگەوتەكانی تر وەهایە، نوێژێكیش لە مزگەوتی قودس، وەكو پێنج سەد نوێژی مزگەوتەكانی تردا وەهایە)، جا هەر كەسێك كە ویستی ئەم سەردانە جێبەجێ بكات، ئەوا خۆی پاك دەكاتەوەو ڕوو لە مزگەوتەكە دەكات و كە دەچێتە ژوورەوە بەرەو مەزارەكەی بڕوات و لەنێوان گۆڕەكەو مینبەرەكەدا دوو

ڕکات نوێژی (تحية المسجد) ئەنجام بدات، ئینجا دوای نوێژەکە بروات بۆلای گۆڕەکەو سلاوی لێ بکات، سلاواتی لەسەر لێ بدات و چۆنی ئارەزوو لێیە بە نزمی لە خوا بپاڕێتەوەو دوعا بۆ خۆی و کەس وکارو تێکڕای موسوڵمانان بکات، بۆنموونە دەتوانیت بڵێیت:( خوایە بۆ خاتری پیرۆزیی و خۆشەویستی ئەم پێغەمبەرەت (صلى الله عليه وسلم) بەزەییت پێماندا بێتەوەو لە تاوانەکانمان خۆشبە)، گونجاونیە مرۆڤ خۆی بە شوورەی گۆڕەکەوە بگرێت و بیکات بە شین و بابەڕۆ یان دەزبێحەکەی بۆ پیرۆزی لە شورەکە بخشێنێت، پاشان هەنگاوێك بەرەو لای ڕاست دەگەیتە ڕێکی گۆڕی ئەبوبەکری صدیق(ڕەزای خوای لێبێت)، سەلامێکیش لە ئەبوبەکر دەکەیت و هەنگاوێکی تر بەرەولای ڕاست دەڕۆیت، دەگەیتە ئاستی گۆڕەکەی عمری کوری خەتاب(ڕەزای خوای لێبێت)، سلاوێکیش لە عمر دەکەیت و پشتاوپشت دەگەڕێتەوە بۆ دەرەوەی مزگەوتەکە، هەر کاتێکیش کە ویستت مەدینە جێهێڵیت، بۆ خوا حافیزی دێیتەوە ناو مزگەوتەکەو دوو ڕکات نوێژەکەت دەکەیت و خوا حافیزی لە پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عمر دەکەیت و چەندەی بتەوێت دەپاڕێیتەوەو بە ئەدەبەوە مزگەوتەکە جێدەهێڵیت.

**دووەم:** سەردانی گۆڕستانی (جنة البقيع):

سەردانی ئە گۆڕستانە لەسەر موسڵمانان پێویست نیە، بەڵام ڕەوشتێکی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم)، سەردانی ئەو گۆرستانەی دەکردو دەچووە سەر گۆڕی ئەو هاوڕێیانەی لە پێناوی ئیسلامدا شەهید بوون و لەوێ نێژراون، بۆیە گونجاوە بۆ کەسێك ڕێگەی کەوتە مەدینە بۆ زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، بچێت سەردانێکی ئەو هاوڕێیانەشی بکات و بۆ خۆی و بۆ موسوڵمانە زیندوو مردووەکان لە خوا بپاڕێتەوە.

**سێیەم:** سەردانی مزگەوتی(قوبا).

یەکەم مزگەوتە کە لە سەردەمی ئیسلامدا دروستکراوە، دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای شاری مەدینە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، زوو زوو سەردانی ئەو مزگەوتەی دەکردو لە بیرەئاوەکەی دەستنوێژی هەڵدەگرت و نوێژی لێ دەکرد، بۆیە گونجاوە مرۆڤی موسڵمان سەردانی ئەو مزگەوتە بکات و لە کانیەکەی ئاو بخواتەوەو دەستنوێژ هەڵگرێت و نوێژی تێدا بکات.

چوارەم: ئەشکەوتی (الحراء).

ئەو ئەشکەوتەیە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، بۆ خواپەرستی ڕووی تێدەکردو، یەکەم ئایەتی قورئانی لەوێ بۆ هاتە خوارەوە، لە چیای(النور) دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی مزگەوتی کەعبەوە.

ئەگەر کەسێك مردو، لە تەمەنیدا نەیتوانی حەج بکات، ئەوە پێویستە کەس وکارەکەی دوای خۆی حەجەکەی بۆ ئەنجام بدەن.

(ئافرەتێك هات بۆلای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گوتی: دایکم مردو حەجی نەکرد، دەکرێت من حەجەکەی بۆ بکەم؟ پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (بەڵێ تۆ لە جیاتی ئەو حەجەکە بکە). (١٤٣)

## ئەو ڕێوڕەسمە سوونەتانەی کە پەیوەندییان بەکاتی حەجەوە هەیە بۆئەوانەی لەحەج کردن نین و لەوڵاتەکانی خۆیانن

**بڕگەی یەکەم:**

بەڕۆژووبوونی نۆ ڕۆژەکەی سەرەتای مانگی (ذو الحجة).

خـوا لـە سـوورەتی (الفجر)سـوێند بـەو دەشـەوە دەخـوات کـە نـۆ ڕۆژەکـەی سەرەتای مانگی (ذی الحجة) دەکەونە نێوانیانەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم)، فەرموویەتی: (خوا لەسەرخۆی کردۆتە ماڵ لەبری بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عەرەفە لە تاوانە (بچووکەکانی) ساڵێك لەوەو پێش و ساڵێك لەوەو پاشی ئەوکەسە خۆش ببێت).

**بڕگەی دووەم:**

قوربانی کردن.

قوربانی کردن پێویست نەکراوە لەسەر کەسێك کە لە حەجدا بێت یان لە حەجدا نەبێت، ڕەوشتێکی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم) دەتوانیت بیکەیت و دەتوانیت نەیکەیت، بەڵام حاجیەکان لەوانەیە لە ڕێوڕەسمی حەجکردنەکەدا تووشی فیدیە دان ببن، بۆیە پێویستە بیکەن، ئەگەر بۆخۆت پێشتر بڕیارت دابێت ئەم جەژنە قوربانییەك بکەیت، ئەوە لەسەرت پێویست دەبێت، ئەگەر نەشت کرد، دەبێت بە قەرز بەسەرتەوە، لەم بارەشدا ئەوکەسە نابێت بۆخۆی لە گۆشتەکەی بخوات، ئەم گۆشتە تایبەتە بە هەژارەکان، بەڵام ئەگەر پێشتر بڕیارت نەدابێت و ڕۆژی جەژن قوربانیەکت کرد، ئەوا بۆخۆت و دەوروبەرو، تەنانەت خەڵکی دەسترۆیشتوش بۆیان هەیە لە گۆشتەکەی بخۆن، قوربانی کردن بیرەوەریی هەوڵی سەربڕینی حەزرەتی ئیسماعیلە لەلایەن باوکیەوە، وەکو ئەوە وایە تۆ لە هەمان ڕۆژدا، لەبری سەربڕینی کوڕەکەت لە پێناوی خوادا، قوربانیەك بکەیت.

## چەند ڕوونكردنەوەیەك لەبارەی قوربانی كردنەوە:

**یەكەم:** ئەو كەسەی قوربانییەكە دەكات، دەبێت موسڵمانێكی كامڵی ژیر بێت و، ئەوەندەی لە ماڵ و سامان هەبێت لە بژێوی خۆی و ماڵ و خێزانی زیادبێت.

**دووەم:** قوربانی كردن لەلایەن كەسێكەوە، پاداشتەكەی ماڵ و منداڵەكەشی دەگرێتەوە، دروستە هەر ئەندامێكی ناو خێزانیش قوربانیەكی تایبەت بەخۆی بكات.

**سێیەم:** ئەو ئاژەڵەی كە پێشتر بۆ قوربانی دەستنیشان دەكرێت، ئەگەر مێیینە بوو نابێت بەهۆی ئاوس بوونیەوە لەڕو لاواز بووبێت، هەروەها نابێت مامەڵەی كڕین و فرۆشتن، یان گۆڕینەوە، یان بەخشینی پێوە بكرێت، دەبێت ئاژەڵێكی تەندروست و تەواو بێت، ئاژەڵی لاوازو كوێرو سەرشێت و گوێ و دونگ بڕاوو بریندار بۆ قوربانی ناشێن، بەڵام ئەگەر ئاژەلێك لە زگماكدا گوان یان دونگ یان كلكی نەبێت، ئەوە زیانی نیە.

**چوارەم:** لە ئاژەڵەكاندا، حوشترو گاو مەڕو بزن بۆ قوربانی كردن دەستنیشان كراون، نێر بن یان مێ جیاوازی نیە، مەڕو بزن بۆ كەسێك و گاو حوشتر بۆ حەوت كەس دەكرێن بە قوربانی، حوشتر دەبێت پێنج ساڵی تەواو كردبێت و، چووبێتە ساڵی شەشەمەوە، گاو بزنیش دەبێت دوو ساڵیان تەواو كردبن و، كەوتبنە ساڵی سێیەمەوە، مەڕیش دەبێت ساڵێكی تەواو كردبێت و كەوتبێتە ساڵی دووەمەوە، ئەو ئاژەڵانەش كە بۆ قوربانی دەستنیشان كراون، خواردنی بەروبوومەكانیان بۆ خاوەنەكانیان ڕەوایە تا ئەو ڕۆژەی سەردەبڕدرێن.

**پێنجەم:** واباشە ئەو كەسەی كە قوربانیەكە دەكات خۆی سەری ببڕێت، ئەگەر نەكرا وەكیلێك بۆ سەربڕینی قوربانیەكە بۆخۆی دابنێت، لە كاتی سەربڕینەكەشدا ناوی خوای لێ دەهێنرێت.

شەشەم: کەسێکی مردوو خۆی وەسیەتی کردبێت دەبێت قوربانی بۆ بکرێت، ئەگەر وەسیەتیشی کردبێت و هیچی لەپاش جێنەمابێت، قوربانییەکەی پێ بکرێت، ئەوە گونجاوە میراتگرەکانی قوربانیەکەی بۆ بکەن، بەڵام ئەو کەسەی کە قوربانیەکە دەکات، بۆی نیە لەو گۆشتە بخوات، قوربانیش بۆ کەسێکی زیندوو ناکرێت کە یەکێك نەبێت لە ئەندامانی خێزانەکەت، مەگەر ڕەزامەندیی ئەو کەسەی لەسەربێت و پرسی پێ کرابێت، دروستە هەموو خێرێکیش بۆ مردوو بکرێت و پێی دەگات.

**بڕگەی سێیەم:**

**بەرز نرخاندنی مەراسیمی جەژن و بەشداری کردنی نوێژی جەژن:**

نوێژی جەژن بۆ تاکەکان سوننەتە بکرێت، هەر کەس بیکات خێری پێ دەگات، ئەوەی نەیکات لەسەری لاناچێت، جا تاك بێت یان کۆمەڵ، چونکە سوننەتی کیفایە نیە.

## یاسای خواردن و خواردنەوەکان

خواردن و خواردنەوەکان لە دوو سەرچاوەی سەرەکییەوە بەدەست دێن: گیانەوەرییەکان و ڕووەکییەکان، گیانەوەرییەکانیش دەکرێن بە دوو بەشەوە: گیانەوەری وشکایی و گیانەوەری ئاویی، گیانەوەری وشکاییش دەکرێن بە دوو جۆرەوە: پاك و پیس.

### خواردنەوەکان

**بڕگەی یەکەم:**

هەموو سەرخۆشکەرێك پیسییە لە پیسییەکانی شەیتان، بەو مانایەی نەك تەنها هەر جەستەکەت، بەڵکو دڵ و دەروونیشت پیس دەکات، خواردنەوەیان لە موسوڵمانان قەدەغەیە.

یَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٩٠)المائدة

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بەڕاستی خواردنەوەی سەرخۆشکەرو قومارکردن و بت پەرستی و دابەشکردنی شتەکان بە تیرو پشك، پیسین لە کردەوەی شەیتانن، لێیان دوورکەونەوە، بەو هیوایەی سەرفرازبن﴾.

**بڕگەی دووەم:**

(بیرەو شەراب و عەرەق) و ئەو مەشروباتانەش کە بەهۆی گەنین و پێکهاتەی کحوولییەوە پەیدا دەبن، هەموو ماددە هۆشبەرەکانیش بە شل و توندو گازیانەوە، کە دەبنەمایەی هۆشبردنی ئادەمیزاد، بە هەموو شێوەیەك لە مرۆڤی موسوڵمان قەدەغەن، چونکە دەبنەهۆی دابڕانی کەسەکەو ئاگا لەخۆنەبوون لە یادکردنەوەی خواو جێبەجێ کردنی نوێژەکان، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ ... (٩١)المائدة

﴿بەڕاستی شەیتان دەیەوێت لە خواردنەوەی سەرخۆشکەرو قومار کردندا دوژمنایەتی و ڕقتان بخاتە نێوانەوە، ڕێگەشتان لێ بگرێت لە یادکردنەوەی خواو جێبەجێ کردنی نوێژەکان،﴾.

## بڕگەی سێیەم:

ئەگەر دکتۆرێك شەڕابێکی هۆشبەری وەکو چارەسەری بۆ کەسێکی نەخۆش دانا، ئەوە نەخۆشەکە نابێت پابەند بێت بە قسەی دکتۆرەکەوە، دەنا تاوانبار دەبێت و سزای داری حەددی لێدەرێت.

## بڕگەی چوارەم:

ڕێگە نادرێت بە کەس بۆ هەر مەبەستێك شەڕابێکی هۆشبەر بخواتەوە، مەگەر کەسێك پارویەگی لە قورگی گیرابێت و ئاوی دەست نەکەوێت پاروەکەی پێ قووت بدات.

## بڕگەی پێنجەم:

ئەو کەسەی کە مەشروبەکە دروست دەکات، ئەوەش کە دەیفرۆشێت، ئەوەش کە خزمەتکاریی لە پێشکەش کردنەکەیدا دەکات، ئەوەش کە دەیگوازێتەوە، ئەوەش کە دەیخواتەوە، هەموویان لە بەرانبەر سزاکانی خوادا یەك چارەنووسیان هەیە.

## بڕگەی شەشەم:

پیاوێکی موسوڵمانی مەشروب خۆر ئەگەر خواردنەوەکەی بەلاوە حەرام بێت، دەتوانێت ئافرەتێکی موسوڵمان مارە بکات، ئافرەتی مەشروب خۆریش لە پیاوی موسوڵمان مارە دەکرێت، ئەگەر مەشروبەکەی لەلا حەڵاڵ نەبێت و بە حەرامی بیخواتەوە.

## بڕگەی حەوتەم:

شەربەتی میوەکان ئەگەر نەگەنیبێت، خواردنەوەیان دروستە.

## بڕگەی هەشتەم:

هـەنگوین خواردنەوەیـەكی پاكـە بـە مـەرجێك نەگـەنیبێت، بـۆ چارەسـەری نەخۆشیەكان بەكاردێت.

يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ... (٦٩)النحل

﴿لـەنێو زگـی مێشـە هەنگوینـەدا خواردنەوەیـەك (هـەنگوینێك) دێتـەدەرێ كـە ڕەنگـەكانی جیاجیـان، (ئـەم هەنگوینـە) چـاكبوونەوەی نەخۆشـیەكانی تێدایـە بۆخەڵكی...﴾.

**بڕگەی نۆیەم:**

له گەنینی شتەكانەوە خواردنەوە سەرخۆشكەرەكان پەیدا دەبن.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشكەرێك شەڕابە، هەموو شەڕابێكیش قەدەغەیە).(١٤٤)

**بڕگەی دەیەم:**

خواردنەوەی ئەو خواردنەوانەی سەرخۆشكەرن پابەند نیە بەوەی كە زۆر یان كـەم بخورێتـەوە، بـەڵكو خواردنـەوە لوێچـێكیش قەدەغەیـە، لەبەرئـەوەی پێكهاتەیەكی پیسە.

**بڕگەی یازدە:**

لـە خورمـاو گـەنمو جـۆو هـەنگوین، بـەهۆی گەنینیانـەوە جۆرەكـانی شـەڕاب دروست دەكرێن، بۆیە خواردنەوەی ئاوی گەنیوی گەنمو ئاوی گـەنیوی جـۆو گەنینی هەنگوین له مرۆڤی موسوڵمان قەدەغەن.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: له خورما شـەرابێك دەردەهێنرێت، لـە گـەنمیش شـەرابێك دەردەهێنرێـت، لـە جـۆش شـەڕابێك دەردەهێنرێـت، لـە هەنگوینیش شەڕابێك دەردەهێنرێت).(١٤٥)

**بڕگەی دوازدە:**

هـەموو موسـوڵمانێكی كـاملی ژیـر، ئەگـەر خواردنـەوە سەرخۆشـكەرەكان بخواتەوە، وەكو تەمبێ كردن دەبێت سزا بدرێت، سزادانەكەشی چل شواركە.

## یاسای خواردنەکان

**بڕگەی یەکەم:**

**خواردنی گۆشتی کۆرپەی ئاژەڵەکان کە دوای سەربڕینی دایکەکانیان لەنێو منداڵدانی دایکەکانیان دەمرن، حەڵاڵە.**

أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ ...(١)المائدة

﴿.... (**خواردنی گۆشتی**) بەچکەی ئاژەڵەکانتان بۆتان ڕەواکراوە(**کە دوای سەربڕینی دایکەکانیان لە نێو زگی دایکیاندا دەمرن**)﴾.

**بڕگەی دووەم:**

حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِاللهِ بِهِ.....

**﴿لێتان قەدەغەکراوە گیانەوەری مردارو خوێن و گۆشتی بەرازو، ئەو گیاندارەی کە بێجگە لە خوا لەپێناوی کەسێکی تردا سەردەبڕرێ....﴾.**

وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ....

**﴿....لێشتان قەدەغەکراوە گیانەوەرێك کە خنکێنرابێت و، گیانەوەرێك بە لێدان مردبێت و، گیانەوەرێك هەڵدێرابێت و مردبێت و، گیانەوەرێك لە شەڕە قۆچدا مردبێت و، ئەو گیاندارەش کە دڕندە خواردبیەتی، مەگەر ئەوەی نەمردبێت فریای بکەون سەری ببڕن و پاکی بکەنەوە....﴾.**

وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ......

**﴿...ئەو گیانەوەرانەشتان لێ قەدەغە کراون کە لەسەر بتەکان سەردەبڕدرێن﴾.**

**بڕگەی سێیەم:**

..... فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٣)

**﴿....جا کێ لە ڕۆژێکی گرانی و برسیەتیدا ناچاربوو لەو قەدەغەکراوانە بخوات بە مەرجێك بە مەبەستی مەیلی تاوانکاریی نەبێت، ئەوە بەڕاستی خوا لێبوردەو خاوەن بەزەییە﴾.**

**تەنها ئەوەندە بخوات کە لە برسان نەمرێ.**

## بڕگەی چوارەم:

هەموو ئەو نێچیرە حەڵاڵانەی بەهۆی باڵندەو گیانەوەرە ڕاوکەرەکانەوە دەست خاوەنەکانیان دەکەون، یان ئەو گیانەوەرو باڵندە حەڵاڵانەی بەهۆی تیروکەوانەوە ڕاو دەکرێن، یان ئەو باڵندەو گیانەوەرە حەڵاڵانەی بەهۆی تەڵەو داوەوە دەگیرێن، یان بەهۆی بەرد تێگرتنەوە دەکوژرێن، ئەگەر زیندوو بن حەڵاڵن، بەڵام ئەگەر مرداربووبنەوە حەرامن.

فَكُلُواْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُواْ اسْمَ اللّهِ عَلَيْهِ وَاتَّقُواْ اللّهَ.... (٤)المائدة

﴿....جا بخۆن لەو نێچیرانەی بۆ ئێوەیان دەگرن و، لەکاتی سەربڕینیشیان ناوی خوایان لێ بێنن و، لە خواش بترسن﴾.

## بڕگەی پێنجەم:

هەموو گیانەوەرێکی ئاوی بەبێ سەربڕین گۆشتەکەی دەخورێت، زیندوو بێت یان مردوو، بە مەرجێك بۆگەنی نەکردبێت.

وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا..... (١٤)النحل

﴿ئەو خوایەیە دەریاشی ملکەچ کردووە بۆئەوەی گۆشتێکی تازەی لێوە بخۆن﴾.

واتە: خواردنی زیندەوەرەکانی نێو ئاو هەموویان حەڵاڵن. (١٤٦)

## بڕگەی شەشەم:

ئەو گیانەوەرو باڵندانەی لە وشکاییدا دژیەن و ڕێگە بە خواردنی گۆشتەکانیان دراوە، پێویستە سەربڕدرێن و کەوڵ بکرێن، ئەوسا گۆشتەکانیان بۆ خواردن ئامادە بکرێت، تەنها کوللە نەبێت سەربڕینی ناوێت.

## بڕگەی حەوتەم:

سەگ و بەرازو پشیلە و گورگ و شێرو پڵینگ و چەقەڵ و ورچ و جرج و مشك و دووپشك و مارو کەرکەدەن و مەیموون، گۆشتیان ناخورێت.

**بڕگەی هەشتەم:**

هەموو ئەو باڵندانەی نینۆك یان دەندووكەكانیان قولاپ دارن‌و، بۆ ڕاو بەكاردەهێنرێن، وەكو بازو شاهێن‌و هەڵۆ، گۆشتەكانیان ناخورێت.

**بڕگەی نۆیەم:**

هەر گیانەوەرێك ژەهردار بێت، وەكو مارو دووبشكەو جاڵجاڵۆكە، ناخورێت.

**بڕگەی دەیەم:**

وردە جانەوەری زەوی، وەكو كرم‌و قالۆچەو مێرولە ناخورێن، هەروەها پەپوولەو زەردەواڵەو جۆرەكانی مێش‌و مێشەهەنگوینە ناخورێن.

**بڕگەی یازدە:**

گۆشتی هەر گیانەوەرێكی وشكانی، كە بە زیندوویی حەڵاڵ بێت، بە مردارەوە بوویی حەرامە، مەگەر لەبەر ناچاریی.

**بڕگەی دوازدە:**

بار هەڵگرەكانی وەكو ئێسترو كەرو بارگین‌و فیل گۆشتیان ناخورێت، بەڵام گۆشتی ئەسپ‌و ماین لە هەموو كاتێكدا دەخورێت.

**بڕگەی سێزدە:** گۆشتی كەمتیارو ڕێوی‌و سمۆرەو كەروێشك‌و (ابن عرس)‌و (الوبر)‌و ژیشك‌و بزن مژەو كوللە دەخورێت.

**بڕگەی چواردە:** پەپو سلێمانەو پەڕەسێلكە نابێت ڕاو بكرێن‌و گۆشتەكەیان ناخورێت.

**بڕگەی پازدە:**

ئەگەر گیانەوەرێك شێر یان گورگ پەلاماری دابێت‌و نەمردبێت، ئەوا ناوی خوای لێ دەهێنرێت‌و سەردەبڕدرێت ئەو بەشەی كە شێرەكە یان گورگەكە دەمی تێناوە لادەبرێت‌و پاك دەكرێتەوە، ئەگەر لاش نەبرێت هەر پاكە، لەبەرئەوەی شێرو گورگ پاكن، بەڵام نابێت گیانەوەرەكە مردار بوو بێتەوە، چونكە لەم بارەدا هەموو جەستەی ئەو گیانەوەرە مرداربووە، حەرامە.

## بڕگەی شازدە:

**هەموو گیانەوەرێك کە بۆ خواردنی گۆشتەکەی سەردەبڕدرێت، پێویستە ڕووی لە قیبلە بکرێت‌و، ناوی خوای لێ بهێنرێت‌و بە چەقۆیەکی تیژ سەربڕدرێت، بەشێوەیەك کە قورگ‌و سورێنچکی ببڕدرێت، لەبەرئەوەی بەهۆی بڕینی ئەو دووانەوە، گیانەوەرەکە گیانی دەردەچێت‌و، خوێنەکەشی دێتەدەرەوە، هەر بەچکەیەکیش بەهۆی سەربڕینی دایکەکەی لە زگی دایکیدا بمرێت، گۆشتەکەی وەکو گۆشتی دایکەکەی وایەو حەڵاڵە.**

## یاسای باری کەسایەتی

### دەروازەی یەکەم

### هاوسەرگیریی

**برگەی یەکەم:** خوازبێنی.

خوازبێنی قۆناغی یەکەمی دروستکردنی پەیوەندیی خێزانی یە، بۆیە دەبێت لەوپەڕی نهێنیدا ئەنجام بدرێت.

هەموو نێرینەیەکی باڵغی عاقڵ، بۆی هەیە مێیینەك دەستنیشان بکات بۆئەوەی بیکات بە هاوسەری خۆیو خێزان پێك بهێنێت، بەم مەرجانەی خوارەوە:

**یەکەم:** ئەو نێرینەیە توانای جێبەجێ کردنی ئەرکی ژنو مێردایەتی هەبێت.

**دووەم:** ئەو نێرینەیە توانای جێبەجێ کردنی ئەرکی بەخێوکردنی خێزانەکەی هەبێت.

**سێیەم:** پێویستە ئەو مێیینەیە لە تەمەنو پلەوپایەدا لە ئاستی نێرینەکەدا بێت.

**(ئەبوبەکرو عومەر** (ڕەزای خوایان لێبێت)، **خوازبێنی فاتیمەیان کرد، پێغەمبەریش** (صلى الله عليه وسلم) **فەرمووی: فاتیمە بچووکە، ئینجا عەلی**(ڕەزای خوای لێبێت) **خوازبێنی کرد، پێغەمبەریش** (صلى الله عليه وسلم) **لێی مارەکرد).**(١٤٧)

چوارەم: پێویستە خوازبێنی کردنەکە بەهۆی شێوازێکی گونجاوەوە لە کەسوکاری مێینەکە بکرێت، کەسوکاری مێیینەکەش بەبێ پرسی کچەکە مافی ئەوەیان نیە خوازبێنی کردنەکە ڕەت بکەنەوە، یان بە بارێکی تایبەتی کۆمەڵایەتیەوە بیبەستنەوە، وەکو ژن بەژنە یان گەورە بە بچووك یان شیربایی.

**پێنجەم:** بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیی دوو بنەماڵە، دەتوانرێت کەسوکاری نێرینەکە، خوازبێنی کچێکی تەمەن شەش ساڵان بکەن بۆ نێرینەیەکی منداڵی خۆیان، جا کە گەورە بوونو خۆیان ناسی، ئەگەر هەردووکیان بە یەکتری ڕازی

بوون، ئەوا بەپێی یاساکانی مارەبڕین مارە دەکرێن، ئەگەر ڕازیش نەبوون، ئەوە وەکو هیچ ڕووی نەدابێت، ئەو کوڕە هیچ مافێکی لەسەر ئەو کچە نابێت.

شەشەم: نابێت کەسوکاری مێیینەکە بە شێوازی ناشیرین وەڵامی لایەنی خوازبێنی کەر بداتەوە، بەڵکو دەبێت شێوازێك بەکاربهێنرێت هەستی خوازبێنی کەری تێدا بریندار نەکرێت، نەوەك ئەم ڕەفتارە ئاژاوەی لێ بکەوێتەوە.

حەوتەم: کوڕو کچەکە پێش خوازبێنی، بۆ مەبەستی سەرنج دانە یەکتریو ڕەزامەندی دەربڕین بۆ خوازبێنی کردن، دەتوانن یەکتری ببینن.

(ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: لەلای پێغەمبەر بووم (صلى الله عليه وسلم) پیاوێك هات بۆلای: پێی ڕاگەیاند کە: ژنێکی لە ئەنسارەکان خواستوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: تەماشات کرد؟ گوتی: نەخێر، ئەویش فەرمووی: بڕۆ تەماشای بکە، چونکە لە چاوی ئەنسارەکاندا شتێك هەیە).(١٤٨)

هەشتەم: پیاوێك دەتوانێت بەدوای کەسێکی چاکدا بگەڕێت، بۆ ئەوەی کچێکی بەتەمەنی خۆی لێ مارە بکات.

(عومەری کوڕی خەتاب(ڕەزای خوای لێبێت) هات بۆلای عوسمانی کوڕی عەفان(ڕەزای خوای لێبێت) پێی گوت: ئەگەر دەتەوێت حەفسەت لێ مارە دەکەم، دوای چەند ڕۆژێك عوسمان وەڵامی دایەوە: لەوکاتەی ئێستادا ژن ناهێنم، جا عومەر چوو بە ئەبوبەکری گوت: ئەگەر ڕازی بیت حەفسەت لێ مارە دەکەم، ئەبوبەکریش وەڵامی نەدایەوە، دوای چەند ڕۆژێك پێغەمبەر(صلى الله عليه و سلم) حەفسەی مارەکرد، ئەبوبەکریش هاتەوە بۆلای عومەرو پێی گوت: من دەمزانی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) حەفسە مارە دەکات، نەشم ویست نهێنیەکەی ئاشکرا بکەم، بۆیە وەڵامم نەدایتەوە، ئەگەر ئەویش مارەی نەکردبا، من مارەم دەکرد).(١٤٩)

**بڕگەی دووەم: مارەکردن**

مارەکردن، پەیمانێکە لەنێوان پیاوو ژندا بۆ پێکهێنانی خێزان، کە لەو پەیمانەدا ماف و ئەرکی ئێستاو داهاتووی هەردووك لای تێدا دیاری دەکرێت، ئەو پەیمانە بە تەلاقدان، یان بە مردنی یەکێکیان دوای وەرگرتنی مافەکانیان کۆتایی پێدێت، پێویستە مەرجی تەمەن و باری کۆمەڵایەتی هەردووکلا لەبەرچاو بگیرێت، بۆیە گونجاونییە کچێکی بچووك لە پیاوێکی بە تەمەن مارە بکرێت، چونکە هەر لە سەرەتاوە دەرك بەوە دەکرێت کە پیاوەکە نەتوانێت ئارەزووەکانی ئافرەتەکە جێبەجێ بکات و ببێتەهۆی ئەوەی ئافرەتەکە تووشی خراپەکاری ببێت، کچ لە تەمەنی نۆ ساڵیەوە بۆ کاری جووت بوون ئامادە دەبێت.

خوا لەبارەی مارەیی نێوان نێرو مێوە دەفەرموێت:

...وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَاقاً غَلِيظاً (٢١)النساء

﴿ئەو ژنانەش لەکاتی شوو کردندا، پەیمانێکی پتەوو توندوتۆڵیان لە ئێوە وەرگرتووە﴾.

## ئەم ئافرەتانەی لە پیاو مارە ناکرێن

**یەکەم:** دایکی خۆی، دایکی دایکی و دایکی باوکی، واتە نەنکەکانی.

**دووەم:** زڕ دایکەکانی، دوای تەڵاقدانیان یان مردنی باوکیان.

**سێیەم:** کچەکانی.

**چوارەم:** خوشکەکانی.

**پێنجەم:** پوورەکانی، خوشکی دایك و خوشکی باوك.

**شەشەم:** ئەو دایەنەی شیری پێداوە.

**حەوتەم:** هەموو کچەکانی ئەو دایەنەی کە ئەوکەسە شیری لێ خواردووە، جا لەپێش خۆیەوەبن یان لەگەڵ خۆیدا بووبن یان لەدوای خۆیەوەبن.

**هەشتەم:** دایکی هاوسەرەکەی(خەسووی)، یان دایکی خەسووی.

**نۆیەم:** خوشکی خێزانەکەی، هەتا خێزانەکەی لە سێبەری مارەیی پیاوەکەدا بێت.

**دەیەم:** کچی ئەو ئافرەتە بێوەژنەی کە پیاوەکە مارەی کردۆتەوەو لەگەڵیشیدا جووت بووە.

**یازدە:** بووکەکان، (ژنی ئەو کوڕانەی کە لە پشتی خۆیانن).

**دوازدە:** پووری خێزانەکان، (خوشکی دایکی یان خوشکی باوکی خێزانەکەی). هەتا ژنەکە لەسێبەری پیاوەکەدا بێت ئەو پوورانە قەدەغەن لەوپیاوە.

**(پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئافرەتێك شوو بە پیاوێك ناكات كە یەكێك لە پورەكانی ژنی ئەو پیاوەبن.)**.(١٥٠)

**سێزدە:** هەموو ئافرەتێکی خاوەن مێردیش هەتا تەڵاق نەدرێت، یان مێردەکەی نەمرێت، قەدەغەیە لە کەسێکی تر مارە بکرێت.

**بۆ مارەكردنی ئافرەتێك لە پیاوێك، پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەكرێت:**

**یەکەم:** دەبێت بەخێوکەری ئافرەتەکەو دوو شاهید لەبەردەم ئەو کەسە ئامادەبن کە لەیەکیان مارە دەکات.

**(پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هیچ مارە بڕینێك پێك نایەت، مەگەر سەپەرشتیكەری مێیینەكە ئامادە بێت)**.(١٥١)

بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە بێوەژن بوو، ئەو مەرجە دانانرێت کە ڕەزامەندیی بەخێوکەرەکەی وەربگیرێت، بەومانایەی بێوەژنەکان لە شووکردنەوەیاندا سەربەستن، چونکە جارێکیتر بەم تاقیکردنەوەیەدا تێپەڕیون و چاکەو خراپەی خۆیان دەزانن.

**(پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: بێوەژن هەتا ڕاوێژی پێ نەكرێت مارە ناكرێت، كچیش هەتا خۆی ڕەزامەندی دەرنەبڕێت مارە ناكرێت،**

گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا، ڕەزامەندیەکەی چۆنە؟ فەرمووی ئەوەیە ئەگەر پرسیاری لێکرا بێدەنگ بێت).(١٥٢)

بەو مانایەی ئەگەر پرسیاری لێکراو بێ دەنگ بوو، واتە ڕازییە.

دووەم: لەلایەن مارەکەرەکەوە پرسیار لە هەردووکیان دەکرێت، ئایا بە یەکتری ڕازین؟ دەبێت هەر یەکێکیان پرسیاری لێ بکرێت و وەڵامیش بداتەوەو شاهیدەکانیش گوێبیستی پرسیارو وەڵامەکان بن، ئەگەر هەرکامێکیان ڕازی نەبێ، ئەو مارەکردنە سەرناگرێت، بۆیە کچی بچووك لەسەر بێشکە بە هیچ شێوەیەك مارەیی نایەت، چونکە نەگەیوەتە ئەو قۆناغەی مەرجەکانی ڕادەربڕین و قبووڵ کردنی تێدا بێت.

سێیەم: دەبێت هەردووکیان لەوانەبن کە باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام هەیەو، بە یاساکانیەوە پابەندن، بەلام ئەگەر پیاوێکی موسوڵمان لەگەڵ ئافرەتێکی جوولەکە یان مەسیحی لەسەر هاوسەرگیریی ڕێك کەوتن، ئەوا لەیەکتری مارە دەکرێن، بەو هیوایەی لە دواڕۆژدا ئەو ئافرەتە بەهۆی هەڵسوکەوتی مێردەکەی و خۆشەویستیی منداڵەکانی بێتەناو ئایینی ئیسلامەوە، بەلام هەرگیز ئافرەتی موسوڵمان لە پیاوی جوولەکە یان مەسیحی مارە ناکرێت.

چوارەم: دەبێت شاهیدەکان لەو کەسانەبن کە ڕاستگۆن و ڕاستی و نهێنیەکانی مارەبڕینەکە بپارێزن، بۆ ئەم مەبەستە پێویستە دوو پیاو لە مەراسیمی مارەکردنەکە بەشداربن، لە ژن مارەکردندا ئافرەت ناکرێت بە شاهید.

پێنجەم: پەیمانەکەش لەسەر کاغەز بنووسرێت و، حەقە مارەییەکەی تێدا دیاری بکرێت و، ژن و پیاوو مارەکەرو شاهیدەکان واژۆی لەسەر بکەن و بەروارەکەی دیاری بکرێت.

شەشەم: کچەکە یان کوڕەکە دەتوانن خۆیان ئامادەنەبن و وەکیلەکانیان لە جیاتی ئەوان ئامادەبن، بەمەرجێك پێشتر بەنووسراو، یان بەڕادەربڕین، لە

بەردەمی مارەکەرو شاهیدەکاندا ڕەزامەندییان لەسەر ئەم هەڵوێستەی خۆیان دەربڕیبێت.

حەوتەم: هەر مارەکردنێك لەژێر باری ترس و تۆقاندن و هەڕەشەدا بێت، ئەوا ئەو مارەبڕینە پێك نایەت.

هەشتەم: لە ئایینی ئیسلامدا شیربایی حەرامە، ژن بەژنەش ئەگەر وەکو مەرجێکی مارەکردنەکە بێت، ئەوا قەدەغەیە، بەڵام ئەگەر برای بووك و خوشکی زاوا، یان پیاوێکی خزمی بووك و کچێکی خزمی زاوا دڵیان بەیەکەوە بوو، ئەوە دەتوانن مارەبڕی بکەن، بە شێوەیەك نەبێتە مەرجێك پەیوەندیی بە مارەبڕینی بوك و زاواکەوە هەبێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ژن بەژنەی قەدەغەکردوە، ژن بەژنەش ئەوەیە کە یەکێك بە یەکێکی تر بڵێت: کچەکەت، یان خوشکەکەتم لێ مارە بکە، هەتا منیش کچەکەم، یان خوشکەکەمت لێ مارە بکەم، هەقە مارەییشیان لەنێوانیاندا نەبێت).(١٥٣)

نۆیەم: ئەگەر کەسێك توانای ژن هێنانی ئافرەتی سەربەستی نەبێت، دەتوانێت کەنیزەیەکی خاوەن باوەڕ مارە بکات، لەبەرئەوەی کەنیزە نیوەی مافەکانی مێیینەی سەربەستی هەیە بەسەر هاوسەرەکەیەوە لە مارەکردن و تەڵاقدانیشدا.

دەیەم: ئافرەت ئافرەتێکی تر بە شوو نادات و، ئافرەتیش بەبێ پرسی کەسوکارەکەی ناتوانێت خۆی بەشوو بدات.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: ئافرەت مافی بە شوودانی ئافرەتێکی تری نییە، ئافرەت بۆخۆشی ناتوانێت خۆی بە مێرد بدات، ئەوە ئافرەتە داوێن پیسەکانن بۆخۆیان خۆیان بەمێرد دەدەن).(١٥٤)

یازدە: مەراسیمەکەش بە خوێندنی سوورەتی (الفاتحە)و سەڵاوات لێدان لەسەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کۆتایی پێ دەهێنرێت و، شیرینی تێدا دەخورێتەوەو بە فەرمی مارەکردنەکە ڕادەگەیەنرێت.

دوازده: گونجاوه دوای مارەکردنەکە ئاهەنگ بگێڕرێت و، گۆرانی تێدا بگوترێت و، دەفەی تێدا لێ بدرێت، بە مەرجێك لە سنووری یاساکانی ئیسلام تێنەپەڕێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە هەندێك شوێنی مەدینەدا تێپەڕی، لە تەنیشتێکەوە گوێی لێبوو، ئافرەتان دەفەکانیان لێدەدان و دەیانگوت: ئێمە کچانی بەنی نەجارین، ئای لەوخۆشیەی لەگەڵ محمەد ئێمە جیرانین، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((ئەی خەڵکی مەدینە)، خوا دەزانێت منیش ئێوەم خۆش دەوێت).(١٥٥)

(عائشە(ڕەزای خوای لێبێت)، کچێکی خزمی خۆی بە شوودا بە یەکێك لە ئەنسارەکانی مەدینە، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم)هات، فەرمووی: ناردتان بۆ ماڵە مێردەکەی؟ گوتیان: بەڵێ، جا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: ئەدی کەستان لەگەڵ نەنارد، لەوانەی گۆرانی دەڵێن؟ عائیشە گوتی: نەخێر، جا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: ئەنسارەکان نەتەوەیەکن ئەوەیان لەنێودایە، کە بەسەر ئافرەتەکانیاندا هەڵدەن، جا ئەگەر یەکێکتان لەگەڵ ناردبایە کە گوتبای: (أتيناكم أتيناكم فحيانا وحياكم)).(١٥٦)

(لە کوردەواریشدا دەگووترێت: هاتینەوە هاتینەوە بوکمان هێناو هاتینەوە).

سێزدە: گونجاوە پیرۆزبایی لە بوك و زاوا بکرێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە پیرۆزبایی لێ دەکردن، دەیفەرموو:(خوا بە پیرۆزی بگێڕێت و پیرۆزی خواشتان بە سەرەوە بێت و لە خێروچاکەدا یەکتان خات).(١٥٧)

چواردە: دەکرێت دەعوت و دەعوەتکاریی بکرێت.

(ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێت)، دەڵێت: پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) نەبینیوە لە ژن هێنانەکانیدا دەعوەتێکی وەهای کردبێت، وەکو ئەوەی بۆ زەینەبی کرد، لەو دەعوەتەدا مەڕێکی سەربڕی).(١٥٨)

پێویسته ئەو کەسەش کە دەعوەت دەکرێت، بچێت بۆ دەعوەتەکە.

(پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لەئێوە بۆ نان و خوانێکی ژن گواستنەوە بانگ کرا، با بە دەنگ داواکەوە بچێت).(١٥٩)

پازدە: لەکاتی گواستنەوەدا، ئەگەر بووکەکە کچ بێت، دەبێت مێردەکەی حەوت شەو لەگەڵیدا بمێنێتەوە، ئەگەر بێوەژنیش بێت سێ شەو.

(پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی: بێوەژن حەقی سێ شەوی هەیە لەگەڵیدا بمێنیتەوەو، کچیش حەوت شەو).(١٦٠)

شازدە: لەکاتی جووت بووندا، ژن و پیاوەکە سەربەستن بە ڕووتی لەگەڵ یەکتر جووت ببن، بەڵام نابێت ئاژەڵانە بە ئاشکرا جووت بوونەکە ئەنجام بدرێت.(١٦١)

(پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لەئێوە چووە لای هاوسەرەکەی، با خۆی پەنادات، با وەکو کەرەکێویەکان خۆی بەرەڵا نەکات).(١٦٢)

حەڤدە: مێینەیەك لە پیاوێك مارە ناکرێت، کە پووری ئەو مێینەیە ژنی ئەو پیاوەبێ.

برگەی سێیەم: ژن و مێردایەتی

(ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ژنی چاك ئەو ژنەیە، پیاو کە دەیبینێ، پێی دڵخۆش ببێت و، کە فەرمانی پێکرد، فەرمانەکەی جێبەجێ بکات و، کە لێیەوە دووربوو، لە(خیانەتی) خۆی و (لە دەستدانی) ماڵەکەی بپارێزێت).(١٦٣)

(پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ژیانی دنیا لەزەت وەرگرتنە، خۆشترین لەزەت وەرگرتنیش ئەوەیە پیاو ژنێکی باشی هەبێت). (١٦٤)

پیاوان بۆیان هەیە خاوەنی چوار مێینەبن لەیەك کاتدا، بەڵام ئەگەر بۆی نەکرا لە نێوانیاندا دادگەر بێت، ئەوا یەك ئافرەتی سەربەست، ئەگەر نەشیتوانی ئافرەتێکی سەربەست بهێنێت، ئەوا کەنیزەیەك دەکاتە هاوسەری خۆی.

فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُواْ (٣)النساء

﴿چەندتان پێ خۆشە لە ژنان بخوازن، دوو، سێ، چوار، ئەگەر مەترسیشتان هەبوو لەوەی نەتوانن لەنێوان ژنەکاندا دادگەر بن، ئەوا یەك ژن بخوازن، یان یەکێك لەو کەنیزانەی لەژێر دەسەڵاتی ئێوەدان، ئەوەش کەمترین شتە بۆئەوەی تووشی ستەم نەبن﴾.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: ئەو کەسەی کەنیزەکەی ئازاد دەکاتو، پاشان مارەی دەکات، دوو پاداشتی دەست دەکەوێت).(١٦٥)

بەپێی دەسەڵاتی ئایەتەکە، لە هەموو بارێکدا ژمارەی هەرەزۆری ژنەکان نابێت لە چوار ژن زیاتربن، ئەمە یاسایەکی بنبڕە، بەڵام کە ئەگەرێك هاتە پێشەوە، پیاوەکە نەتوانێت لە نێوان ژنەکاندا دادگەر بێت، ئەوا ژمارەکەیان کەم دەکرێتەوە بۆ یەك ئافرەتی سەربەست، یان کەنیزەیەك لەوانەی لەژێر دەسەڵاتی ئێوەدان. کەواتە ژمارەی کەنیزەکانیش بۆ کاری ژنو مێردایەتی هەر لە سنووری چوار ژنەکەدایە.

ژنو مێردایەتی ئەركو مافن بەسەر یەکتریەوە، دەبێت هەردووك لایان پێیانەوە پابەندبن، لەوانە:

یەکەم: ئافرەت دەبێت گوێڕایەڵی مێردەکەی بێت، لە بەرانبەریشدا مێردەکەی دەبێت پابەند بێت بە بەخێوکردنی هاوسەرو منداڵەکانیو بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانیان.

دووەم: ئافرەت دەبێت ئارەزووەکانی مێردەکەی جێبەجێ بکاتو لە پێخەفەکەی نەتۆرێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: سوێند بەوکەسەی گیانی محەمەدی بەدەستە، ئافرەت ناتوانێت مافەکانی خوا بە تەواوەتی جێبەجێ بکات، هەتا مافی مێردەکەی جێبەجێ نەکات.).(١٦٦)

(پێغەمبەر(صلى الله عليه و سلم) فەرموویەتی: (ئەگەر ئافرەتێك شەوێك لە شوێنێك مایەوەو پێخەفی هاوسەرەکەی جێهێشتبوو، ئەوا فریشتەکانی خوا تا بەرەبەیان نەفرینی لیَ دەکەن).(١٦٧)

سێیەم: پێویستە پیاوەکە حەقی ئافرەتەکە بدات لەکاتی ئەنجامدانی کارێك کە ئەرکی ئافرەتەکە نیە، وەکو جل شۆردن و نان کردن و شیردان بە کۆرپە، ئەگەر واش ڕێککەوتن لەنێو خۆیاندا حسابێکیان بۆ ئەم لێکدانەوەیە نەکرد، یان باری ژیانیان وەهابوو کە بیر لەوشتانە نەکەنەوە، ئەوە پێویستە ئافرەتەکە گەردنی پیاوەکەی ئازاد بکات.

چوارەم: لە کاری جووت بووندا، پێویستە پیاوەکان ئاژەڵانە خۆیان بە ژنەکانیاندا نەدەن، بەڵکو پێویستە سەرەتا دەستبازیی لەگەڵ یەکتری بکەن، بۆئەوەی کاری جووت بوونەکە خۆشترو ئاسانتر بێت و، هەردووکیان لەزەتی لیَ وەربگرن، بۆشیان هەیە چۆنیان ئارەزوو لێیە ئاوەها کاری جووت بوونەکە ئەنجام بدەن، بە مەرجێك مەبەستەکە شوێنی دیاریکراو بێت بۆ زاوزێ کردن.

پێنجەم: لەعنەتی خوا لەو کەسەیە کە بۆ کاری جووت بوون کۆمی ژنەکەی بەکاردێنێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (خوا نەفرینی لەو کەسە کردووە کە لەدواوەوە دەچێتە لای ئافرەتەکەی خۆی).(١٦٨)

شەشەم: ئافرەت مافی ڕەوای خۆیەتی ماڵی تایبەتی خۆی هەبێت، چونکە لە بنەڕەتدا حەوا بۆئەوە دروستکرا هەتا ئادەم لەلای نیشتەجیَ بێت، بەڵام ئەگەر هەردووکیان ڕازی بوون بەو شێوەیەی بۆ خۆیان دەیانەوێت، ئەوە سەربەستن.

حەوتەم: پێویستە ئافرەت باوەڕی بەو بڕگە شەرعیە هەبێت کە ئەگەر ژنێك بەشی ئارەزووەکانی مێردەکەی نەکرد، ئەوا مێردەکەی بۆی هەیە بیکات بە دوو یان سیَ یان چوار ژن، بۆئەوەی لە کاری بەدڕەوشتی دوور بکەوێتەوەو ببێتە مایەی ئەوەی منداڵی زۆریش پەیدا بن و ئوممەتی محمد(صلى الله عليه وسلم)

زیاد بن، ئەگەر ژنەکەش هەستی بەوە کرد کە مێردەکەی ناتوانێت تەواوی ئارەزووە جنسیەکانی تێر بکات، ئەوا بۆی هەیە لەلای گەورەی موسوڵمانان داوای جیابوونەوە بکات، نەوەك تووشی کاری بەدڕەوشتی ببێت.

**هەشتەم:** ئەرکی سەرشانی ئافرەتە، ماڵ و سامان و شەرەفی مێردەکەی بپارێزێت و، منداڵەکانی بەپەروەردە کردنێکی دروست بۆ پەروەردە بکات.

**نۆیەم:** دوای مردنی پیاوەکە، ئافرەتەکە بۆی هەیە دوای چوار مانگ و دە ڕۆژ شوو بکاتەوە، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً يتربَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ (٢٣٤) البقرة

﴿ئەو پیاوانەتان کە دەمرن و، لەدوای خۆیان هاوسەرەکانیان جێدەهێڵن، ئەوا ئەو بێوەژنانە چوار مانگ و دە ڕۆژان چاوەڕێ دەکەن (**لە مێردکردنەوەیان**)، جا کاتێك گەیشتنە کۆتایی ماوەی دیاری کراویان، ئەوا تاوان لەسەر ئێوە نییە بەوەی کە ئەو بێوەژنانە بە شێوەیەکی چاك و دروست دەیانەوێت بیکەن (**لە شوو کردنەوەیاندا**)﴾.

**دەیەم:** دوای مردنی مێردەکەی، ئافرەتەکە هیچ فشارێکی ناخرێتەسەر، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهاً.... (١٩ النساء)

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بۆتان ڕەوا نییە بە زۆرەملێ ژنەکان (**دوای مردنی مێردەکانیان**) بکەن بە میراتی خۆتان...﴾.

هەروەها نابێت ئافرەتەکە دوای مردنی مێردەکەی، لە ماڵەکەی دەربکرێت، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً وَصِيَّةً لأَزْوَاجِهِمْ مَّتَاعاً إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيَ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٢٤٠)البقرة

﴿ئەو پیاوانەشتان کە دەمرن و، لەدوای خۆیان هاوسەرەکانیان جێدەهێڵن، (لەسەریان پێویستە) راسپاردەیەك بۆ هاوسەرەکانیان دیاری بکەن(بە بڕێك لە ماڵ و سامان) بۆ لەزەتی ژیانیان بۆ ماوەی ساڵێك، (لەو ماوەیەشدا) لەماڵەکانیان دەرناکرێن، جا ئەگەر خۆیان ماڵەکانیان بەجێهێشتن (بۆ شووکردنەوە)، ئەوە تاوان لەسەر ئێوە نییە بەوەی ئەو ئافرەتانە بۆخۆیانی دیاری دەکەن (لە مێردکردنەوە) بە رێگەی چاك، خواش خاوەن دەسەلاَت و لێزانە (لە وەرگرتنەوەی تۆڵە لەو کەسانەی ئەم بڕیارە جێبەجێ ناکەن)﴾.

یازدە: بۆ پتەوکردنی خۆشەویستی نێوان ژن و مێرد ئەوە پیاوەکە بۆی هەیە مەمکی ژنەکەی بمژێت.

(ئافرەتێك هات بۆلای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە دەموچاوی(ئەبی حوزەیفەی) مێردمدا رِق و قین دەبینم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: مەمکەکانتی بدەیە بیانمژێت، ئافرەتەکە گوتی: چۆن دەبێت ئەو پیاوێکی پیرەو مەمکەکانمی بدەمێ بیمژێت؟ پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) پێکەنی و فەرمووی: (دەزانم ئەو پیاوێکی پیرە)، جا ئافرەتەکە دوای ئەوەی مێردەکەی لە شەڕی بەدر گەڕایەوە، مەمکەکانی خۆی دایە بیانمژێت، پاشان هاتەوە بە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم)، گوت: لەدوای ئەوەوە کە مەمکەکانم دایە، هیچ شتێکم لەڕووی (ئەبی حوزەیفەدا) نەبینیەوە کە رِقم لێی بێتەوە).(١٦٩).

لێرەدا مژینەکە بۆ مەبەستی شیرخواردن نیە، بەڵکو بەهۆی مژینی مەمکەکانەوە هەموو دەمارەکانی هەست و سۆزی ئەو ئافرەتە دەجووڵێن بەرانبەر ئەو کەسەی مەمکی دەمژێت.

## دەروازەی دووەم

### منداڵ بوون

لە ئەنجامی جووتبوونی نێرومێدا، تۆو دەکرێتە نێو منداڵدانی ئافرەتەوە، پیاو خاوەنی تۆوەکەیە، ئافرەتیش خاوەنی کێڵگەکەیە، بۆیە کۆرپەکە لە نێوان هەردووکیاندا هاوبەش دەبێت، کۆرپەی نێر یان مێ، لە تۆوەکەی باوکەوە دەردەکەوێت، کامەیان زووتر خۆی گەیاندە هێلکەکە، ئەوە کۆرپەکە لەو ڕەگەزە دەبێت، ئینجا لە کاتی جووتبوونەکەدا ئەگەر پیاوەکە زووتر ئاوەکەی هاتەوە، ئەوا شێوەی کۆرپەکە دەچێتەوە سەر شێوەیماڵە مامەکانی، بەلاّم ئەگەر ئاوی ئافرەتەکە زووتر هاتەوە، ئەوا شێوەی کۆرپەکە دەچێتەوە سەر ماڵە خاڵەکانی.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئاوی پیاو خەستو سپی یە، ئاوی ژنیش ڕوونو زەردە، کامەیان پێش ئەوەی تریان ڕژا، ئەوە شێوەی کۆرپەکە بۆلای خۆی دەبات). (١٧٠)

### قۆناغەکانی دروستبوونی کۆرپە:

(پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: بەربەست لەنێوانی جندوکەو دامێنی ئادەمیزاددا کاتێك دەچێتە پەرژینی جووتبوونەوە، ئەوەیە کە بڵێت: بسم الله).(١٧١)

کاتێك کە تۆوەکە دەگاتە هێلکەکە، ئەگەر هەموو هۆکارە بۆماوەیی و هەنووکەییەکان یاریدەدەر بوون، ئەوا پیتێن ڕوودەداتو، ئەم هێلکە پیتێنراوە، بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت:

### قۆناغی یەکەم:

لە ئەنجامی پیتاندنی هێلکەکە لەلایەن تۆوەکەوە، هێلکە پیتێنراوەکە لە ماوەی چل ڕۆژدا لە گەشەو دابەشبوونو زیادکردن بەردەوام دەبێت.

ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ (١٣)

﴿پاشان کردمان بە ئاوێك لە ئارامگەیەکی پارێزراودا(لە جێگەیەکی ئارامو پتەودا)﴾.

**قۆناغی دووەم:**

پێکهاتەیەکی تازە دروست دەبێت پێی دەڵێن(علقه)، واتە: خۆهەڵواسەر کە لەشێوەی پارچە خوێنێکی مەییو دایەو، خۆی بە دیواری منداڵدانەوە هەڵدەواسێتو، پەیوەندییەکی لەگەڵدا پەیدا دەکات، ئەم قۆناغە ماوەی چل ڕۆژ دەخایەنێت.

ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً.....

﴿ئینجا لەو ئاوە پارچە خوێنێکی مەییومان دروست کرد،...﴾.

**قۆناغی سێیەم:**

دوای چل ڕۆژ لە گەشە، ئەم خۆهەڵواسەرە دەبێت بە پارچە گۆشتێك کە بتوانرێت بجوورێت (مضغة)، بەردەوام دەبێت لەگەشەکردن تا ماوەی چل ڕۆژ.

فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً.....

﴿ئینجا لەو پارچە خوێنە مەییوە، پارچە گۆشتێکمان دروستکرد(وەکو ئەوگۆشتەی کە بجوورێت)، ﴾

**قۆناغی چوارەم:**

ئەو پارچە گۆشتە دەبێت بە ئێسكو، بۆ ماوەی چل ڕۆژ لە گەشە بەردەوام دەبێت.

فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا.....

﴿ئینجا لەو پارچە گۆشتە جووراوە ئێسقانەکانمان دروست کردن﴾.

**قۆناغی پێنجەم:**

پارچە ئێسکەکە گەشە دەکاتو، گۆشتی پێوە دروست دەبێتو، پەروەردگار شێوەی ئادەمیزادی دەداتیو، فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت، گیانی بەبەردا دەکات،

فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آَخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ (١٤)المؤمنون

﴿پاشان ئێسقانەکانمان بە گۆشت داپۆشین، ئینجا بە شێوەی دروستکراوێکی تر دامان مەزراند، جا پیرۆزیی بۆ ئەو خوایەی لەنێوان وێنەکێشەکاندا، باشترین وێنەکێشە﴾.

لەو کاتەدا تەمەنی کۆرپەکە چوار مانگو دە ڕۆژە، هەر لەسەر ئەو بنەمایەشە درێژترین ماوەی ماتەمینی، بۆ ئافرەتێك هاوسەرەکەی مردبێت چوار مانگو دە ڕۆژە، بۆئەوەی لەو ماوەیەدا ڕوون ببێتەوە کە ئافرەتەکە دووگیانە یان نا.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەر یەکێك لەئێوە، لە ماوەی چل ڕۆژدا دروستکردنەکەی لە زگی دایکیدا کۆدەکرێتەوە، ئینجا وەکو ئەو لەو کۆکراوەیە لە ماوەی چل ڕۆژدا (علقە) پێکدێت، ئینجا وەکو ئەو لە ماوەی چل ڕۆژدا لەو(علقە)یە (مضغة) پێکدێت ، ئینجا فریشتەیەك دەنێردرێت گیانی بە بەردا دەکاتو، چوار بڕیاری بەسەردا دەسەپێنێت لە بارەی ئەوەی کە بۆی نووسراوە لە ڕزقو ڕۆزییەکەیو، کاروپیشەکەی لە ژیانداو، کاتی مردنەکەیو، خۆشیو ناخۆشی ژیانی). (١٧٢)

**قۆناغی شەشەم:**

کۆرپەکە تا ماوەی دیاریکراوی تەواو دەبێت، لە گەشەکردن بەردەوام دەبێت، ئەوسا لە دایك دەبێت، هەر کە لە دایك بوو، دەست دەکات بە گریان.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەر منداڵێك لە دایك بێت، لە کاتی لەدایك بووندا، شەیتان هەر دەستی دەداتیٚ، جا بەهۆی ئەم دەست لێدانەوە دەست بە هاوار دەکات، تەنها مریەمو کوڕەکەی نەبێت(لە کاتی لە دایك بوونیان، شەیتان نەیتوانیوە دەستیان بداتیٚ). (١٧٣)

پێویستە منداڵ کە لەدایك بوو، یەکسەر بانگێکی وەکو بانگی نوێژکردنی بە گوێی ڕاستەدا بخوێنرێتو قامەتێك بە گوێی چەپیدا بخوێنرێت، لەبەرئەوەی

هـەر منـداڵێك لـە دايـك دەبێـت لەسـەر بنـەما بنەڕەتيەكـەى مرۆڤايـەتى لـە دايـك دەبێت، كە سەرەتا لەسەر ئەو بنەمايە دروستكراوە كە خوا بپەرستىٚ.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموويەتى: هەر كۆرپەيەك لە دايك بێت مەگەر هەر دەبێـت لەسـەر داهێنانـە يەكەميەكـەى پـەروەردگار لـە دايـك بێـت، پاشـان فەرمووى: ئـەم ئايەتـە بخوێننـەوە: ﴿داهێنانـە يەكەميـەكانى پـەروەردگارن كـە ئادەميزادى لەسەر داهێنان، هيچ گۆڕانكاريەك بۆ دروستكراوەكانى خوا نييە، ئەوە ئاييني ڕاستەو دامەزراوە...﴾).(ئايەتى ٣٠ سووڕەتى الروم). (١٧٤)

ئينجـا كۆرپەكـە لەلايـەن كەسـێكى شـارەزاوە، بـەهۆى خورمايـەكى نەرمـەوە، مەلاٚشـووى هەڵدەدرێتـەوە، بۆئـەوەى فێـرى خـواردن بێـت، چـونكە تـا ئەوكاتـە كۆرپەكە دەمى بۆ خواردن بەكارنەهێناوە، بۆيە ئەو مەلاٚشـووە بـەهۆى شـتێكى شيرينەوە بەرز دەكرێتەوە بۆئەوەى منداڵەكە فێرى خواردن بێت.

(منـداڵيان بـۆ پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) دەهێنـان، ئـەويش دوعـاى پـيرۆزىو بەرەكەتى بۆ دەكردنو مەلاٚشووى هەڵدەدانەوە)). (١٧٥)

وا باشە كۆرپەكە هەر لەهەفتەى يەكەمدا خەتەنە بكرێت.

ئينجـا بـۆ ناسـينى كۆرپەكـە، نـاوێكى لێـدەنرێت، ناوەكـان كامـەيان خۆشـن؟ كامەيان ناوى بەهێزو بەختەوەرن؟ كامەيان پەروەردگار خۆشى دەوێن؟

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموويەتى: (ئێـوە ڕۆژى دوايـى بـە نـاوى خۆتانو باوكەكانتانەوە بانگ دەكرێن، جا ناوى چاك بۆخۆتان دابنێن)). (١٧٦)

كەواتـە: نـاويش يەكێكـە لـەو تايبەتمەندييانـەى مـرۆڤ، كـە بـۆ قۆنـاغى بـوونى ڕۆژى دوايى دەگوازرێتەوە.

(پێغەمبـــەر(صـــلى الله عليـــه وســـلم) فەرمووويـــەتى: (منداڵەكانتان)بـــە نـــاوى پێغەمبەرەكانـەوە نـاوبنێنو، ناوەكـانى عبداللـەو عبـدالرحمن خۆشەويسـترين نـاون لـەلاى خـواو، ڕاستترينيشـيان(حـارث و همـام)ن، (حـەربو مـوڕڕە)ش ناخۆشترينو بەد ترينيانن)). (١٧٧)

## یاسای دیاریکردنی ماوەی زگپڕیی

**بڕگەی یەکەم:** لایەنی کەمی ماوەی زگپڕیی شەش مانگە.

**بڕگەی دووەم:** لایەنی هەرە زۆری ماوەی زگپڕیی چوار ساڵە.

**بڕگەی سێیەم:** ماوەی زگپڕیی لەلای زۆرینەی ئافرەتان، نۆ مانگو چەند ڕۆژێکە.

## یاسای شیر پێدانی کۆرپە

**بڕگەی یەکەم:**

ماوەی شیر پێدانی کۆرپە، دوو ساڵی تەواوە.

**بڕگەی دووەم:**

دایکەکە دەتوانێت دایەنێك بۆ منداڵەکەی بگرێت بۆئەوەی شیری بداتێ.

**بڕگەی سێیەم:**

لەکاتی شیرخواردنی کۆرپەیەکی ساوا لە شیری دایەنێك، هەموو ئەو کۆرپانەی کە لە شیری ئەو ئافرەتە دەخۆن، یان پێشتر خواردویانە یان دواتر دەیخۆن، دەبن بە براو خوشکی ئەو کۆرپەیە لە شیرخواردنداو، بۆ کاری جووتبوون لەیەکتری قەدەغە دەکرێن، دایەنە شیردەرەکەش وەکو دایکی کۆرپەکە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەوەی لە پەیوەندیەکانی خزمایەتیدا ڕێگەی پێ نەدراوە، لە پەیوەندیەکانی شیرخواردنیشدا ڕێگەی پێ نادرێت).(١٧٨)

**بڕگەی چوارەم:**

جەمێك یان دوو جەم، مژێك یان دوو مژ شیر خواردن، نابێتە هۆی سەپاندنی دەسەڵاتی بڕگەی سێیەم، کە لەسەرەوە باسمان کرد.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: جەمێك یان دوو جەم، مژێك یان دوو مژ شیر خواردن، نابێتە هۆی ئەوەی کە دایەنەکە، یان کچی دایەنەکە لەو منداڵە قەدەغە بکرێن). (١٧٩)

بڕگەی پێنجەم:

کرێی دایەنەکەو بەخێوکردنی کۆرپەکە، لەسەر باوکی کۆرپەکەیە، بە ئەندازەی ئەوەی کە لە توانایدایە.

## ماوەی زەیستانی

لەگەڵ منداڵبوونەکە، ئافرەتەکە تووشی ئێش و ئازارێکی زۆر دەبێت، بۆیە بۆ ماوەیەك دوای منداڵبوونەکە، خوێن لە ئافرەتەکە دێتەخوارەوە، ئەو خوێنە بە خوێنی زەیستانی ناسراوە، کە نوێژو ڕۆژو لە ئافرەتەکە قەدەغە دەکات، کەمترین ماوەی زەیستانی چاوچوقاندنێکە، درێژترین ماوەشی شەست ڕۆژە، لە زۆرینەی ئافرەتانیشدا (چل)ڕۆژە، وەکو ماوەی قۆناغێك لە قۆناغەکانی گەشەی کۆرپەکە لەنێو منداڵداندا، مەرج نیە خوێنەکە بۆماوەی چل ڕۆژ بەردەوام بێت، بەڵام بۆ ماوەی چل ڕۆژ نابێت مێردەکەی نزیکی بکەوێتەوە بۆ کاری جووت بوون، چونکە لە ماوەی ئەو چل ڕۆژەدا، کۆئەندامەکە دەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی و، ئامادە دەبێتەوە بۆ سەرەتای زگپڕبوونێکی تازە.

(لە(ابن عباس)ەوە (ڕەزای خوایان لێبێت)، دەڵێ: (ئافرەتە زەیستانەکان چل ڕۆژ یان دەوروبەری چل ڕۆژ چاوەڕوان دەکەن (لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی سەرشانیان بۆکاری خواپەرستی و جووت بوون تا پاك دەبنەوە).(١٨٠)

## دەرووازەی سێیەم

## تەڵاق

تەڵاقدان، هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی مارەبڕینە لە نێوان ژن و مێرددا، بۆیە پێش ئەوەی کار بگاتە ئەوەی تەڵاقدان پەیڕەوی بکرێت، پێویستە هەندێك هەنگاوی چاکسازی بندرێن، لەوانە:

**هەنگاوی یەکەم:**

ئامۆژگارییان بکەن.

وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ....

﴿ئەو ژنانەش کە مەترسی ئەوەتان لێیانە خۆیان لەئێوە بە گەورەتر بزانن و، ڕقەبەرایەتی و یاخی بوونیان نواند، جا ئەوانە ئامۆژگاریان بکەن﴾.

**هەنگاوی دووەم:**

لەسەر جێگە لەگەڵیان مەخەون.

وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ.........

﴿... (ئەگەر چاك نەبوون)، لە جێگەی نووستنەکەتان لەگەڵیاندا مەخەون﴾.

**هەنگاوی سێیەم:**

لێدان بە مەبەستی تەمبێ کردن.

وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً (٣٤)النساء

﴿(دوای ئەوە، ئەگەر چاك نەبوون)، لێیان بدەن، جا ئەگەر گوێڕایەڵیان کردن، ئەوە ئێوەش ڕێگەیەکی وەهایان لەگەڵ مەگرنەبەر کە ستەمیان لێ بکەن، بەڕاستی خوا گەورەو بەرزو پیرۆزە، (نەکەن ستەمیان لێ بکەن دەنا سزاتان دەدات)﴾.

**هەنگاوی چوارەم:** پەیڕەویکردنی ئاشتەوایی.

وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزاً أَوْ إِعْرَاضاً فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحاً وَالصُّلْحُ خَيْرٌ.....( ١٢ النساء)

﴿ئەگەر ئافرەتێك ترسا لە دژایەتی و ڕقەبەرایەتی مێردەكەی، ئەوە تاوانیان لەسەر نییە ئەگەر نێوانەكەیان چاك بكەنەوەو، چاككردنەوەی نێوانەكەش باشترە....﴾

**هەنگاوی پێنجەم:** ناوبژی كردن.

وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَماً مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً (٣٥)النساء

﴿ئەگەر مەترسیشتان هەبوو لەوەی لە یەكتری جیاببنەوەو(دوژمنایەتی و ناحەزی كەوتە نێوانیانەوە)، ئەوا ناوبژیوانێك لە كەس‌وكاری پیاوەكەو ناوبژیوانێك لە كەس‌وكاری ژنەكە بنێرنە لایان، ئەگەر مەبەستیان چاككردنەوەی نێوانەكە بێت، خوا سەركەوتوویان دەكات، بەڕاستی خوا (بە هەموو شتێك) زانایەو، (لە چارەسەری كێشەكاندا) شارەزایە﴾.

**هەنگاوی شەشەم:**

ئەگەر هەر چارەسەر نەكرا، بە ناچاری هانا بۆبەر (یەك) تەڵاقدان دەبرێت، بۆئەوەی بوارێك بمێنێت بۆ گەڕانەوەی ئافرەتەكە بۆلای مێردەكەی، خوا دەفەرموێ:

الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ

﴿تەڵاق (لێك جیابوونەوەی ژن‌ومێرد) دوو قۆناغە، ئینجا یان بە شێوەیەكی باش دەهێنرێتەوە، یان بە ڕێزەوە ئازاد دەكرێ....﴾.

لەئایەتەكەدا دوو دەسەڵاتی شەرعی دەردەكەون:

دەسەڵاتی یەكەم:

تەڵاقەكان سێ دانەن، لە ماوەیەكی دیاریكراودا جێبەجێ دەكرێن، بە لە دەستدانی دووانیان، بواری ئەوە هەیە ژن‌و مێردەكە بگەڕێنەوەوە بۆلای یەكتری و بەردەوام بن لە ژن‌و مێردایەتیدا، تەڵاقی سێیەمیش یەكلایی كەرەوەیە، گەڕانەوەی تێدا نییە.

دەسەڵاتی دووەم:

تەڵاق دوو قۆناغە، قۆناغی یەکەم ئەو کاتەیە کە ناوی تەڵاقدانەکەی تێدا دەهێنرێت، ئافرەتەکە لە پیاوەکە قەدەغە دەکرێت بۆماوەیەکی دیاریکراو، ئەو ماوە دیاریکراوە بە(ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ) دەستنیشان کراوە، کە ماوەی سێ پاکبوونەوەو سێ خوێنی بێ نوێژی دەگەیەنێت بەسەریەکەوە، بۆئەوەی بزانرێت ئافرەتەکە دووگیانە یان نا، ئەو ماوەیەش لە ئافرەتێکەوە بۆ ئافرەتێکی تر زیادو کەم دەکات، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموویێت:

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ (١ الطلاق)

﴿ئەی پێغەمبەر، ئەگەر (ویستتان) دەست لە ژنەکانتان بەردەن، ئەوا لە ماوەی دیاریکراوی خۆیدا دەستیان لێ بەردەن و، ماوە دیاریکراوەکەش بژمێرن....﴾.

**بڕگەی یەکەم:**

پیاو بۆی هەیە بە دوو قۆناغ لە هاوسەرەکەی جیابێتەوە:

**قۆناغی یەکەم:**

ئادەمیزاد بۆی هەیە، سێ جار ژنەکەی تەڵاق بدات، جاری یەکەم: بۆی هەیە لە ماوەی دیاریکراوی تەڵاقدانەکەدا بیگێڕێتەوە، جا ئەگەر گێڕایەوە، ئەوە تەڵاقێکی کەوتووە، ئەگەر دوای ماوەیەك بۆ جاری دووەم تەڵاقیدایەوە، ئەوا لەم بارەشدا لە ماوە دیاریکراوەکەدا بۆی هەیە بیگێڕێتەوە، بەڵام ئەگەر تەڵاقی سێیەمی دا، ئەوا بواری گەڕانەوەی نیە، بەڵام هەر دەبێت ماوەی دیاریکراوی تەڵاقدانەکە تەواو بکات، بۆیە ئەگەر یەکێك سێ جار ژنەکەی تەڵاقدا، ئەوە بواری گەڕانەوەی نیە، بەڵام هەر دەبێت قۆناغی دووەمی تەڵاقدانەکە تەواو بکات بۆئەوەی بزانرێت ئافرەتەکە دووگیانە یان نا.(١٨١)

ناوهێنانی هەرسێك تەڵاقەکەش بە یەکەوەو بە جارێك، وەکو ئەوەی بگوترێت: هەرسێك تەڵاقت کەوتبێت، ئەوە هەرسێك تەڵاقەکان دەکەون، بەڵام هەر دەبێت ماوە دیاریکراوەکە تەواو بکرێت، بۆئەوەی بە یەکجاری لە یەکتری جیاببنەوە.

(فاتمەی کچی قەیس دەڵێ: بە پێغەمبەری خوام گوت(صلى الله عليه وسلم): مێردەکەم سێ بەسێ تەڵاقی داوم، ئێستاش مەترسی ئەوەم هەیە دەستدرێژی بکاتە سەرم، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکرد کە لەلای نەمێنێ و بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی تر).(١٨٢)

قۆناغی دووەم: ماوەکەی بریتییە لە تێپەڕبوونی ماوەی سێ جار بێ نوێژی و پاکبوونەوە، لەو ڕۆژەوە هەژمار دەکرێت کە ناوی تەڵاقدانەکەی تێدا هێنراوە، بۆئەوەی لەو ماوەیەدا ڕوون ببێتەوە ئاخۆ ئافرەتەکە دووگیانە یان نا، ئەگەر ئافرەتەکە نەشزانێت کە تەڵاقدراوە، ئەوە ماوەکەی لەو ڕۆژەوە دەست پێدەکات کە مێردەکەی تەڵاقی داوە.

برگەی دووەم:

ئەگەر دوای قۆناغی دووەم ڕوون بۆوە کە ئافرەتەکە دووگیانە، ئەوا ماوەی دیاریکراوی تەڵاقدانەکە دوادەکەوێت بۆ دوای منداڵ بوونەکە.

وَأُولاتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ... (٤ الطلاق)

﴿....ئەو ئافرەتانەش کە دووگیانن، ئەوا ماوەی دەست لێك بەردانەکەیان دانانی زگەکانیانە....﴾.

برگەی سێیەم:

ئەگەر دوای قۆناغی دووەم، ڕوون بۆوە کە ئافرەتەکە دووگیان نیە، ئەوا پیاوەکە بۆی هەیە یەکێك لەو دوو ڕێگایە بگرێتە بەر:

ڕێگەی یەکەم: دەستبەرداری ئافرەتەکە ببێت و حەقە مارەییەکەی بداتێ و بەڕێزەوە بەڕێی بکات.

ڕێگەی دووەم: لە جاری یەکەم و دووەمی تەڵاقدانەکەدا، دەتوانێت لە بڕیارەکەی قۆناغی یەکەمی پەشیمان ببێتەوەو ژنەکەی بگێڕێتەوە لای خۆی، بە مەرجێك دەبێت مارەی بکاتەوە، لەبەرئەوەی ماوە دیاریکراوەکە تێپەڕیوە.

بەڵام لە تەڵاقدانی جاری سێیەمدا، دوای تەواو بوونی ماوەی دیاریکراوی تەڵاقدانەکە، بە هیچ شێوەیەك پیاوەکە بۆی نیە ژنەکە بگێڕێتەوە لای خۆیو دەبێت دەست لێك بەردەن.

فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ (٢ الطلاق)

﴿جا ئەگەر گەیشتنە کاتی دیاریکراوی خۆیان، یان بە چاکەکاریی بیانگرنەوە لای خۆتان، یان بە چاکەکاری لێیان جیاببنەوەو(دەستیان لیَ بەردەن)....﴾.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەگەر لە دوای قۆناغی دووەم ڕوون بۆوە کە ئافرەتەکە دووگیانە، ئەوا تەڵاقدانەکە دوا دەخرێت بۆ دوای منداڵ بوونەکە، ئینجا ئەگەر تەڵاقدانەکە دوای منداڵ بوونەکە ئەنجامدرا، ئەوا پێویستە پیاوەکە حەقە مارەییەکەی بداتیو بەڕێزەوە بەڕێی بکات، منداڵەکەش لەلای دایکی دەمێنێتەوە بە مەرجێك دایکەکە شوو نەکاتەوە، باوکەکەش ئەرکی شیر پێدانو بەخێوکردنی منداڵەکە دەدات بە ژنە تەلاقدراوەکە، ئەگەر هەردووکیشیان ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی دایەنێکی بۆ بگرن، ئەوا هەموو ئەرکەکە لەسەر باوکەکەیە.

**بڕگەی پێنجەم:**

لەکۆتایی قۆناغی دووەمدا، ئەگەر تەڵاقدانەکە تەڵاقێك یان دوو تەڵاق بێت، ئەوا پیاوەکە خاوەن مافترە لە هێنانەوەی ژنەکەی، واتە: ئەگەر پیاوەکە ڕازی بێت ژنەکەی بهێنێتەوە، ئەوا هیچ مافێك بۆ ئافرەتەکە نامێنێت نەگەڕێتەوە ژێر سایەو سێبەری مێردەکەی، بەمەرجێك مارە بکرێتەوە، کەسێکی تریش کە نیازی هەبوو بێت ئەو ژنە تەڵاقدراوە مارە بکاتەوە، ئەومافەی لیَ وەردەگیرێتەوە، بەهۆی پەشیمان بوونەوەی میردەکەی لە تەڵاقدانەکە.

وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُواْ إِصْلاَحًا (٢٢٨ البقرة)

﴿مێردی ئەو ژنانە مافدارترن (لە خەڵکی تر) بە گێڕانەوەیان، ئەگەر ویستیان بەینەکەیان چاك بکەنەوە....﴾.

**بڕگەی شەشەم:**

**ئەگەر پیاوەکە ژنەکەی تەڵاقدا، هیچ مافێکی بەسەر ئەو ئافرەتەوە نامێنێت و، نابێت ڕێگر بێت لە شوو کردنەوەی، پێویستە هەردووکلا بە ڕێزەوە لە یەکتری جیاببنەوەو ژنەکەش حەقە مارەییەکەی خۆی بە تەواوی دەستکەوێت.**

وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْاْ بَيْنَهُم بِالْمَعْرُوفِ...(٢٣٢ البقرة)

**﴿ئەگەر ژنەکانیشتان تەڵاقدان و، ماوەی دیاریکراوی خۆیان تەواوکرد، تەنگیان پێ هەڵمەچنن و ڕێگەیان لێ مەگرن شوو بکەنەوە بەو هاوسەرانەی (کە خۆیان دەستنیشانیان دەکەن)، ئەگەر لە نێوان خۆیاندا ڕازی بوون بە چاکەکردن لەگەڵ یەکتری....﴾.**

**بڕگەی حەوتەم:**

**لە ماوەی نێوان قۆناغی یەکەم و دووەمدا، ئافرەتەکە لای مێردەکەی دەمێنێتەوە، بەڵام بۆ کاری ژن و مێردایەتی نزیکی یەکتری ناکەونەوە، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:**

أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُم مِنْ وُجْدِكُمْ وَلا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِنْ كُنَّ أُولاتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ..(٦ الطلاق)

**﴿ئەو ئافرەتانەی چاوەڕوانی ماوەی دیاریکراوی خۆیان دەکەن، ئێوە لەکوێ نیشتەجێ بوون ئەوانیش لەوێ نیشتەجێ بکەن، بەپێی توانای خۆتان، زیانیشیان پێ مەگەیەنن، بەوەی تەنگیان پێ هەڵچنن، ئەگەر هاتوو (ئەو ئافرەتانە) دووگیانیش بوون، ئەوا (ماڵ و سامانیان) پێ ببەخشن هەتا زگەکەیان دادەنێن....﴾.**

**بڕگەی هەشتەم:**

**کەسێك ئافرەتێك مارە بکات و، پێش ئەوەی بچێتەلای تەڵاقی بدات، ئەوە ماوەی دیاریکراوی ناوێت، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:**

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً (٤٩)الاحزاب

**﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر ئافرەتە خاوەنباوەڕەکانتان مارە کردن، پاشان تەڵاقتاندان پێش ئەوەی بچنەلایان، ئەوا ئێوە هیچ مافێکتان بەسەریانەوە نیە، بەوەی ماوەی دیاریکراوی جیابوونەوەیان بۆ بژمێرن، حەقە مارەییەکەشیان بە تەواوەتی بدەنیٚ و سەربەستیان بکەن، بە سەربەست کردنێکی جوان﴾.**

**(ئەگەر کەسێك ئافرەتێکی مارەکردو پاشان تەڵاقیدا، پێش ئەوەی چووبێتەلای بۆ جووت بوون، ئەوا ئەو تەڵاقدانە دیاریکردنی ماوەی تەڵاقدانی ناوێت و، یەکسەر تەڵاقەکە دەکەوێت و، ئافرەتەکە بۆی هەیە ڕاستەوخۆ دوای تەڵاقدانەکە شوو بکاتەوە، ئەگەر حەقە مارەییشی بۆ دیاریکرا بوو، ئەوا نیوەی حەقە مارەییەکەی دەدرێتیٚ، ئەگەر مارەییشی بۆ دیاری نەکرا بوو، ئەوا ئەوکەسە بەپێی توانای خۆی یارمەتی دەدات و، بە ڕێزەوە دەستی لیٚ بەردەدات، (ئەم ڕوونکردنەوەیە لە تەفسیری(الطبری)وەرگیراوە).**

وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ (٢٣٧) **البقرة**

**﴿ئەگەر هاتوو تەڵاقیشتان دان پێش ئەوەی بچنەلایان، پێشتریش(پێش نیازی تەڵاقدانەکە)، ئەگەر شتێکتان بەسەر خۆتانەوە دیاری کردبێت بۆیان، ئەوا دوای تەڵاقدانەکە نیوەی ئەندازەی ئەو بڕە ماڵەیان دەکەوێت کە خۆتان بۆتان دیاری کردوون...﴾.**

### بڕگەی نۆیەم:

**ئەو ئافرەتانەش کە خوێنیان پێدا نایەت، یان لەخوێن پێداهاتن وەستاونەوە، ماوەی تەڵاقدانەکەیان سیٚ مانگە، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:**

وَاللائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللائِي لَمْ يَحِضْنَ...(٤ الطلاق)

﴿ئەگەر دوودڵیش بوون لە ماوەی دەست لێك بەردانی ئەو ئافرەتانەی لە خوێنی بێ نوێژی بێ هیوا بوون، یان ئەو ئافرەتانەی كە خوێنیان پێدا نەهاتووە، ئەوە ماوەكەیان سێ مانگە....﴾.

**برگەی دەیەم:**

ئەوئافرەتانەی مێردەكانیان دەمرن و، كاری جووتبوونیان لەگەڵ مێردەكانیان كردووە، لەدوای چوار مانگ و دە ڕۆژ لە مردنی مێردەكانیان مافی ئەوەیان هەیە شوو بكەنەوە، لە دیاریكردنی ئەوماوە دیاریكراوەشدا مەبەستێك هەیە، بۆئەوەی بزانرێت ئافرەتەكە دووگیانە یان نا، خوا لە سوورەتی(البقره)دا دەفەرمووێت:

وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً يتربَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً(٢٣٤)

﴿لەنێو ئێوەشدا، ئەو پیاوانەی كە دەمرن و لەدوای خۆیان هاوسەرەكانیان جێدەهێڵن، ئەوا ئەو بێوەژنانە، (لە مێردكردنەوەیاندا) چوارمانگ و دە ڕۆژان چاوەڕێ دەكەن﴾.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه و سلم) فەرموویەتی: ڕەوا نییە بۆ ئافرەتێك باوەڕ بە خواو ڕۆژی دوایی بێنێ و لە سێ ڕۆژ زیاتر ماتەمینی دانێت لەسەر مردوویەك، مەگەر لەسەرمێردەكەی چوار مانگ و دە ڕۆژان).(١٨٣)

**برگەی یازدە:**

لەوماوە دیاریكراوەی كە تێیدا دەردەكەوێت ئافرەتەكە دووگیانە یان نا، ئەگەر پیاوەكە، یان ژنەكە بمرێت، ئەوا میرات لە یەكتری دەگرن، بە مەرجێك لە قۆناغی یەكەمدا هەرسێك تەلاقەكەی بەكارنەهێنابێت، یان جاری سێیەمی تەلاقدان نەبێت.

بڕگەی دوازدە:

ئەو ئافرەتانەی کە مێردەکانیان بێ سەروشوێنن، دەبێت چوار ساڵ چاوەڕێی مێردەکانیان بکەن.

(عومەرو عوسمان(ڕەزای خوایان لێبێت) فەرموویانە: ژنی پیاوێکی بێ سەروشوێن، چوار ساڵان چاوەڕێی (گەڕانەوەی مێردەکەی) دەکات، پاشان چوار مانگ‌و دە ڕۆژان ماوەی دەست لێك بەردانەکەی دەژمێرێت، ئینجا شوو دەکاتەوە. (١٨٤)

بڕگەی سێزدە:

ئەگەر پیاوێك دوای تەواوبوونی ماوە دیاریکراوەکە ژنەکەی خۆی تەڵاقداو لەیەکتری جیابوونەوە، ئەوە بۆی نیە مارەی بکاتەوە، هەتا ئەو ژنە شوو بە پیاوێکی تر نەکاتەوە، ئینجا ژنەکە دوای مردنی مێردی دووەمی، یان تەڵاقدانی لەمێردی دووەمی، ئەگەر لەگەڵ مێردی یەکەمی ڕازی بوون، دەتوانن بە گرێبەستێکی نوێ هاوسەرگیری بکەنەوە، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يتراجَعَا إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ (٢٣٠)البقرة

﴿جا ئەگەر پیاوەکە، ژنەکەی تەڵاقدا، ئەوا لە دوای تەڵاقدانەکەوە ئەو ژنە بۆ ئەو پیاوە حەڵاڵ نابێت، تا ژنە تەڵاقدراوەکە مێردێکی تر نەکات بە پیاوێکی تر، جا ئەگەر ئەو پیاوەی دووەم، ئەو ژنەی تەڵاقدا، ئەوا تاوان لەسەر مێردە کۆنەکەو ژنەکەش نیە، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆلای یەکتری‌و(جارێکی تر بەپێی یاساکانی ئیسلام ببنەوە بە ژن‌و مێرد)، ئەگەر زانییان کە بەڕاستی دەتوانن سنووری یاساکانی خوا دابین دەکەن﴾.

لەم بڕگە یاساییەدا هیچ فێڵ‌و بڕوبیانویەك ناکرێت، قەدەغەیە پیاوەکە لەگەڵ پیاوێکی تردا ڕێککەوێت، بەوەی ژنە تەڵاقدراوەکەی خۆی لێ مارە بکات، پاشان ئەو پیاوە ژنەکەی بۆ تەڵاقداتەوەو، ئەو جارێکی تر لەخۆی مارە بکاتەوە، هیچ مەجالێکی تێدا نیە، هەردەبێت پیاوی دووەم ژنە تەڵاقدراوەکە

ماره بكاتو لەگەڵیدا جووت بێت، جا ئەوكاتە ژنەكە ئەگەر مێردەكەی بمرێت یان تەلاّق بدرێت، ئەوە دەتوانێت شوو بە مێردەكەی یەكەمی بكاتەوە، هەر یەكێك لە پیاوی یەكەمو پیاوی دووەم، ئەگەر بیانەوێت بە فێڵێك ئەم كارە ئەنجام بدەن، ئەوا هەردووكیان دەكەونە بەر لەعنەتی خواو پێغەمبەر.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەعنەتی لەو كەسە كردووە كە ژنەكەی بە جاش مارە دەكاتەوەو، لەو كەسەش كە كاری جاشایەتیەكەی بۆ دەكات).(١٨٥)

**بڕگەی چواردە:**

ئەگەر ژنەكانیشتان تەلاّقدان، ئەوە دەبێت دوو شاهید هەبێت لە نێوانتان، لەم بارەیەوە خوا دەفەرمویێت:

وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ (٢)الطلاق

﴿دوو شاهیدیش بگرن لەوانەی لەنێو خۆتان بە دادپەروەر ناسراون، (كە بوون بە شاهیدیش)، بەڕاستیو دروستی شاهیدیی بۆ خوا بدەن، ئەو(شاهیدیدانە) بۆ ئێوە، پەندو ئامۆژگارییان لیّ وەردەگیریّ، بۆ كەسێك كە باوەڕ بە خواو ڕۆژی دوایی دێنیّ...﴾.

**بڕگەی پازدە:**

ئەگەر پیاوەكە ژنەكەی تەلاّقدا، مافی ئەوەی نیە ئەوەی كە پێشتر داویەتی بە ژنەكەی، لێی وەربگرێتەوە، خوا لەم بارەیەوە دەفەرمووێت:

وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَاراً فَلاَ تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْئاً أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُّبِيناً (٢٠النساء)

﴿ئەگەر ویستیشتان ژنێك تەلاّق بدەن بۆئەوەی لەجێی ئەو ژنێكی تر بێننو،ماڵوسامانێكی زۆریشتان دابوو بە یەكێك لەو ژنانە(كە دەتانەوێت لێی جیاببنەوە)، ئەوا هیچیان لیّ وەرمەگرنەوە، ئایا بە بوختان بۆهەڵبەستنو تاوانێكی ئاشكرا ئەم ماڵەیان لیّ وەردەگرنەوە؟﴾.

**بڕگەی شازدە:**

ئەگەر كەسێك لەبەرخۆیەوە ژنەكەی تەڵاقداو، لای كەس باسی نەكرد، ئەوا یاساكەی بەسەردا ناسەپێت، وەكو بەخشینێك لەلایەن خواوە.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (خوا بۆ ئوممەتەكەی من، گوێ ناداتە ئەوەی كەسێك لەبەرخۆیەوە بڕیارێك بدات، مادام ئیش بە بڕیارەكەی نەكات و بە زمان نەیڵێ و، لەنێو خەڵكی بڵاوی نەكاتەوە ). (١٨٦)

**بڕگەی حەڤدە:**

ناوهێنانی تەڵاق لەكاتی ڕق هەستان و تووڕە بووندا، نابێتە هۆی كەوتنی تەڵاقەكان.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (لە كاتی ڕق هەستان، تەڵاقدان و كۆیلە ئازاد كردن، كاریان پێ ناكرێت). (١٨٧)

**بڕگەی هەژدە:**

ئەگەر كەسێك ژنەكەی بە شێوەیەك تەڵاق بدات، ناوی چەندجارەی تەڵاقەكانی تێدا نەهێنێت، وەكو ئەوەی بڵێت: یەكجاری تەڵاقم دایت، یان بۆ هەتاهەتایی تەڵاقم دایت، پێویستە پرس بە پیاوەكە بكرێت، مەبەستی لە قسەكەی چی بووە، جا ئەگەر پیاوەكە دانی پێدانا كە مەبەستی هەرسێك تەڵاقەكە بووە، ئەوا تەڵاقەكە دەكەوێت، بەڵام ئەگەر پیاوەكە وای ڕاگەیاند كە مەبەستی تەڵاقی یەكەم بووە، ئەوا لەسەر ڕاستی و ناڕاستی قسەكەی، سوێند دەدرێت، جا دوای سوێندخواردنەكە، مافی ئەوەی دەبێت ژنەكەی بۆ لای خۆی بگەڕێنێتەوە.(١٨٨)

**بڕگەی نۆزدە:**

ئەگەر سوێند خواردنێك بەناوی تەڵاقەوە بێت، وەكو ئەوەی بڵێت: بەتەڵاقم من ئەو كارەم نەكردووە، ئەوە بە (كینایە) دادەنرێ، واتە سوێند خواردنەكە بۆ تەڵاقدان نیە بەڵكو بۆ پاكانەیە لەوەی كە ئەو كارەی نەكردووە، بۆیە بەم جۆرە سوێند خواردنە تەڵاقی ناكەوێت، ئەگەر لە دڵدا مەبەستی تەڵاقدان نەبێت.

### بڕگەی بیست:

ئەگەر کەسێك تەڵاقدانەکەی وەکو سوێندێك بە مەرجێکەوە بەستەوە، وەکو ئەوەی بڵێت: هەرسێك تەڵاقم کەوتبن، ئەگەر هاتوچۆی ماڵە جیرانەکەمان بکەیت، بە چوونی ژنەکە بۆ ماڵەجیرانەکە، هەرسێك تەڵاقەکان دەکەون، بەڵام بە نەچوونی ژنەکە بۆماڵە جیرانەکە، هیچ تەڵاقی ناکەوێت.

### بڕگەی بیست ویەك:

ئەو کەسەی بە هاوسەرەکەی دەڵێ: تۆ بۆمن وەکو پشتی دایکم وای، ئەوە تەڵاقی ناکەوێت، بەڵام پێویستە ئەوکەسە حەقە سزای ڕەفتارەکەی وەربگرێت، هەروەك لە یاسای سزادانەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

### بڕگەی بیست و دوو:

ئەو پیاوەی سوێند لە ژنەکەی دەخوات، لە چوار مانگ زیاتر لەگەڵی جووت نەبێت، ئەوە ژنەکە ئەو ماوەیە چاوەڕێ دەکات و، دوای چوار مانگ لەلای دادوەر سکاڵای لەسەر تۆمار دەکات، جا ئەگەر لەوماوەیەدا، پەشیمان بۆوە، ئەوە دەبێت حەقە سزای سوێندەکەی بدات، ئەگەر پەشیمانیش نەبۆوە، ئەوا دەکەونە بەر یاسای تەڵاقەوە، هەروەك لەیاسای سزادانەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

### بڕگەی بیست و سێ:

لەلای خوا تەڵاقدان ڕقاویترینی شتە حەڵاڵەکانە کە داویەتی بە بەندەکانی.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (تەڵاق ڕقاویترینی ئەو مافانەیە کە خوا بۆ ئادەمیزادی حەڵاڵ کردوون). (١٨٩)

## یاسای لێك داماڵین

## (الخلع)

**شێوازێكی تری تەڵاقدانە، بە مانای لێك داماڵینی ژن و مێرد.**

**(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بۆنی بەهەشت لە ئافرەتێك قەدەغەیە، كە بەبێ هیچ كێشەیەك داوای تەڵاق لە مێردەكەی دەكات).** (١٩٠)

**بڕگەی یەكەم:**

**ئەم یاسایە تەواوكارییە بۆ یاسای تەڵاق، لە یاسای تەڵاقدا بڕیار لە دەستی پیاوەكەدایە كە ژنەكەی تەڵاق بدات یان نا، بەڵام لەم یاسایەدا بڕیاری جیابوونەوەكە لەدەست ئافرەتەكە دایە، بە ڕەزامەندی هەردووكلا.**

**بڕگەی دووەم:**

**ژنێك ئەگەر پیاوەكەی خۆی بە دڵ نەبوو، جا لەبەر هەرهۆیەكی گونجاوبێت، ئەوە دەتوانێت واز لە حەقە مارەییەكەی بێنێ و، ماڵ و سامان و خشڵەكانی بداتەوە بە مێردەكەی و جیاببێتەوە، بە مەرجێك ڕەزامەندی مێردەكەی لەسەربێت.**

فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ ...(٢٢٩ البقرة)

**﴿....جا كە ترسان لەوەی سنووری یاساكانی خوا دابین نەكرێن، ئەوە تاوان لەسەر هیچ كامیان نیە، ئەگەر ژنەكە مارەیی و ماڵ و سامانەكەی بداتەوە بە پیاوەكە، بەرانبەر ئەوەی ئازاد بێت و لێی جیابێتەوە....﴾.**

**بڕگەی سێیەم:**

**لە هەموو بارێكدا دەبێت لێك داماڵینەكە بە ئارەزووی ئافرەتەكە بێت و، هیچ فشارێكی نەخرابێتە سەر و ڕەزامەندی پیاوەكەشی لەسەربێت.**

**بڕگەی چوارەم:**

**ئەگەر ئافرەتەكە كارێكی داوێنپیسی كرد، ئەوا مێردەكەی بۆی هەیە ئافرەتەكە ناچار بكات واز لە حەقە مارەیی و ماڵ و سامانەكەی بێنێت، لە بەرانبەر ئەوەی**

ئازاد بكرێت، چونكە لەم بارەدا، ئەگەر مێردەكە پەیڕەوی یاسای تەڵاقدان بكات، زەرەرمەند دەبێت، چونكە مێردەكە تەڵاقدانی نەویستووەو، تاوانی ئافرەتەكەیە ئەم بارەی هێناوەتە پێش، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلاَّ أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ (١٩)النساء

﴿تەنگیشیان پێ هەڵمەچنن بەوەی هەندێك لەوەی پێتان داون(**بەناوی مارەیی**) لێیان وەربگرنەوە، مەگەر(**ئەو ئافرەتانە**) بەد ڕەوشتیەكی ئاشكرا بكەن﴾.

**بڕگەی پێنجەم:**

ئەگەر ژنەكە نەیەوێت تەڵاق بدرێتو، داوای جیابوونەوەكە لەلایەن پیاوەكەوە بێت، ئەوە دەكەوێتەوە بەر یاسای تەڵاق، لێرەدا دەبێت پیاوەكە تەواوی حەقە مارەییەكە بدات بە ژنەكەیو، ئەو زێڕو ماڵو سامانەش كە داویەتیە لێی وەرنەگرێتەوە، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَاراً فَلاَ تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْئاً أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُّبِيناً (٢٠)النساء

﴿ئەگەر ویستیشتان ژنێك تەڵاق بدەن بۆئەوەی لەجێی ئەو ژنێكی تر بێننو، ماڵوسامانێكی زۆریشتان دابوو بە یەكێك لەو ژنانە(**كە دەتانەوێت لێی جیاببنەوە**)، ئەوا هیچیان لێ وەرمەگرنەوە، ئایا بە بوختان بۆهەڵبەستنو تاوانێكی ئاشكرا ئەم ماڵەیان لێ وەردەگرنەوە؟﴾.

**بڕگەی شەشەم:**

دەكرێت ژنو مێردەكە لەسەر هەرشێوازێك ڕێككەون بۆ جیابوونەوەیان، لەسەر بنەمای ئەوەی ژنەكە شتێك بدات بە پیاوەكە، وەكوئەوەی پیاوەكە بە ژنەكە بڵێت: ئەوا بە پێنج هەزار دینار تەڵاقم دایت، ژنەكەش بڵێت: ئەوە قبووڵم كرد، یان ئافرەتەكە بڵێت: شەش هەزارت دەدەمێ تەڵاقم بدە، پیاوەكەش بڵێت: ئەوە تەڵاقم دایت.

بڕگەی حەوتەم:

بۆ جیابوونەوە لەیەکتری، لەم یاسایەشدا دەبێت پەیڕەوی ماوەی دیاریکراوی جیابوونەوەکە بکرێت، جا هەر شێوەیەك بێت لە ماوە دیاریکراوەکان، بۆئەوەی بزانرێت هیچ کۆرپەیەك لەنێو منداڵدانی ئافرەتەکەدا دروست نەبووە، واتە ئافرەتەکە دوای ئەوەی لەگەڵ پیاوەکەی بڕیاری لێك داماڵین دەدات، دەبێت ئەو ماوە دیاریکراوە چاوەڕێ بکات بزانێت زگی هەیە یان نا، ئەگەر زگی هەبوو، ئەوە چاوەڕێ دەکات هەتا منداڵەکەی دەبێت، ئەگەر دوای ئەو ماوەیە زگیشی نەبوو، ئەوا مافی خۆیەتی شوو بکاتەوە.

## یاسای دەرکردنی ژنان لەلایەن مێردەکانیانەوە

## (اللعان)

اللعان: واتە دەرکردن، یان بە لەعنەتکردنی ژنێك لەلایەن مێردەکەیەوە.

بڕگەی یەکەم:

پیاوێك کە ژنەکەی بینی لەگەڵ کەسێکی تردا داوێنپیسی دەکرد، بۆی هەیە دەریکات، یان بێدەنگ بێت، بۆئەوەی بە یاسای لێك داماڵین لێی جیاببێتەوە.

بڕگەی دووەم:

ئەگەر ئافرەتەکە بۆخۆی دانی نا بە تاوانەکەدا، یان هەواڵەکە بڵاوبۆوە کە ئەو ئافرەتە داوێنپیسی دەکات، ئەوە پیاوەکە بۆی هەیە تاوانباری بکات، یان لێی بێدەنگ بێت، بۆئەوەی بە یاسای لێك داماڵین لێی جیاببێتەوە.

بڕگەی سێیەم:

ئەگەر پیاوەکە ژنەکەی تۆمەتبار کرد بەوەی داوێنپیسی کردووەو، چوار شایەدیشی دەست نەکەوت پشتیوانی لێ بکەن، ئەوا پێویستە هەردووکیان بیسەلمێنن، لە قسەکانیاندا ڕاستگۆن، ئەوەش بە سوێند خواردن دەبێت، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ (٦) وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ (٧)

﴿ئەوانەش بە كرداری داوێنپیسی هاوسەرەكانی خۆیان تاوانبار دەكەن و، لەخۆیان زیاتر هیچ شاهیدێكی تریان نیە، جا شایەدیدانی هەریەكێك لەوان ئەوەیە: چوار جار سوێند بخوات بە خوا، بەوەی كە ئەو لە راستگۆكانە (**كە دەڵێت: ژنەكەم داوێنپیسی كردووە، بەچاوی خۆی دیتوویەتی**)، سوێندی پێنجەمیش ئەوەیە كە بڵێت: نەفرینی خوام لەسەربێت ئەگەر لە درۆزنەكانبم﴾.

وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ (٨) وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ (٩)النور

﴿ئافرەتەكەش سزاكەی لەسەر خۆی لادەدات، ئەگەر چوار جار سوێند بخوات بەوەی كە(**مێردەكەی**) لە درۆزنەكانە، سوێندی پێنجەمیش ئەوەیە كە بڵێت: ڕق وقینی خوام لەسەربێ ئەگەر هاتوو(**مێردەكەم**) لە راستگۆكان بێت﴾.

لێرەدا دوای سوێند خواردنەكە، پیاوەكەو ژنەكە لە یەكتری جیادەبنەوە، بەبێ ئەوەی ئافرەتەكە هیچ حەقە مارەییەكی دەستكەوێت.

**بڕگەی چوارەم:**

ژن ومێرد بەم شێوازی جیابوونەوەیە، جارێكیتر ناتوانن ببنەوە ژن و مێرد.(١٩١)

**بڕگەی پێنجەم:**

ئەگەر هات و ئافرەتەكە دووگیان بوو، ئەوا منداڵەكەی لەگەڵ خۆی دەمێنێتەوە، منداڵەكەش لەناو خەڵكیدا بەناوی دایكیەوە بانگ دەكرێت.(١٩٢)

**بڕگەی شەشەم:**

میراتی ئەو منداڵە، بۆ دایكی و میراتگرەكانە، باوكی نادیارە، بۆیە میرات نایگرێتەوە.(١٩٣)

**بڕگەی حەوتەم:** ئەو ژن و مێردەی بەو شێوازە جیادەبنەوە، بەدڵنیاییەوە یەكێكیان درۆزنە).(١٩٤)

## دەروازەی چوارەم

## بژێوی کەس‌وکار

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (باشترینتان ئەو کەسەیە کە بۆ کەسوکارەکەی باشبێت، منیش لە هەمووتان باشترم بۆ کەس‌وکارەکەم).(١٩٥)

### بڕگەی یەکەم:

جۆرو ئەندازەی بژێویەکان بەپێی باری ژیانی بەخێوکەرەکە دیاری دەکرێت.

لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا...(٢٣٣ البقرة)

﴿هیچ کەس بارێکی وای ناخرێتە سەرشانی مەگەر ئەوەندەی لەتوانایدایە﴾.

### بڕگەی دووەم:

بژێوی ژن دەکەوێتە ئەستۆی مێردەکەی، هەتا لەژێر ڕابەرایەتی مێردەکەیدا بێت، ئەگەر هاتوو بەبێ ڕازیبوونی مێردەکەی ماڵەکەی جێهێشت، یان سەفەری کرد، ئەوا حەقە بژێویەکەی لە ئەستۆی مێردەکەیدا نامێنێت.

### بڕگەی سێیەم:

بژێوی منداڵەکان، یان منداڵی منداڵەکان، دەکەوێتە ئەستۆی باوکیان.

### بڕگەی چوارەم:

بژێوی دایک‌و باوک‌و نەنک‌و باپیرەکان، دەکەوێتە ئەستۆی ڕۆڵەکانیان، یان نەوەکانیان.

وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاهُمَا فَلا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيماً (٢٣)الاسراء

﴿پەروەردگارت بڕیاری داوە کە لەو زیاتر کەسی تر نەپەرستن‌و، لەگەڵ باوانەکانیشتان چاکەکار بن، ئەگەر دایکت‌و باوکت یەکێکیان یان هەردووکیان لەلای تۆ دەگەنە تەمەنی پیری، ئەوا دڵیان مەشکێنەو پێیان مەڵێ: ئۆف لەدەست ئێوە، قسەی چاک‌و ڕێزداریشیان لەگەڵدا بکە﴾.

**بڕگەی پێنجەم:**

**ئەوکەسەی کە باری ژیانی باشە، دەبێت بڕی (٢)مەد خۆراك بدات بە هەریەکێك لەوانەی بژێویان لەسەر ئەوە، ئەگەر هەژاریش بوو، ئەوە ڕۆژی یەك (مەد)ە، مەدێك نزیکەی ٦٠٠ گرامە، دەبێت خۆراکەکان لەگەڵ یەکتریدا بگونجێن و ڕۆژانە بدرێن وەکو: نان و گۆشت، یان نان و ڕۆن، یان نان و زەیت، هەروەها جلوبەرگیش ساڵی دووجار، دەبێت خانووی نیشتەجێ بوون بۆ ماڵ و منداڵەکانی دیاری بکرێت.**

**بڕگەی شەشەم:**

**ئافرەتە تەڵاقدراوەکان کە دووگیانن هەتا زگەکانیان دادەنێن، ژیانیان لەسەر مێردەکانیانە، ئەگەر دوای زگ دانانەکەش، ئەو ئافرەتانە منداڵەکانیان بەخێوکردن و شیریان پێدان، ئەوا کرێی بەخێوکردنەکە لەسەر باوکەکانە.**

وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ.... **٢٣٣ البقرة**

**﴿دایکەکانیش دووساڵی تەواو شیر دەدەن بە منداڵەکانیان، بۆ ئەوانەی دەیانەوێت شیر پێدانەکە تەواو بکەن، ئەوپیاوەی کە خاوەنی منداڵەکەشە پێویستە بژێوی و پۆشاکی ئەم ژنە شیردەرانە بەچاکی و ڕێك وپێکی بدات...﴾.**

أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُم مِنْ وُجْدِكُمْ وَلا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِنْ كُنَّ أُولاتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ.. **(٦ الطلاق)**

**﴿ئەو ئافرەتانەی چاوەڕوانی ماوەی دیاریکراوی خۆیان دەکەن، بەپێی توانای خۆتان، ئێوە لەکوێ نیشتەجێ بوون، ئەوانیش لەوێ نیشتەجێ بکەن، زیانیشیان پێ مەگەیەنن بەوەی تەنگیان پێ هەڵچنن، ئەگەر هاتوو (ئەو ئافرەتانە) دووگیانیش بوون، ئەوا (ماڵ و سامانیان) پێ ببەخشن هەتا زگەکەیان دادەنێن....﴾.**

### بڕگەی حەوتەم:

کۆیلەو کەنیزەك، لەئەستۆی هەرکەسێکدابن، بەخێوکردنیشیان لە ئەستۆی ئەو کەسەدایە.

### بڕگەی هەشتەم:

خاوەنداریـەتی کەسـێك بـۆ ئاژەڵـەکان، دەبێتـە هـۆی ئـەوەی بـەخێوکردنی ئاژەڵەکانی بکەوێتە ئەستۆوە.

### بڕگەی نۆیەم:

بەخێوکردنی خزمە نزیکەکان(ئەوانەی نە اصولْن و نـە فروعن)، ناچێتە یاسای نەفەقەوە، بەڵکو دەکەوێتە بەر یاسای یارمەتیدانو زەکاتو خێرو چاکەکردن.

## یاسای لەخۆگرتن

## (الحضانة)

### بڕگەی یەکەم:

لەکاتی جیابوونـەوەی ژنو مێردا، بۆئەوەی منداڵـەکانیان بەرەڵا نـەبن، یـەکێك لـەخۆیان دەگرێـت بـۆ بـەخێوکردنیان، بـەڵام ئەگـەر ژنو مێردێـك تەڵاقـدرانو کوڕێکی ژیریان هەبوو خۆی ناسیبوو، ئەوە پێویسـت بە کـەس ناکات لـەخۆی بگرێت، واچاکە کوڕەکە لێیـان دانـەبڕێتو لـە چاکەکانیشـی دایكو باوکـەکەی بێبەش نەکات، بەڵام ئەگـەر منداڵەکە لە تەمەنی ژێـر حـەوت ساڵان بوو، ئـەوا پێویستە یەکێك بیگرێتەخۆی بۆ بەخێوکردنو پەروەردەکردنی.

### بڕگەی دووەم:

نزیکترین کەس کە گونجابێت بۆ بەخێوکردنی کۆرپەیـەك، دایکیـەتی، کـە دوای تەڵاقدانی شووی نەکردبێتەوە.

(ئافرەتێك بە پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) گـوت: ئـەوە کـوڕی منـە، زگم شـوێنی هـەڵگرتنی بـوو، مەمکـەکانم جێگـەی شـیرپێدانی بـوون، باوەشـم شـوێنی

حەوانـەوەی بـوو، بـاوكی تەڵاقیـدام، دەشـیـەوێت منداڵەكـەم لـێ بسـتێنێتەوە، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر مێرد نەكەیتەوە تۆ لە هەموو كەس شایستەتری كە بەخێوی بكەیت). (١٩٦)

دوای ئەویش نەنكی، دایكی دایكی، دوای ئەویش، نەنكی (دایكی باوكی).

**بڕگەی سێیەم:**

ئەگەر دایكی و نەنكی(دایكی دایكی)و نەنكی( دایكی باوكی) دەست نەكەوتن، ئەوا خوشـكی لـە ئەسـتۆی دەگرێـت، ئەگـەر خوشـكیش دەسـت نەكـەوت، ئـەوا پووری(خوشـكی دایكی)لـە ئەسـتۆی دەگرێـت، ئەگـەر پوور(خوشـكی دایكـی) دەست نەكەوت، ئەوا پوور(خوشكی باوكی)لە ئەستۆی دەگرێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە بەخێوكردنی كچەكەی حەمزەدا، بڕیاریدا: پووری خوشكی دایكی بیگرێتە ئەستۆ، فەرمووشی: پوور خوشكی دایك لە جێگەی دایكدایە).(١٩٧)

**بڕگەی چوارەم:**

كەسـی كۆیلـەو، كەسـی بێبـاوەڕو، كەسـی كـەم عـەقڵو، كەسـێك كـە لـە ئـایین لایـدابێت، مـافی لـەخۆگرتنی كۆرپەیـەكیان نیـە، بـەڵام كاتێـك كۆیلەكـە ئـازاد بكرێت، یان بێباوەڕەكە موسوڵمان ببێت، یان كـەم عەقڵەكە ببێت بە خاوەن عـەقڵ، یـان لادەرەكـە لـە دینداریـدا بێتـەوە سـەر ڕێگـەی ڕاسـت، ئـەو مافـەیان دەست دەكەوێتەوە كە كۆرپە لەخۆبگرن، بۆ بەخێوكردنی.

**بڕگەی پێنجەم:**

ئەگەر ئافرەتـان دەسـت نەكـەوتن بـۆ ئـەو ئەركـە، ئـەوا لـەنێو پیاوەكان باوك لـە پێش هەمووانە، بەدوایدا باپیرەكان دێن، ئینجا خزمە نزیكەكان بەدوای یەكدا.

**بڕگەی شەشەم:**

لە نێوان دایكو باوكدا، دایك مـاف ئـەوەی هەیـە منداڵەكـەی لـە ئەسـتۆ بگرێـت، بەو مەرجەی دوای تەڵاقدانەكەی شوو نەكاتەوە.

### بڕگەی حەوتەم:

ئەگەر ژن و پیاوێك لە یەكتری تەلاقدران و، منداڵێكی حەوت یان هەشت ساڵانەیان هەبوو، كێشەیان بوو لەسەرئەوەی كامەیان منداڵەكە دەگرێتە ئەستۆ، ئەوا منداڵەكە سەربەست دەكرێت، دایكی یان باوكی هەڵبژێرێت، ئەگەر هەردووكیانی هەڵبژارد، یان هیچیانی هەڵنەبژارد، ئەوا دەستەیەك هەڵبژاردن دەكەن لەنێوان دایك و باوكەكەدا، بەختی كامەیان سەركەوت، ئەوا ئەوەیان منداڵەكە دەگرێتە ئەستۆ.

### بڕگەی هەشتەم:

ئەگەر منداڵەكە لەلای یەكێكیان بوو، ئەوا بینین و سەردانی منداڵەكە لەسەر ئەوەی تریان قەدەغە ناكرێت، یان لەكاتی نەخۆشیدا منداڵەكە سەردانی بكات و لەكاتی مردندا بەشداری مەراسیمی پرسەكەی بكات.

### بڕگەی نۆیەم:

ئەگەر منداڵەكە لەلای یەكێكیان بوو، ئەویش ویستی سەفەرێك بكات و منداڵەكە لەگەڵ خۆیدا بەرێت، سەفەرەكەش مەترسیدار بوو لەسەر منداڵەكە، ئەوا پێویستە منداڵەكە لای ئەوەیان بێت كە نیشتەجێ یە، بەڵام ئەگەر گەشتەكە كەمتر بوو لەماوەی كورتكردنەوەی نوێژ، ئەوا باوكەكە بۆی هەیە منداڵەكەی لەگەڵ خۆیدا بەرێت.

## دەروازەی پێنجەم

### یاسای میرات

میرات، واتە: ئەو ماڵو سامانەی دوای مردنی کەسێك، بەجیٚ دەمێنێت.

میرات لەسەر موسوڵمانەکان پێویستکراوە.

لِّلرِّجَالِ نَصيِبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيباً مَّفْرُوضاً (٧) النساء

﴿بۆ پیاوان بەشی خۆیان هەیە لەو(ماڵەی)کە دایكو باوكو خزمە نزیکەکان جێیان هێشتووە، بۆ ژنانیش بەشی خۆیان هەیە لەو(ماڵەی)کە دایكو باوكو خزمە نزیکەکان جێیان هێشتووە، ئەوماڵە کەم بێت یان زۆر، بەشێکی پێویستکراوە (دەبێت بدرێت)﴾.

**بڕگەی یەکەم:**

بنەماکانی میرات.

**یەکەم:** میرات دەر.

ئەو کەسەیە کە مردووەو مردنەکەشی بە بینین یان بیستن دەسەلمێنرێت.

**دووەم:** میراتگر.

ئەو کەسەیە کە یاساکانی میرات دەیگرێتەوەو، لەدوای مردنی میرات دەرەکە لە ژیاندایە.

**سێیەم:** ماڵی بەجێماو.

هەموو ئەو ماڵو سامانانە دەگرێتەوە کە دوای مردووەکە جێدەمێنن.

**بڕگەی دووەم:**

مەرجەکانی میرات

**یەکەم:** مردنی میرات دەر

واتە دەبێت بسەلمێنرێت کە میرات دەرەکە مردووەو لە ژیاندا نەماوە.

**دووەم:** بەردەوامی لەژیاندابوونی میرات وەرگر.

واتە دەبێت چاودێری ئەوە بکرێت کە میراتگرەکە بۆ چرکەیەکیش لەژیاندا بووە دوای مردنی میرات دەرەکە، بەڵام ئەگەر میرات دەرو میرات وەرگر هەردووکیان لە یەك کاتدا بەهۆی ڕووداوێکەوە تێداچوون، وەکو نقوم بوونی کەشتییەك یان بەربوونەوەی فڕۆکەیەك ئەوە مادام نەزانراوە کامەیان پێش کامەیان مردووە، لەم بارەدا هیچیان میرات لە یەکتری ناگرن.

سێیەم: هەبوونی پەیوەندی خزمایەتی یان ژن‌ومێردایەتی لەنێوان میرات دەرو میرات وەرگر.

چوارەم: نەبوونی هۆکارێك لە هۆکارەکانی بێ بەشکردنی میرات وەرگر لە میراتی میرات دەرەکەدا.

## بڕگەی سێیەم:

### هۆکارەکانی میرات وەرگرتن

یەکەم: کوشتن

ئەگەر کەسێك یەکێك لەوانە بکوژێت کە لەپەیوەندیەکانی میراتدا هاوبەشن، ئەوا بکوژەکە بەری دەبێت لە میراتی کوژراوەکە.

دووەم: کۆیلایەتی

میراتی کەسی کۆیلە نادرێت بە میراتگرەکانی، بەڵکو دەدرێت بە خاوەنەکەی، یان بەو کەسەی کە ئازادی دەکات.

سێیەم: جیاوازی ئایین

لەنێو ئەوانەدا کە میرات لەیەکتری دەگرن، جیاوازی ئایینەکەیان دەبێتە هۆی ئەوەی میرات لەیەکتری نەگرن.

## بڕگەی چوارەم:

### ئەوانەی میرات لە مردوویەك دەگرن:

یەکەم: ژنی پیاوێکی مردوو، لە هیچ بارێکدا مافی هیچ کام لە میراتگرەکان نابێتە هۆی ئەوەی ئەو ژنە لە میراتەکە دوور بخرێتەوە، ڕێژەکەشی بەپێی

بەشداری میراتگرەکان دەگۆڕێت لە چواریەکەوە بۆ هەشتیەك، ئەگەر مردووەکە لە ژنێکیشی زیاتر هەبوو، ئەوا هەموویان هاوبەشن لەو چواریەك یان هەشتیەکەدا.

**دووەم:** مێردی ژنێکی مردوو، لە هیچ بارێکدا مافی هیچ کام لە میراتگرەکان نابێتە هۆی ئەوەی ئەو مێردە لە میراتەکە دوور بخرێتەوە، ڕێژەکەشی بەپێی بەشداری میراتگرەکان دەگۆڕێت لە نیوەوە بۆ چواریەك.

**سێیەم:** باوکی کەسێکی مردوو، لە هیچ بارێکدا مافی هیچ کام لە میراتگرەکان نابێتە هۆی ئەوەی باوکی مردووەکە لە میراتەکە دوور بخرێتەوە، ڕێژەکەشی بەپێی بەشداری میراتگرەکان دەگۆڕێت، بوونی باوکی مردووەکە لەناو میراتگرەکاندا، دەبێتەهۆی ئەوەی هەموو میراتگرەکانی تر دوور خاتەوە جگە لە ژن و منداڵ و(منداڵی منداڵ) و دایکی مردووەکە.

**چوارەم:** دایکی کەسێکی مردوو، لە هیچ بارێکدا مافی هیچ کام لە میراتگرەکان نابێتە هۆی ئەوەی دایکی مردووەکە لە میراتەکە دوور بخرێتەوە، ڕێژەکەشی بەپێی بەشداری میراتگرەکان دەگۆڕێت، بوونی دایکی مردووەکەش لەناو میراتگرەکاندا، نەنکەکان بێبەش دەکات لە میراتەکە.

**پێنجەم:** منداڵەکانی کەسێکی مردوو، بە نێرو مێیانەوە، لە هیچ بارێکدا مافی هیچ کام لە میراتگرەکان نابێتە هۆی ئەوەی منداڵی مردووەکە لە میراتەکە دووربخرێنەوە، ڕێژەکەشیان بەپێی بەشداری میراتگرەکان دەگۆڕێت، بە بوونی منداڵە نێرینەکانی مردووەکەش لەناو میراتگرەکاندا، هەموو میراتگرەکانی تر دەکرێنە دەرەوە جگە لە ژن و منداڵ و دایك و باوکی مردووەکە.

**شەشەم:** باپیرەکانی کەسێکی مردوو، واتە: (باوکی باوك، هەتا بەرەو سەرەوە هەڵکشێن)، بوونی باوکی مردووەکە لەناو میراتگرەکاندا، دەبێتەهۆی بێبەش کردنی باپیرەکان لە میراتەکە، جا ئەگەر هات و کەسە مردووەکە پێشتر باوکی مردبوو، بەڵام باپیرەکانی مابوون، ئەوا بەشە میراتەکەی باوکی بۆ باپیرەکانی

دەبێت، بوونی باپیرەش لەناو میراتگرەکاندا، هەموو میراتگرەکانی تر دەکرێنە دەرەوە جگە لە ژن و دایك و منداڵ و (منداڵی منداڵەکانی) مردووەکە.

**حەوتەم:** نەنکەکانی کەسێکی مردوو، (دایکی دایك، یان دایکی باوك، هەتا بەرەو سەرەوە هەڵکشێن)، بوونی دایکی مردووەکە لەناو میراتگرەکاندا، دەبێتەهۆی دوور خستنەوەی نەنکەکان، جا ئەگەر هاتوو، دایکەکەش پێشتر مردبوو، ئەوە بەشە میراتەکە دەدرێت بە نەنکەکان.

**هەشتەم:** خوشکێك لە دایك و باوکی مردووەکە، یان تەنها لە باوکی بێت، ئەوە یاسای میرات دەیگرێتەوە، بەڵام بوونی منداڵ و (منداڵی منداڵی نێرینە) و باوکی کەسە مردووەکە لەناو میراتگرەکاندا، ئەو خوشکە لەو میراتە دەکاتە دەرەوە.

**نۆیەم:** خوشکێك تەنها لە دایکی کەسە مردووەکە بێت، بەشە میرات دەیگرێتەوە، بەڵام بوونی منداڵ و (منداڵی منداڵ) و باوکی کەسە مردووەکە لەناو میراتگرەکاندا، ئەو خوشکە لەو میراتە دەکاتە دەرەوە.

**دەیەم:** برایەك لە دایك و باوکی کەسە مردووەکە، یان تەنها لە باوکی بێت، بەشە میرات دەیگرێتەوە، بەڵام بوونی منداڵ و (منداڵی منداڵ) و باوکی کەسە مردووەکە لەناو میراتگرەکاندا، ئەو برایە لەو میراتە دەکاتە دەرەوە.

**یازدە:** برایەك لە دایکی کەسە مردووەکە بێت، بەشە میرات دەیگرێتەوە، بەڵام بوونی منداڵ و (منداڵی منداڵ) و باوکی کەسە مردووەکە لەناو میراتگرەکاندا، ئەو برایە لەو میراتە دەکاتە دەرەوە.

**دوازدە:** کچی کوڕی کەسێکی مردوو، هەتا بەرەو خوار بڕوات، یاسای میرات نایانگرێتەوە هەتا باوکەکانیان لەژیاندا بن، جا ئەگەر وابوو پێش میراتەکە باوکی ئەو کچانە مردبێت، ئەوا کچەکان لەگەڵ براکانیان شوێنی باوکیان دەگرنەوە لە میراتەکەدا، هاتنە ناوەوەی ئەو کچانەش بۆ ناو میراتەکە، دەبنە هۆی دوورخستنەوەی براو خوشکەکانی کەسە مردووەکە کە تەنها لەدایکینی.

سێزدە: کوڕی کوڕی کەسێکی مردوو، هەتا بەرەو خوار بڕوات، یاسای میرات نایانگرێتەوە هەتا باوکەکانیان لەژیاندا بن، جا ئەگەر وابوو پێش میراتەکە باوکی ئەو کوڕانە مردبێت، ئەوا کوڕەکان لەگەڵ خوشکەکانیان شوێنی باوکیان دەگرنەوە لە میراتەکەدا، هاتنە ناوەوەی ئەو کوڕانەش بۆ ناو میراتەکە، دەبێتە هۆی دوورخستنەوەی هەموو مامو ئامۆزاو خوشكو براکانی کەسە مردووەکەو نەوەکانیشیان.

چواردە: کوڕەکانی برایەك لە دایكو باوکی، یان تەنها لە باوکی کەسە مردووەکەبن، میرات دەیانگرێتەوە، بەڵام بوونی منداڵی نێرو، (منداڵی منداڵی نێرینە)و باوکی مردووەکە لەناو میراتگرەکاندا، ئەو کوڕی برایانە لەو میراتە دەکاتە دەرەوە.

پازدە: مامێك کە لە نەنكو باپیری کەسە مردووەکە بێت، یان تەنها هەر لە باپیری بێت، هەروەها کوڕو، کوڕی کوڕی ئەو مامانە، هەتا بەرەو خوارەوە بڕۆن، میرات دەیانگرێتەوە، بەڵام بوونی منداڵی نێرو، (منداڵی منداڵی نێرینە)و باوكو خوشكو برای کەسە مردووەکە لەناو میراتگرەکاندا، ئەو مامو ئامۆزایانە لەو میراتە دەکاتە دەرەوە.

برگەی پێنجەم:

ڕێژەی دیاریکراوی میراتەکان بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

نیوەی میراتەکە: ئەم میراتگرانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- مێردی ژن، ئەگەر ژنەکە منداڵی نەبن، لەو پیاوە یان لە پیاوێکی تر.

٢- کچێکی تاقانەی کەسێکی مردوو.

٣- کچێکی تاقانەی کوڕی کەسێکی مردوو، ئەگەر مافی میراتگری تر نەبنە هۆی ئەوەی ئەو کچە لە میراتەکە دوور بخرێنەوە.

٤- خوشکی کەسێکی مردوو، کە لە دایكو باوکی بێت، ئەگەر مافی میراتگری تر نەبنە هۆی ئەوەی ئەو خوشکە لە میراتەکە دوور بخرێنەوە.

٥- خوشكی كەسێكی مردوو، كە تەنها لە باوكی بێت، ئەگەر مافی میراتگری تر نەبنە هۆی ئەوەی ئەو خوشكە لە میراتەكە دوور بخرێنەوە.

دووسێیەكی میراتەكە: ئەم میراتگرانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- دوو كچی كەسە مردووەكە، ئەگەر خوشك و برای تریان نەبن، ئەوا بە هەردووكیان دوو لەسەر سێی میراتەكە دەگرن.

٢- دوو كچی كوڕی كەسە مردووەكە، بە هەردووكیان دوولەسەر سێی میراتەكە دەگرن، ئەگەر مافی میراتگری تر نەبنە هۆی ئەوەی ئەو دوو كچە لە میراتەكە دوور بخرێنەوە.

٣- دوو خوشكی كەسە مردووەكە كە لە دایك و باوكی بن، بە هەردووكیان دوو لەسەر سێی میراتەكە دەگرن، ئەگەر مافی میراتگری تر نەبنە هۆی ئەوەی ئەو دوو كچە لەمیراتەكە دوور بخرێنەوە.

٤- دوو خوشكی كەسە مردووەكە كە تەنها لە باوكی بن، بە هەردووكیان دوو لەسەر سێی میراتەكە دەگرن، ئەگەر مافی میراتگری تر نەبنە هۆی ئەوەی ئەو دووكچە لەمیراتەكە دوور بخرێنەوە.

سێیەكی میراتەكە: ئەم میراتگرانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- دایكی مردووەكە، ئەگەر مردووەكە منداڵی نەبن، یان ژمارەیەك لە خوشك و برای نەبن.

٢- دوو خوشكی مردووەكە كە لە دایكینی و لەباوكی نین، ئەگەر مردووەكە منداڵ و باوكی لەپاش بەجێ نەمابن.

٣- دوو برای مردووەكە، كە لە دایكینی و لە باوكی نین، ئەگەر مردووەكە منداڵ و باوكی لەپاش بەجێ نەمابن.

چواریەكی میراتەكە: ئەم میراتگرانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- ژنەكانی پیاوێكی مردوو، ئەگەر منداڵی یان منداڵی كوڕەكانی لەپاش بەجێ نەمابن.

٢- مێردی ئافرەتێکی مردوو، کە ئافرەتەکە منداڵی لەپاش بەجێ مابن، جا ئەو منداڵانە لەو مێردە بن، یان لەمێردێکی تر.

**شەشیەکی میراتەکە: ئەم میراتگرانەی خوارەوە دەگرێتەوە:**

١- باوکی مردووەکە، ئەگەر مردووەکە منداڵی هەبن، یان منداڵی کوڕەکەی هەبن.

بەڵام ئەگەر هاتو باوکی کەسە مردووەکە لەگەڵ تاقە کچێکی کەسە مردووەکەی میراتەکەیان دەگرت، ئەوا ئەو زیادەیەی دەمێنێتەوە دەدرێت بە باوکەکە.

٢- دایکی مردووەکە، ئەگەر مردووەکە منداڵ‌و خوشك‌و برای هەبن.

٣- باپیری مردووەکە(لەشوێنی باوکی مردووەکە)، کە مردووەکە منداڵی هەبن.

٤- نەنکەکان، دایکی دایکی بێت، یان دایکی باوکی بێت، (لەشوێنی دایکی مردووەکە).

٥- تاقە برایەك کە تەنها لەدایکی مردووەکە بێت، ئەوا شەشیەکی میراتەکەی بەردەکەوێت، بەمەرجێك بوونی میراتگرێکی تر نەبێتەهۆی ئەوەی ئەو تاقە برایە بچێتە ڕیزی میراتگرەکانەوە.

٦- تاقە خوشکێك کە تەنها لەدایکی مردووەکە بێت، ئەوا شەشیەکی میراتەکەی بەردەکەوێت، بەمەرجێك بوونی میراتگرێکی تر نەبێتەهۆی ئەوەی ئەو تاقە خوشکە بچێتە ڕیزی میراتگرەکانەوە.

٧- خوشکێك کە لە باوکی مردووەکە بێت، خوشکێکی تری لەگەڵدا بێت کە لە دایك‌و باوکی مردووەکە بێت، ئەوا ئەو خوشکەی تەنها لە باوکیەتی شەشیەك دەگرێت.

٨- کچی کوڕی مردووەکە کە تاقە کچێکی مردووەکەی لەگەڵدا بێت، ئەوا ئەو کچی کوڕە شەش یەك دەکرێت.(١٩٨)

**هەشتیەکی میراتەکە: تایبەتە بە ژنەکانی کەسە مردووەکە:**

بۆ ژنەکانی پیاوێکی مردووە کە منداڵی، یان منداڵی کوڕەکەی لەدوای خۆی جێهێشتبن، جا ژنێك بێت یان دوو، سیٰ و چوار، بە هەموویان هەشتیەکیان هەیە.

**بڕگەی شەشەم:**

لە دابەشکردنی میراتدا، منداڵەکانی کەسە مردووەکە، نێرینەیەك دوو ئەوەندەی مێیینەیەکی بەردەکەوێت.

يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ

﴿خوا لەبارەی منداڵەکانتان ڕاتان دەسپێرێت، بۆ نێرینەك وەکو چارەو بەختی دوومێیینە وایە﴾.

واتە سەرەتا بەشە میراتی دایكو باوكو هاوسەرەکە دەدرێت، ئەوەی ماشەوە بۆ منداڵەکانە، هەر نێرینەیەك دوو ئەوەندەی مێیینەیەکی بەردەکەوێت.

**ئەم ڕێژەی دابەشکردنە** لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ **ئەمانەی خوارەوەش دەگرێتەوە:**

**یەکەم:** هەموو ئەو خوشكو برایانەی لەدایكو باوکێکن.

**دووەم:** هەموو ئەو خوشكو برایانەی کە تەنها لە باوکێکنو دایکیان جیایە.

**سێیەم:** کوڕی کوڕ لەگەڵ کچی کوڕ.

**بڕگەی حەوتەم:**

ئەگەر هاتوو منداڵەکانی کەسە مردووەکە تەنها مێیینە بوون، ئەوا دابەشکردنی میراتەکە بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت.

**یەکەم:** ئەگەر دوو مێیینە یان زیاتر بوون، ئەوا بە هەموویان دوو لەسەر سێی میراتەکەیان بەردەکەوێت.

فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ

﴿جا ئەگەر هاتوو (**منداڵی ئەو پیاوە مردووە**)، دوو کچ (**دوو مێیینە**)یان زیاتر بوون، ئەوا دووبەش لەسیٰ بەشی ماڵە جێهێڵراوەکە بۆ ئەوانە....﴾. ئەوەی کە دەشمێنێتەوە بۆ میراتگرەکانی ترە.

دووەم: ئەگەر تەنها یەك مێیینە بێت، ئەوا نیوەی میراتەکە دەگرێت.

وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ

﴿.....ئەگەر هاتوو (منداڵەکانی ئەو پیاوە مردووەش)، تەنها یەك کچ (یەك مێیینە)بوو، ئەوا نیوەی ماڵە جێهێڵراوەکەی بەردەکەوێت....﴾. ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ میراتگرەکانی ترە.

بڕگەی هەشتەم:

وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ

﴿.....بۆ دایكو باوکیشی، هەریەکەیان شەشیەکی ماڵە جێماوەکەی بەردەکەوێت، ئەگەر هاتوو پیاوە مردووەکە منداڵی هەبوو....﴾.

بڕگەی نۆیەم:

فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ

﴿....جا ئەگەر وابوو پیاوە مردووەکە منداڵی نەبوو، دایكو باوکی میراتەکەیان دەگرت، ئەوە سێ یەکی ماڵەکە بۆ دایکیەتی....﴾.

بەپێی ئەم بڕگە یاساییە، ئەگەر مردووەکە ژنی هەبێت، ئەوا سێیەك بۆ دایکیەتی و چواریەکیش بۆ ژنەکەیەتی و، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ باوکیەتی.

بڕگەی دەیەم:

فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ

﴿.....جا ئەگەر وابوو پیاوە مردووەکە(منداڵی نەبوو، دایكو باوکی میراتیان دەگرت)، بەڵام براو خوشکی هەبوون، ئەوا شەش یەکی ماڵەکە بۆ دایکیەتی، دوای (جێبەجێکردنی) ڕاسپاردەیەك کە مردووەکە ڕای دەسپێرێت یان (دانەوەی) قەرزێك (کە لە ئەستۆی مردووەکەدایە)....﴾.

بەپێی ئەم بڕگە یاساییە، شەشیەکی ماڵەکە بۆ دایکیەتی، ئەگەر ژنیشی هەبێت، چواریەکی ماڵەکە دەگرێت، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ باوکیەتی، (لێرەدا مادام باوکی مردووەکە هەیە، براو خوشکەکان نایەنە ناو میراتەکەوە).

**بڕگەی یازدە:**

**پیاو نیوەی ماڵی ژنەکەی دەست دەکەوێت، ئەگەر ژنەکەی منداڵی نەبن.**

وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ

**﴿(پیاوەکانیش)، نیوەی ئەوماڵەتان بەردەکەوێت کە هاوسەرەکانتان (دوای مردنیان) جێیان هێشتووە، ئەگەر ئەو ئافرەتانە منداڵیان نەبێت.....﴾.**

**مەبەست لە هەموو منداڵەکانی ئەو ئافرەتەیە لەو پیاوەبن یان لە پیاوێکی تر.**

**بڕگەی دوازدە:**

**پیاو چواریەکی ماڵی ژنەکەی دەست دەکەوێت، ئەگەر ژنەکە منداڵی هەبن.**

فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ

**﴿...جا ئەگەر وابوو منداڵیان هەبوون، ئەوا چواریەکی ئەوماڵەتان هەیە کە دوای مردنیان جێیان هێشتووە، دوای (جێبەجێ کردنی) ڕاسپاردەیەك کەمردووەکە ڕای دەسپێرێت، یان (دانەوەی)قەرزێك (کە لە ئەستۆی دایە)...﴾.**

**بڕگەی سێزدە:**

**ژن چواریەکی ماڵی مێردەکەی بەردەکەوێت، ئەگەر مێردەکەی منداڵی نەبن.**

وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ

**﴿..(هاوسەرەکانیشتان)، چواریەکی ماڵی ئێوەیان هەیە، ئەگەر ئێوە منداڵتان نەبێت...﴾.**

**بەپێی ئەم بڕگە یاساییە، مادام مردووەکە منداڵی نین، واتە ژنەکانی، یەك بێت یان دوو یان سێ یان چوار، ئەوە بە هەموویان چواریەکیان بەردەکەوێت و، دایکیشی سێیەکی بەردەکەوێت و ئەوەی ماشەوە بۆ باوکی دەبێت.**

فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ

**﴿...بەڵام ئەگەر منداڵتان هەبێت، ئەوا ژنەکان هەشتیەکیان هەیە، دوای(جێبەجێ کردنی) ڕاسپاردەیەك کە ڕاتان سپاردووە، یان(دانەوەی) قەرزێك (کە لە ئەستۆتان دایە)....﴾.**

بەپێی ئەم بڕگە یاساییە، مادام مردووەکە منداڵی هەن، کەواتە ژنەکانی، جا ئەگەر یەك بێت، یان دوو، یان سێ، یان چوار، ئەوە بە هەموویان، هەشتیەکیان بەردەکەوێتو، هەریەك لە دایكو باوکی شەشیەکیان بەردەکەوێتو، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ منداڵەکانیەتی، هەر نێرینەك دوو ئەوەندەی مێینەیەکی بەردەکەوێت.

**بڕگەی چواردە: یاسای (کلالە) بابەتی یەکەم:**

(کەلالە) واتە: کەسێکی مردوو باوكو منداڵو(منداڵی منداڵی.....) لەپاش بەجێ نەمابێت.

ئەگەر پیاوێك یان ژنێك بمرێتو باوكو(باپیر)و منداڵو (منداڵی منداڵی) نەبێت، ئەوا خوشكو براکانی یاسای میرات دەیانگرێتەوە، دابەشکردنی میراتەکەش بەسەر ئەو خوشكو برایانەدا کە لە دایكو باوکی کەسە مردووەکەن، یان تەنها لە باوکینی، بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

**یەکەم:** ئەگەر کەسە مردووەکە یەك خوشکی لەپاش بەجێما کە لە دایكو باوکیەتی، یان تەنها لە باوکیەتی، ئەوا ئەو خوشکە، نیوەی میراتەکە دەگرێت.

إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ

﴿....ئەگەر کەسێك مردو هیچ منداڵێکی (نەنێر نەمێ)ی لەپاش بەجێ نەماو، خوشکێکی هەبوو (لە دایكو باوکی یان لە باوکی)، ئەوا ئەو خوشکە نیوەی ماڵی بەجێماوی براکەی دەگرێت.

**دووەم:** ئەگەر کەسە مردووەکە، یەك برای لەپاش بەجێما، کە لە دایكو باوکیەتی، یان تەنها لە باوکیەتی، ئەوا ئەو برایە هەموو میراتەکە دەگرێت.

وَهُوَ يَرِثُهَا إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ

﴿براکەش ئەگەر خوشکەکەی بمرێتو، هیچ منداڵێکی (نە نێر نە مێ)و دایكو باوکی لەپاش بەجێ نەما، ئەوا ئەو برایە، هەموو ماڵی بەجێماوی ئەو خوشکەی دەگرێت....﴾.

سێیەم: ئەگەر کەسە مردووەکە دوو خوشکی لەپاش بەجێمان، کە لە دایك و باوکین، یان تەنها لە باوکین، ئەوا ئەو دوو خوشکە، دوو لەسەر سێی میراتەکە دەگرن.

فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ

﴿....جا ئەگەر(خوشکەکان)دوودانە (یان زیاتر بوون)، ئەوا بە هەردووکیان، دوو لەسەر سێی ماڵە بە جێماوەکەی (برا بێ منداڵەکەیان) دەگرن....﴾.

چوارەم: ئەگەر کەسە مردووەکە چەند خوشك و برایەکی لەپاش بەجێمان، کە لە دایك و باوکینی، یان تەنها لە باوکینی، ئەوا هەموو میراتەکەیان بەسەردا دابەش دەکرێت، هەر نێرینەیەك دوو ئەوەندەی مێیینەیەکی بەردەکەوێت، لەدوای ئەوەی کە بەشی دایك و هاوسەرەکەی لێ دەدرێت.

وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِّجَالاً وَنِسَاء فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ

﴿....ئەگەر هاتوو (ئەوانەی لە پاش ئەوکەسە مردووە بێ منداڵەش بەجێمان)، چەندین براو خوشك بوون، ئەوا هەر نێرینەیەك دوو ئەوەندەی مێینەیەکی بەردەکەوێت....﴾. لەدوای ئەوەی کە بەشی دایك و هاوسەرەکەی لێ دەدرێت.

**بڕگەی پازدە:**

یاسای (کلالە)، بابەتی دووەم:

ئەگەر پیاوێك یان ژنێك بمرێت و باوك و(باپیرو) منداڵ و(منداڵی منداڵی....) نەبێت، ئەوا خوشك و براکانی یاسای میرات دەیانگرێتەوە، دابەشکردنی میراتەکەش بەسەر ئەو خوشك و برایانەدا کە تەنها لە دایکی کەسە مردووەکەن، بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

یەکەم: یەك برا، یان یەك خوشك لە دایکی کەسە مردووەکە، هەر یەکەیان شەشیەکی میراتەکە دەگرێت.

وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ

﴿.....ئەگەر هاتوو پیاوێکیش یان ژنێك( مرد)، بێ منداڵو(منداڵی منداڵ)و باوكو(باپیر) بوو، ئەو پیاوە، (یان ئەو ژنە)، برایەك یان خوشكێكی هەبوو(لە دایكی)، ئەوا شەشیەكی ماڵەكەی بەردەكەوێت.....﴾.

دووەم: ئەگەر چەند براو چەند خوشكێك بن لە دایكی كەسە مەردووەكە، ئەوا هەموویان هاوبەشن لە سێیەكی میراتەكە، نێرو مێ وەكو یەكیان بەردەكەوێت.

فَإِن كَانُوَاْ أَكْثَرَ مِن ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاء فِي الثُّلُثِ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ وَصِيَّةً مِّنَ اللهِ وَاللهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ (١٢)النساء

﴿....جا ئەگەر هاتوو ژمارەیان لەوە زیاتربوو، ئەوا ئەوان هاوبەشن لە سێیەكی ماڵەكەدا، دوای(جێبەجێ كردنی) ڕاسپاردەیەك كە مردووەكە ڕای دەسپێرێت، یان (دانەوەی) قەرزێك (كە لە ئەستۆی دایە)، كە زەرەر بە میراتگرەكان نەگەیەنێت، (ئەم یاسایە) ڕاسپاردەیەكە لەلایەن خواوە(بۆ خاوەنباوەڕەكان)، خواش زانایە (بەوەی كە ئێوە دەیكەن و)، پشووودرێژە (لە تۆڵە سەندنەوەدا)﴾.

**بڕگەی شازدە:**

ئەگەر پیاوێك یان ژنێك بمرێت و باوكو(باپیرو) منداڵو(منداڵی منداڵی) نەبێت و، خوشك و براشی نەبن نە لەدایك و باوكی و نە لە دایكی، بەلاّم كوڕی برای هەبوو، ئەوا:

كوڕی ئەو برایانە میراتەكە دەگرن، كە لە دایك و باوكی كەسە مردووەكەن، ئەگەر ئەو برایانەش كوڕیان نەبوون، ئەوا:

ئەو بەشەی كە ماوەتەوە لەمیراتەكە بەسەر كوڕی ئەو برایانەدا دابەش دەكرێت كە تەنها لە باوكی كەسە مردووەكەن، ئەگەر هەموو براكانی كەسە مردووەكەش كوڕیان نەبوو، ئەوا:

ئەو بەشەی ماوەتەوە لە میراتەكە، دەدرێت بە مامەكان كە لەگەڵ باوكی مردووەكەدا لە دایك و باوكێكن، ئەگەر ئەو مامانەش نەبوون یان لە ژیاندا نەمابوون، ئەوا:

میراتەکە دەدرێت بە مامەکان کە باوکیان لەگەڵ باوکی کەسە مردووەکەدا تەنها لە باوکەوەیە، ئەگەر ئەوانیش لەژیادا نەمابوون، ئەوا:

بەشە میراتەکە دەدرێت بەو ئامۆزایانەی کە باوکیان لەگەڵ باوکی کەسە مردووەکەدا لە دایك‌و باوکەوەیە، ئەگەر ئەوانیش نەبوون یان لە ژیاندا نەمابوون، ئەوا:

میراتەکە دەدرێت بە کوڕی ئەو مامانەی کە باوکیان لەگەڵ باوکی کەسە مردووەکەدا تەنها لە باوکەوەیەو دایکیان جیایە.

بڕگەی حەڤدە:

ئەگەر کەسێك بمرێت‌و، هیچ کام لەو میراتگرانەی سەرەوەی لەپاش بەجێ نەما، یاخود هەندێك خاوەن بەشی دیاری (ذوي الفروض) هەبوون، بەڵام شتێکی زیاد لە بەشەکەیان دەمایەوە، ئەوا ئەگەر (بيت المال) ڕێك نەخرابوو، ماڵ‌و سامانەکەی دەدرێت بە خزمی بەرێ (ذوي الارحام)، کە ئەم کەسانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

**یەکەم:** باوك‌و باپیرەکانی کە میرات بەری هەمیشەیی نین، وەکو: باوکی دایك‌و، باوکی باوکی دایك‌و، باوکی دایکی باوك‌و، دایکی باوکی دایکی کەسە مردووەکە.

**دووەم:** منداڵی کچی کەسە مردووەکە، جا کوڕبن یان کچ.

**سێیەم:** کچی برای کەسە مردووەکە، جا ئەو برایانە لە دایك‌و باوکی بن، یان تەنها لە باوکی بن، یان هەر لەدایکی بن.

**چوارەم:** کوڕی برای دایکی.

**پێنجەم:** منداڵی خوشکی مردووەکە، جا نێربن یان مێ.

**شەشەم:** مامی دایکی.

**حەوتەم:** کچی مام، هەر مامێك بێت.

**هەشتەم:** خوشکی باوك.

نۆیەم: خوشکی دایك.

دەیەم: برای دایك.

یازدە: ئەو کەسانەی کە دەگەن بە مردووەکە بەهۆی یەکێك لەو پەیوەندیانەی سەرەوە.

بۆ میرات گرتنی خزمی بەرێ، دەبێ (خزمەکەی بەرێ)، لەجێی ئەوکەسە دابنرێ کە بەهۆی ئەوەوە دەگاتە مردووەکەو، بۆتەهۆی ئەوەوەی لە میراتەکە بێبەش بکرێت.

کە ئەو(خزمانەی بەرێ)ش نەبوون، ئەوا ماڵەکە دەدرێت بە پیاوچاکانی ناوچەکە، بۆئەوەی بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان خەرجی بکەن، یان دەخرێتە (بیت المال)و لەڕێگای خوادا بۆ بەرژەوەندیی موسوڵمانان خەرج دەکرێ. (١٩٨ب)

(عائشە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: کۆیلەیەکی ئازادکراوی پێغەمبەر(صلى الله عليه و سلم) مرد، شتێکی لەدوای خۆی جێهێشتو نە منداڵو نە خزمی نەبوو، پێغەمبەریش(صلى الله عليه و سلم) فەرمووی: میراتەکەی بدەنە پیاوێکی خەڵکی گوندەکەی).(١٩٩)

بڕگەی هەژدە:

لەکاتی دابەشکردنی میراتەکاندا، ئەگەر خزمی نزیكو هەتیوو هەژارەکان ئامادەبوون، پێویستە نان بدرێنو بە نەرمی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت.

وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُوْلُواْ الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُواْ لَهُمْ قَوْلاً مَّعْرُوفاً (٨)النساء

﴿ئەگەر لەکاتی بەشکردنی ماڵەکەشدا، خزمی نزیكو هەتیوو هەژارەکان ئامادە بوون، ئەوا لەو ماڵە بژێویان پێ بدەنو، بەقسەی چاکیش لەگەڵیان بدوێن﴾.

خزمی کافرو موسوڵمان، میرات لەیەکتری ناگرن.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه و سلم) فەرموویەتی: موسوڵمان میرات لە کافر ناگرێت و، کافریش میرات لە موسوڵمان ناگرێت).(٢٠٠)

**بڕگەی نۆزدە:**

ئەگەر کەسێك لەژیانیدا وای ڕاگەیاند کە منداڵی کەسێکی تر، میراتی لێ دەگرێت، ئەوا ئەو منداڵە وەکو هەموو منداڵەکانی تری ئەو پیاوە مردووە، بەشە میراتی بەردەکەوێت.

**بڕگەی بیست:**

ئەگەر لە جاری یەکەم و دووەمی تەڵاقداندا، پیاوەکە پێش ماوەی دیاریکراوی تەڵاقدانەکە بمرێت، واتە تەڵاقدانەکە تەڵاقی (رجعی)بێت، ئەوا ژنەکە بێبەش نابێت لە میراتی مێردەکەی، بەڵام ئەگەر بە تەڵاقی (بائن)بێت، لە جاری سێیەمی تەڵاقدانەکەدا بێت یان سێ بەسێ تەڵاق درابێت، ئەوا ئەگەر پێش تەواوبوونی ماوەی دیاریکراوی تەڵاقدانەکەش پیاوەکە بمرێت، ئەو ژنە بێبەش دەبێت لە میراتی مێردەکەی.

**بڕگەی بیست ویەك:**

ئەگەر دوو کەس میرات لە یەکتری بگرن و، یەکێکیان ئەوی تر بکوژێت، ئەوە بکوژەکە هیچ میراتێك لە کوژراوەکە ناگرێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: پیاوکوژ هیچ مافێکی لە میراتی کوژراوەکەدا نیە).(٢٠١)

**بڕگەی بیست ودوو:**

ئەو منداڵەی بەهۆی داوێن پیسییەوە لەدایك دەبێت، میرات لە باوکەکەی ناگرێت.

**بڕگەی بیست وسێ:**

ئەگەر پیاوێك مردوو ژنەکەی دووگیان بوو، ئەوا بەشکردنی میراتەکە دوادەکەوێت تا منداڵەکە لەدایك دەبێ، جا ئەگەر منداڵەکە بە مردوویی لەدایك

بوو، ئەوا هیچ میراتێکی لە باوکەکەی ناکەوێت، بەڵام ئەگەر بە زیندوویی لەدایك بوو، پاشان مرد، ئەوە میرات لە باوکەکە دەگرێت.

**بڕگەی بیستوچوار:**

لەکاتی هەبوونی خاوەن بەشێك، یان لە کاتی هەبوونی کەسێك لەوانەی لە پشتی مردووەکەوە شۆڕبوونەوە(عصبە)، ئەم پەیوەندییە خێزانیانەی خوارەوە میرات لە مردووەکە ناگرن:

**یەکەم:** پووری(خوشکی باوك)و، پووری(خوشکی دایك).

**دووەم:** منداڵی کچەکەی، کوڕبن یان کچ.

**سێیەم:** کچی برا.

**چوارەم:** کچی مام.

**بڕگەی بیستو پێنج:**

هەر میراتگرێك ئەو بڕە میراتەی کە بەری دەکەوێت، ئەو ڕۆژەی کە بەشە میراتەکە وەردەگرێت، دەبێت بە سەرەتای ساڵی زەکاتدانی ئەوماڵەو، دوای تەواوبوونی ساڵێك لە خاوەنداریەتی ئەم ماڵە، دەبێت زەکاتی لێ دەربکات.

**بڕگەی بیستو شەش:**

کەسی نێرەموك کە هەردووك کۆ ئەندامی نێرەو مێیەی هەیە، تەماشا دەکرێت ئاخۆ زیاتر بەلای نێردایە یان بەلای مێدا، جا ئەگەر زیاتر بەلای نێردابوو، ئەوە بەشە میراتی وەکو نێرینەیەك بەردەکەوێتو، ئەگەر زیاتریش بەلای مێیایەتی دابوو، ئەوە بەشە میراتی وەکو مێینەیەك بەردەکەوێت، ئەگەر نێرایەتیو مێیایەتیەکەشی تێکەڵ بوو، ئەوە وەکو مێینەیەك دادەنرێت لە بەشە میراتەکەدا.

**بڕگەی بیستوحەوت:**

لە دابەشکردنی میراتەکەدا پێویستە ڕەچاوی ئەم قۆناغانەی خوارەوە بکرێت:

قۆناغی یەکەم: پابەندبوون بەو بەشە میراتانەوە کە خوا دەستنیشانی کردوون و لە پلەی یەکەمی میراتەکەدان، وەکو بەشە میراتی دایك و باوك و هاوسەرو منداڵەکان، هەر یەکێك لەوانە بەپێی ڕێژەی دیاریکراوی خۆی میراتەکەی دەدرێتێ، بەشداربووانی ئەم قۆناغە لە پلەی پێشەوەن هەتا ئەوان هەبن بەشداربووانی قۆناغەکانی تر میراتەکە نایانگرێتەوە.

قۆناغی دووەم: بەهۆی نەمانی یان نەبوونی منداڵ و(کوڕی کوڕ....)و باوکی و(باپیری) مردووەکەوە یاسای (کەلالە) دێتە ناو میراتەکەوە، هاتنە ناوەوەی یاسای (کەلالە)ش کارناکاتە سەر بەشە میراتی هاوسەرو دایکی مردووەکە لەقۆناغی یەکەمدا، جا ئەوەی لە بڕی میراتی قۆناغی یەکەم دەمێنێتەوە، دابەش دەکرێت بەسەر خوشك و براکاندا، ئەو خوشك و برایانەی کە لە دایك و باوکی مردووەکەن یان تەنها لە باوکینی، دوو لەسەر سێیان بەردەکەوێت و ئەو خوشك و برایانەش کە تەنها لە دایکینی، ئەگەر دوودانە یان زیاتر بوون، سێیەکەکیان بەردەکەوێت، ئەگەر یەك دانەش بێت شەشیەکی بەردەکەوێت، بەڵام ئەگەر هاتوو میراتگرەکانی قۆناغی یەکەم کەسیان لەژیاندا نەمابوون، ئەوا خوشك و براکان بەپێی ڕێژەکانی خۆیان هەموو میراتەکە دەگرن.

قۆناغی سێیەم: بەهۆی نەمانی یان نەبوونی منداڵ و(کوڕی کوڕ....)و باوك و(باپیر)و خوشك و برای مردووەکەوە، ئەوا مام و ئامۆزا نێرینەکان دێنە ناو میراتەکەوە.

(جابری کوڕی عبداللە دەڵێت: ئافرەتێك لەگەڵ دوو کچەکانی هات بە پێغەمبەری(صلی الله علیه و سلم) گوت: ئەو دوو کچانە کچی سابتی کوڕی قەیسن، لە شەڕی ئوحود لەگەڵ تۆدا بوو کوژرا، مامەکەشیان هەموو ماڵ و میراتەکەی بۆخۆی بردووەو هیچی بۆ جێ نەهێشتوون، خوا دەیزانێ ئەگەر ماڵ و سامانیشیان نەبێت مێردیان دەست ناکەوێت، پێغەمبەریش پێی گوت: خوا

بڕیــاری لەســەر دەدات، (ئەوەنــدەی پــێ نەچــوو) ئایــەتی (یوصــیکم الله في أولادکـم)لـە سـووڕەتی (النسـاء)هێنرایـە خـوارەوە، پێغەمبـەریش فـەرمووی ئافرەتەکـەو ئـەو کەسەشم بۆ بانگ بکـەن کە لەگەڵیدایـە، جا بە مامەکەیانی گوت: دوو لەسەر سێی ماڵەکە بدە بە کچەکانو، هەشتیەکیش بدە بە ژنەکەو، ئەوەی ماشەوە بۆخۆت).(٢٠٢)

برگەی بیستو هەشت:

میراتی کەسێکی دیل یان بێ سەروشوێن، دابەش ناکرێت هەتا ماوەیەکی وای بەسـەردا تێنەپـەڕێت کـە کەسـانێکی وەکـو ئـەو لەتەمەنـدا نـەمابن، جا ئەگـەر مردنەکـەی بەتـەوای ڕوون نـەبێت، ئـەوا بەشـێکی میراتەکـە بـەپێی یاسـاکانی مـیرات بەسـەر میراتگرەکانـدا دابـەش دەکرێـتو بەشێکیشـی دەمێنێـت تـا بەتەواوی ئاشکرا دەبێت کە مردووە.

برگەی بیستونۆ:

یاسای گەڕاندنەوە (الرد)

هەرکاتێك بڕی میراتەکـە زیـاتربوو لـە ڕێـژەی دیـاریکراوی میراتگرەکـان، ئـەوا ئەوەی دەمێنێتەوە جـارێکی تـر بەسـەر میراتگرەکانـدا دابـەش دەکرێتـەوە، بـەو مەرجانەی خوارەوە:

یەکەم: نابێت کۆچکردووەکە میراتگری پشتێی هەبن.

دووەم: دەبێـت لـە میراتگرتنەکـەدا خـاوەن فـەرزێك هـەبێت کـە خـوا بڕێکـی دیاریکراوی بۆ تەرخان کردبێت.

سـێیەم: دەبێــت بڕێــك لــە میراتەکــە مابێتــەوە دوای دابەشــکردنی بەســەر میراتگرەکاندا.

بۆنموونە: پیاوێك مرد تەنها چوار کچی لەپاش بەجێمان، بەپێی یاساکە بەهەر چوار کچەکە دوو لەسەر سێی میراتەکە دەبەن، واتـە یـەك لەسەرسێی میراتەکە دەمێنێتـەوە، جا ئەگـەر هـاتو لـەناو خزمەکانیـدا میراتگرێکـی وەهـا نـەبوو کـە

میراتی لێ بگرێت، ئەوا ئەو بەشە ماوەیە جارێکی تر بەسەر کچەکانیدا دابەش دەکرێتەوە، واتە کچەکانی هەموو میراتەکە دەگرن، ژن و مێردیش ئەم بڕگە شەرعییە نایانگرێتەوەو لە بەشی دیاریکراوی خۆیان زیاتریان بەرناکەوێت.

**بڕگەی سێ:**

**یاسای عەول**

ئەگەر لە دابەشکردنی هەر بەشە میراتێکیش گرفتێك دروست بوو بەهۆی زۆری میراتگرەکانەوە، ئەوا سەرەتا بڕی دیاریکراوی بەشە فەرزەکان دەدرێت، ئەوسا ئەوانەی کە بە دوایاندا دێن، وەکو لەم نموونەیەدا:

ئافرەتێك مرد منداڵی نەبوو، مێردوو دایكو دوو خوشکی لە دایكو باوکی و دوو خوشکی لە دایکی بەجێمان، مێردەکەی نیوەی دەکەوێت، دایکەکەی شەش یەکی دەکەوێت، خوشکەکانی لە دایكو باوکی دوو لەسەر سێیان دەکەوێت، خوشکەکانی لە دایکی یەك لەسەر سێیان دەکەوێت، ئەگەر میراتەکە بە پێی ڕێژەکان بەش بکرێن، ئەوا میراتەکە بەشی هەموو میراتگرەکان ناکات، ئەگەر ژمارەی بەشەکانیش زیاد بکەین، ئەوا مێردو دایکەکە بەشەکەیان کەم دەکات، لەسەردەمی خەلافەتی عومەردا(ڕەزای خوای لێبێت) کێشەیەك درووست بوو لەسەر دابەشکردنی میراتەکە، بۆیە بەپێی کردارێکی ژمێریاری پەنایان بۆ زیادکردنی پشکەکان بردو ئەم کردارەیان ناولێنا (عەول)، زۆرینەی هاوڕێکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پەیڕەوییان کرد، بەڵام ابن عباس(ڕەزای خوای لێبێت) بەم کردارە ڕازی نەبوو لەبەرئەوەی لە بەشە فەرزەکانی دایكو مێردی ئافرەتە مردووەکەی کەم دەکردەوە، بۆئەوەی خوشكو براکان بەشیان بەربکەوێت، ئێمە پشتیوانی لە بۆچوونەکەی ابن عباس دەکەین(ڕەزای خوای لێبێت)، کە نابێت هیچ گۆڕانکارییەك بەسەر بەشە میراتە فەرز کراوەکاندا بێت، بەپێی دەسەڵاتی ئایەتەکەی قورئان کە دەفەرموویت:

فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ

﴿.....جا ئەگەر وابوو پیاوە مردووەکە(منداڵی نەبوو، دایكو باوكی میراتیان دەگرت)، بەڵام براو خوشكی هەبوون، ئەوا شەش یەكی ماڵەكە بۆ دایكیەتی، دوای (جێبەجێكردنی) ڕاسپاردەیەك كە مردووەكە ڕای دەسپێرێت یان (دانەوەی) قەرزێك (كە لەئەستۆی مردووەكەدایە)....﴾.

بەپێی ئەم بڕگە یاساییە، شەشیەكی ماڵەكە بۆ دایكیەتی، ئەگەر ژنیشی هەبێت، چواریەكی ماڵەكە دەگرێت، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ باوكیەتی، (لێرەدا مادام باوكی مردووەكە هەیە، براو خوشكەكان نایەنە ناو میراتەكەوە.

بەڵام ئەگەر باوكی مردووەكە لە ژیاندا نەمابوو، ئەوا براو خوشكی مردووەكە دێنە شوێنی باوكیانو لەو بڕە ماوەیە میرات دەگرن كە لە هاوسەرو دایكی مردووەكە زیاد دەبێت، هاتنەناوەوەی براو خوشكەكان بۆ ناو میراتەكە، هیچ لە میراتی هاوسەرو دایكەكە كەم ناكاتەوە، بەڵام ئەگەر هاتو مردووەكە كەسی لەپاش بەجێ نەمابوو، ئەوا خوشكو براكانی بەپێی یاسای كەلالە هەموو میراتەكە دەگرن، هەر یەكەیان بە ڕێژەی خۆی بەپێی نزیكیان لە مردووەكەوە.

(لەسەر ئەم بنەمایەش بوو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە كێشەی كچەكانی سابتی كوڕی قەیس بە مامەكەیانی گوت: دوو لەسەر سێی ماڵەكە بدە بە كچەكانو، هەشتیەكیش بدە بە ژنەكەو، ئەوەی ماشەوە بۆخۆت)، وەكو لە قۆناغی سێیەمی بڕگەی بیستوحەوتیشدا خستوومانەتە ڕوو، مامیش بەهۆی نەبوونی باوكو خوشكو براو، كوڕی برای مردووەكەوە دێتە ناو میراتەكەوەو شوێنی باوكی مردووەكە دەگرێتەوە.

بۆیە لە نموونەكەی سەرەوەدا پێویستە سەرەتا بەشی مێردەكەو دایكەكە جیابكرێتەوە، ئەوەی ماشەوە بۆ خوشكەكانی دەبێت، لە ژمێریاریەكەشدا پێویستیمان بە(عەول) نابێت. (عەول)وەكو ئەوە وایە چەند ڕێبوارێك هەر یەكە خواردنی تایبەتی خۆی پێبێتو لە كاتی نان خواردندا هەموویان لەسەر خوانێك كۆببنەوە هەریەكەیان لە خواردنی ئەوەكەی تر دەخوات، بەم پێیە

هـەموو ڕێبوارەکـان تێـردەبن، بـەڵام ئـەو تێربوونـە لەسـەر حسـابی ئەوەیـە کـە هەندێکیان خواردنە باشـەکانی خۆیـان لەدەسـت دەدەن و هەنـدێکی تریشـیان لـەجیاتی خواردنــە خراپــەکانی خۆیــان، خواردنــە چــاکەکانی هاوڕێکانیــان دەخـۆن. بـەڵام یاسـای میـرات ڕێککـەوتن نییـە لەسـەر دابەشـکردنی میراتەکە، بـەڵکو لەلایـەن خـواوە هـەر بەشـێك دیـاریکراوەو سـەپێنراوە، هـەروەکو خـوا دەفەرموویێت:

آبَآؤُكُمْ وَأَبناؤُكُمْ لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعاً فَرِيضَـةً مِّنَ اللهِ إِنَّ اللهَ كَانَ عَلِيما حَكِيماً (١١)النساء

﴿..ئێـوە نـازانن باوانــەکانتان یــان منداڵــەکانتان کامــەیان زیــاتر ســوودتان پێدەگەیەنن و(لێتانەوە نزیکن)، (دابەشکردنی میرات) پێویسـتکراوێکە (لەسـەر خاوەنباوەڕەکان) لەلایەن خواوە، بەڕاستی خوا زاناو کاردروستە﴾.

نموونەیــەك لەســەر پــەیڕەوی کردنــی شــێوازی عــەول، کــە پێویســتە لەســەر ڕەزامەندی هەموو میراتگرەکان ئەنجام بدرێت:

ئافرەتێك مرد، مێردو دایك و باوك و کچێك و کچێکی کوڕەکەی و (٣٠)ملیـون دیناری لەدوا بەجێمان.

مێردەکە چواریەك دەگرێت، دایکەکە شەشیەك دەگرێت، باوکەکە شەشیەك دەگرێت، کچەکە نیوەی میراتەکە دەگرێت، کچی کوڕەکەی شەشیەکی میراتەکە دەگرێت، ئەگەر هەموو ئەو بەشانە کۆبکەینەوە بچوکترین کۆلکەی هاوبەشیان بۆ هەڵبژێرین، دەبینین: بەشەکان زیاترن لەبڕی ماڵە جێماوەکە:

مێرد، دایك، باوك، کچ، کچی کوڕ

$$\frac{١٥}{١٢}=\frac{٢+٦+٢+٢+٣}{١٢}=\frac{١}{٦}+\frac{١}{٢}+\frac{١}{٦}+\frac{١}{٦}+\frac{١}{٤}$$

(٢ ، ٦ ، ٢ ، ٢ ، ٣)

کەواتە دەبێت ماڵەکە بکرێت بە(١٥)پشك:

واتە (٣٠) ملیۆنەکە دەکرێت بە (١٥)پشکەوە، هەر پشکەی دەکاتە:

(٣٠)مليۆن ÷ ١٥پشك = (٢)مليۆن بەشی هەر پشكێك.

ئینجا پازدە پشكەكە بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش دەكرێت:

مێردەكە (٣)پشكی بەردەكەوێت، كە دەكاتە: ٣ × ٢ = (٦)مليون دينار.

دايكەكە (٢)پشكی بەردەكەوێت، كە دەكاتە ٢×٢= (٤)مليون دينار.

باوكەكە (٢)پشكی بەردەكەوێت، كە دەكاتە ٢ ×٢= (٤)مليون دينار.

كچەكە (٦)پشكی بەردەكەوێت، كە دەكاتە ٦ × ٢ = (١٢)مليون دينار.

كچی كوڕەكە (٢)پشكی بەردەكەوێت، كە دەكاتە ٢ × ٢ = (٤)مليون دينار.

بۆ ڕاستی ژمێرياريەكەش هەموو پشكەكان كۆدەكەينەوە:

(٦) مليونی مێردەكە+ (٤)مليونی دايكەكە+ (٤)مليونی باوكەكە+ (١٢)مليۆنی كچەكە+ (٤)مليۆنی كچی كوڕەكە= (٣٠) مليۆن، كەواتە ئەنجامەكە تەواوە.

ئەمە لەكاتێكدا بەپێی حوكمی ئايەتەكە پياوەكە چواريەكی سی مليۆنەكەی بەردەكەوێت لە ميراتی ژنەكەيدا كە دەكاتە: (٧,٥٠٠ مليۆن).

چەند نمونەيەك لەسەر دابەشكردنی ميرات بەسەر ميراتگرەكاندا:

نموونەی يەكەم:

پياوێك مرد، دايكو باوكو دوو براو دوو خوشكو هاوسەرو دوو كوڕو دوو كچو، بڕی (٥٠)مليۆن دیناری لەپاش بەجێماو، (٤)مليۆن دیناری خەڵكيش قەرزدار بوو، بۆ دابەشكردنی ميراتەكە پێويستە پەيڕەوی ئەم هەنگاوانە بكرێت:

هەنگاوی يەكەم: مادام لەميراتگرەكاندا منداڵو دايكو باوكو هاوسەری هەيە، كەواتە براو خوشكەكان دوور دەخرێنەوە.

هەنگاوی دووەم: مادام پياوە مردووەكە منداڵی هەن، كەواتە دايكوباوكی هەريەكەيان شەشيەكی ماڵەكەيان بەردەكەوێت.

هەنگاوی سێيەم: مادام منداڵی هەن، كەواتە ژنەكەی هەشتيەكی ماڵەكەی بەردەكەوێت.

هەنگاوی چوارەم: مادام قەرزدارە، کەواتە (٤)ملیۆن قەرزەکە لە پارەی میراتەکە دەردەکرێت و دەدرێتەوە بە خاوەنەکەی، واتە: ئەوماڵەی کە دەکەوێتە بەر یاساکە بریتی دەبێت لە: (٥٠–٤ = ٤٦ملیۆن).

هەنگاوی پێنجەم: ئەو (٤٦) ملیۆنە دابەش دەکرێت بەسەر شەشدا، بۆ دیاریکردنی بەشی هەریەك لە دایك و باوکی:

٤٦,٠٠٠,٠٠٠÷ ٦= ٧,٦٦٦,٦٦٦ بەشی هەریەکێك لە دایك و باوکەکە.

هەنگاوی شەشەم: ئەو (٤٦) ملیۆنە دابەش دەکرێت بەسەر هەشتدا، بۆ دیاریکردنی هەشتیەکی ژنەکەی:

٤٦,٠٠٠,٠٠٠÷ ٨ = ٥,٧٥٠,٠٠٠ ملیۆن

هەنگاوی حەوتەم: بەشی دایك و باوك و ژنەکە کۆدەکرێتەوەو لە بڕەمیراتە گشتیەکە دەردەکرێت، ئەوەی کە دەمێنێتەوە بەشی منداڵەکانیەتی:

بەشی باوك ٧,٦٦٦,٦٦٦ + بەشی دایك ٧,٦٦٦,٦٦٦+ بەشی ژنەکەی ٥,٧٥٠,٠٠٠ = ٢١,٠٨٣,٣٣٢ملیۆن

٤٦,٠٠٠,٠٠٠ – ٢١,٠٨٣,٣٣٢ = ٢٤,٩١٦,٦٦٨ بەشی منداڵەکان.

هەنگاوی هەشتەم: بەپێی یاساکە، بەشی کوڕێك وەکو بەشی دوو کچ وایە، واتە: ئەگەر بەشی کچێك(س)بێت، ئەوا کوڕێك (٢س)ی بەردەکەوێت، ئینجا بەدوای نرخی (س)دا دەگەڕێن، بۆ دیاریکردنی هەر بەشێك لەبەشەکان، بۆیە پێویستە بەشی هەموو کوڕو کچەکان کۆبکرێنەوە:

کوڕی یەکەم(٢س) + کوڕی دووەم(٢س) + کچی یەکەم(س) + کچی دووەم(س) = ٦س

ئەو پارەیەی کە ماوەتەوە ٢٤,٩١٦,٦٦٨ ÷ (٦س) دەکرێت، بەم پێیە:

(٦س) = ٢٤,٩١٦,٦٦٨ملیۆن.

واتە: س= ٢٤,٩١٦,٦٦٨÷ ٦ = ٤,١٥٢,٧٧٨ ملیۆن.

کەواتە بەشی هەر کچێك =٤,١٥٢,٧٧٨ ملیۆن دینار.

بەشی هەرکوڕێك = ٢س = ٢ × ٤,١٥٢,٧٧٨ = ٨,٣٠٥,٥٥٦ ملیۆن دینار.

جا بۆ دڵنیابوونەوە لە کردارە ژمێریاریەکە، هەموو بەشەکان کۆدەکەینەوە دەبێت بکاتەوە(٤٦)ملیۆنەکە:

٨,٣٠٥,٥٥٦ + ٨,٣٠٥,٥٥٦+ ٥,٧٥٠,٠٠٠ + ٧,٦٦٦,٦٦٦ + ٧,٦٦٦,٦٦٦ + ٤,١٥٢,٧٧٨ + ٤,١٥٢,٧٧٨ = ٤٦,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن، کەواتە کردارە ژمێریاریەکە تەواوە.

نموونەی دووەم:

پیاوێك مرد، دە ملیۆن دینارو (١٠)دە سەر مەڕو سەیارەیەك‌و خانوویەك‌و دوو ژن‌و دایك‌و باوکی‌و کوڕو کچێکی لەپاش بەجێماو، ملیۆنێکی خەڵکیش قەرزدار بوو، وەسیەتیشی کرد دوای مردنی بڕی (٣)سێ ملیۆن دینار بۆ کاروباری گۆڕستان خەرج بکرێت، بۆ دابەشکردنی میراتەکە پەیڕەوی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە دەکەین:

هەنگاوی یەکەم: لەلایەن دەستەیەکی زاناو شارەزاوە مەڕو سەیارەو خانووەکە دەکرێن بە پارە، لەم نموونەیەدا وای دادەنێین کە:

نرخی هەرمەڕێك = (٢٠٠,٠٠٠)دووسەد هەزار دینار، کەواتە نرخی مەڕەکان دەبێتە: ١٠× ٢٠٠,٠٠ = ٢,٠٠٠,٠٠٠ملیۆن دینار.

سەیارەکە: دوای پرسیارکردن لەچەند شوێنێکی پاوەڕپێکراو، وای دادەنێن نرخەکەی = ٦ملیۆن دینار.

خانووەکە: دوای پرسیارکردن لەچەند شوێنێکی پاوەڕپێکراو، وای دادەنێن نرخەکەی = ٥٠ملیۆن دینار

واتە: پارەی مەڕەکان+ پارەی سەیارەکە+پارەی خانووەکە=

٢ملیۆن+ ٦ملیۆن+ ٥٠ملیۆن= ٥٨ ملیۆن.

هەنگاوی دووەم: نرخی مەڕو سەیارەو خانووەکە لەگەڵ ئەو بڕە پارە کاشەدا کۆ دەکرێتەوە کە مردووەکە جێیهێشتووە، بەم شێوەیە:

١٠مليۆن پارە+ ٥٨مليۆنی مەڕو، خانوو، سەيارە = ٦٨مليۆن.

هەنگاوی سێيەم: سەرەتا قەرزەكە لە هەموو پارەكە دەردەكەين:

٦٨مليۆن – (١)مليۆن قەرز = ٦٧مليۆن.

هەنگاوی چوارەم: بڕە پارەی وەسيەتی مردووەكە لە باقی پارە ماوەكە دەردەكەين:

٦٧مليۆن – (٣)مليۆنی وەسيەكەتەكە= ٦٤ مليۆن.

هەنگاوی پێنجەم: مادام پياوەكە منداڵی هەن، كەواتە: ژنەكانی هەشتيەكی ماڵەكەيان بەردەكەوێت:

٦٤ مليۆن÷ ٨ = ٨ مليۆن (بەشی هەردووك ژنەكانی)

واتە بەشی هەر ژنێك= ٨÷٢ = ٤مليۆن.

هەنگاوی شەشەم: دياريكردنی بەشی دايكو باوكی:

مادام مردووەكە منداڵی هەيە، كەواتە دايكوباوكی هەريەكەيان شەشيەكيان بەردەكەوێت:

٦٤÷٦=١٠,٦٧٠مليۆن بەشی هەريەكێك لە دايكو باوكی.

كەواتە بەشی دايكو باوكی دەكاتە: ١٠,٦٧+١٠,٦٧ = ٢١,٣٣٤مليۆن.

هەنگاوی حەوتەم: بەشە ميراتی ژنەكانو دايكو باوكەكە كۆدەكەينەوەو ميراتە گشتييەكەی دەردەكەين، ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ منداڵەكانيەتی.

٨ مليۆنی ژنەكانی + ٢١,٣٣٤مليۆنی دايكو باوكی= ٢٩,٣٣٤مليۆن.

٦٤مليۆن–٢٩,٣٣٤مليۆن= ٣٤,٦٦٦مليۆن بەشی منداڵەكانی.

هەنگاوی حەوتەم: مادام پياوەكە كوڕێكو كچێكی لەپاش بەجێماوە، ئێمە وای دادەنێين بەشی كچێك = س

بەشی كوڕێك دوو ئەوەندەی بەشی كچێكە، بەشی كوڕەكەش دەبێت بە:

س+س = ٢س

كەواتە بەشی كوڕەكە لەگەڵ بەشی كچەكە = س+ ٢س= ٣س

٣س = ٣٤,٦٦٦مليۆن دينار

کەواتە س= ٣٤,٦٦٦ ÷ ٣ = (١١,٥٥٥) مليۆن بەشی کچەکەيە.

٣٤,٦٦٦مليـۆن – ١١,٥٥٥مليـۆنی بەشـی کچـەکە = (٢٣,١١) مليـۆن بەشـی کوڕەکە.

جا بۆدڵنيابوونـەوە لـە کـرداره ژمێرياريەکـە، هـەموو بەشـەکان کۆدەکەينـەوە دەبێت بکاتەوە(٦٨)مليۆنەکە:

(١)مليـۆن قـەرز+ (٣)مليـۆن وەسـيەت+ (٨)مليـۆن بـۆ هـەردووك ژنـەکانی+ (٢١,٣٣٤)مليۆن بۆ دايك‌و باوکی+ (١١,٥٥٥)بۆکچەکەی+ (٢٣,١١١)مليـۆن بـۆ کوڕەکەی = ٦٨مليۆن دينار، کەواتە دابەشکردنەکە تەواوە.

ميراتگرەکانيش لەنێوان خۆياندا دەتوانن لەسەرئەوە ڕێك بکەون، کە بەچەند کەسێکيان لەبری پارە، خانووەکەيان هەڵبگرنەوەو نەيفرۆشن، يان سەيارەکە هەڵبگرنەوەو نەيفرۆشن، ئەگەر هەمووشيان تەبابوون لەسەرئەوەی کە خانوو يـان سـەيارە يـان هـەر شـتێکی تـری مردووەکـە نەخەنـە دابەشـکردنەوە بـە مەبەستی ژيان‌و گوزەران، ئەوا دەتوانن تەنها پارە کاشەکە دابەش بکەن، دوای دانەوەی قەرزو جێبەجێ کردنی وەسيەتەکە، ماڵەکەی تـريش لـەژێر دەسـەڵاتی ئەم دابەشکردنەدا دەمێنێتـەوە، کـەی ويسـتيان لـەيەکتری جيابېنـەوە پـەيڕەوی دابەشکردنەکە دەکەن.

نموونەی سێيەم:

پياوێـك مـرد، منـداڵی نـەبوو، (٥٠)مليـۆن دينـارو ژنێـك‌و دايـك‌و بـاوك‌و خوشـکێکی لـەپاش بـەجێماو، وەسـيەتی کـرد (٦)مليـۆن دينـار بـدرێت بـە خوشکەکەی‌و باقيەکەی بەسەر ميراتگرەکاندا دابەش بکرێت، بۆ دابەشـکردنی ئەم برە ميراتانە، پەيرەوی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە دەکەين:

هەنگاوی يەکەم: مادام کەسێکی ميراتگر هەيە، کەواتە خوشکەکەی نايەتە ناو هاوکێشـەکەوە، بـەڵام مـادام وەسـيەتی کـردووە کـە(٦)مليـۆن بـدرێت بـە

خوشكەكەی، ئەوا سەرەتا بڕی (٦) ملیۆن جیادەكرێتەوە بۆ خوشكەكەی، بە مەرجێك بڕی وەسیەتەكە لەسێیەكی میراتەكە زیاتر نەبێت، یان زیاتربێت بەڵام میراتگرەكان ڕازامەندیان لەسەربێت.

(٥٠)ملیۆن− (٦) ملیۆن بۆ خوشكەكەی وەكو وەسیەت = (٤٤)ملیۆن دەمێنێتەوە بۆ ژنەكەیو دایكو باوكی.

**هەنگاوی دووەم:** مادام ژنەكەی منداڵی نیە، واتە چواریەكی ماڵەكەی دەست دەكەوێت:

(٤٤)ملیۆن ÷ ٤ = (١١)ملیۆن بەشی ژنەكەی.

ئەوەی دەمێنێتە بۆ دایكو باوكی= (٤٤)ملیۆن− (١١)ملیۆن= (٣٣)ملیۆن.

**هەنگاوی سێیەم:** مادام منداڵی نیە، واتە دایكی سێیەكی هەموو میراتەكەی بەردەكەوێت، ئەوەی دەشمێنێتەوە بۆ باوكیەتی:

(٤٤)ملیۆن بڕی هەموو میراتەكە ÷ ٣ = (١٤,٦٦٧) ملیۆن، بەشی دایكی.

(٣٣)ملیۆن بڕی ئەوەی ماوەتەوە دوای میراتی ژنەكە − (١٤,٦٦٧)ملیۆنی بەشی دایكەكە = (١٨,٣٣٣) ملیۆن بەشی باوكی.

جا بۆ دڵنیابوونەوە لەكردارە ژمێریاریەكە، هەموو بەشەكان كۆدەكەینەوە دەبێت بكاتەوە(٥٠)ملیۆنەكە:

(٦)ملیۆن وەسیەت بۆخوشكی + (١١)ملیۆن بۆ ژنەكەی + (١٤,٦٦٧)ملیۆن بۆدایكی +(١٨,٣٣٣)ملیون بۆ باوكی= (٥٠)ملیۆن، كەواتە دابەشكردنەكە تەواوە.

**نموونەی چوارەم:** پیاوێك یان ژنێك مرد، (١٢)ملیۆن دیناری لەپاش بەجێما، نە هاوسەر نە منداڵ نە دایك نە باوكی نەبوو میراتی لێبگرن، بەڵام خوشكو برایەكی هەبوو لە دایكیو، دوو خوشكو برا یەكیشی هەبوو لە دایكو باوكی، ئەوا میراتەكە بەم شێوەیە دابەش دەكرێت:

هەنگاوی یەکەم: ئەو براو خوشکە کە لە دایکینی ئەگەر تەنها برا یان خوشکێك بن، ئەوا هەر یەکەیان شەشیەکی میراتەکەیان بەردەکەوێت، ئەگەر زیاتریش بوون لە یەك کەس، ئەوا هەموویان سێیەکی ماڵەکەیان بەردەکەوێت:
لەم نموونەیەدا ئەو خوشكو برایەی کە لە دایکنی بە هەردووکیانیان سێیەکیان بەردەکەوێت:
(١٢)ملیۆن ÷٣ = (٤)ملیۆن بەشی خوشكو برایەك کە تەنها لە دایکینی.
(١٢)ملیۆن- (٤)ملیۆن = (٨)ملیۆن دەمێنێتەوە بۆ ئەو خوشكو برایانەی لە دایكو باوکنی یان تەنها لە باوکنی، کە دەکاتە دوو لەسەر سێی هەموو میراتەکە.
هەنگاوی دووەم: ئەوانەی کە لەدایكو باوکینی، ئەگەر تەنها یەك خوشك بێت، ئەوە نیوەی ماڵی براکەی دەگرێت، بەلاّم ئەگەر بوون بە دووخوشك، ئەوا بە هەردووکیان دوو لەسەرسێی میراتەکە دەگرن، ئەگەر تەنها یەك براش بێت ئەوا هەموو میراتی خوشکەکەی دەگرێت، ئەگەر دوو خوشكو برایەك یان زاتربوون کە لە دایكو باوکنی یان هەر لە باوکنی، ئەوا بەشە میراتەکە بەشێوەیەك دابەش دەکرێت بەسەریاندا کە هەر نێرینەیەك دوو ئەوەندەی مێیینەیەکی بەردەکەوێت:
لێرەدا ئەوانەی لە دایكو باوکین، یان هەر لە باوکین، دوو خوشكو برایەکن، کەواتە دابەشکردنەکە بەم شێوەیە دەبێت:
ئەو پارەیەی کە بۆ ئەو خوشكو برایانە ماوە = (٨)ملیۆن دینار.
ئەگەر بەشی هەر خوشکێك یەکسان بێت بە (س)، ئەوا بەشی برایەك دەبێت بە (٢)س.
بەشی خوشکی یەکەم(س)+ بەشی خوشکی دووەم(س) + بەشی براکە(٢س) = (٤)س.
(٤)س= (٨)ملیۆن دینار.

**کەواتە س= ٨ملیۆن ÷ ٤ = (٢)ملیۆن دینار، بەشی هەر خوشکێك.**

**کەواتە بەشی براکەی = (٢)ملیۆن + (٢)ملیۆن = (٤)ملیۆن.**

**جا بۆدڵنیابوونەوە لە کردارە ژمێریاریەکە، هەموو بەشەکان کۆدەکەینەوە دەبێت بکاتەوە(١٢)ملیۆنەکە:**

**(٤)ملیۆنی ئەو براو خوشکانەی کە تەنها لە دایکنی+ (٨)ملیۆنی ئەو براو خوشکانەی کە لەدایكو باوکین یان تەنها لە باوکین= (١٢)ملیۆن، کەواتە دابەشکردنەکە تەواوە.**

## دەروازەی شەشەم

## یاسای مامەڵەکردن

**بڕگەی یەکەم:**

وَأَحَلَّ اللهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا.. (٢٧٥ البقرة)

﴿....خـوا(قـازانجی) شـت فرۆشـتنی ڕەوا کـردووەو، سـوودی پـارەی بـە قەرزدراویشی قەدەغە کردووە....﴾.

هەموو مامەڵەیەك گونجاوە، بەمەرجێك مامەڵەکردنەکە بەو شتانەوە نەبێت کە قەدەغە کراون، لەو سنوورانەی خوارەوەش دەرنەچن:

یەکـەم: مامەڵـەکردن قەدەغەیـە بـە گۆشـتی سـەگ و پشـیلەو بـەرازو گۆشـتی گیانـەوەرە بارهەڵگرەکان(جگـە لـە بـارگین و مـاین و حوشـتر)و، هـەموو ئـەو خواردنانەش کە قەدەغە کراون لە ئیسلامدا، بەڵام ڕێگەدراوە مامەڵە بە سەگی ڕاوەوە بکرێت، لەبەر پێویستی ڕاوچییەکان، یان مامەڵە بە سەگەوە بگرێت بۆ پاسەوانی مەڕومالاّت و باخ و بێستان.

دووەم: مامەڵـەکردن قەدەغەیـە بـە هـەموو مـاددە هۆشـبەرەکان، (لـە هـیچ سەردەمێکیشـدا خواردنەوەیـەك نـەبووە بـە نـاوی بـیرەی ئیسـلامیەوە)، لـە خواردنـەوە هۆشـبەرەکاندا، تـەنها بـوونی (الکحـول) لەبەرچاو ناگیرێـت، بـەڵکو کاریگەری ماددەکە لەبەرچاو دەگیرێت، لە سەرخۆشکردنی تاکەکان، ئینجا ئەو ماددانە شل یان توند یان گازی بن.

سێیەم: مامەڵەکردن قەدەغەیە بە مرۆڤە ئازا دەکانەوە، تـەنها کۆیلـەکان نـەبن، کەنیزەیەکیش کە بوو بە خاوەن منداڵ، کڕین و فرۆشتنی پێوە ناکرێت.

چوارەم: مامەڵـەکردن قەدەغەیـە بـە ئەنـدامی جەسـتەی زیندووەکانـەوە، وەکـو فرۆشتنی گورچیلەکان.

پێنجەم: مامەڵەکردن قەدەغەیە بە خۆراکی خراپ بوو ماوە بەسەرچووەکانەوە بکرێـت، بـەڵام دەکرێـت مامەڵـە بـە شـتێکەوە بکرێـت لـە بنەڕەتـدا پـاك بێـت و،

بەهۆی شتێکی پیسەوە کاری لێکرابێت، وەکو قوماشێك شتێکی پیسی بەسەردا ڕژابێت، بە مەرجێك بتوانرێت ئەو پیسیە لابرێت، بەڵام ئەگەر نەتوانرا پیسیەکە لابرێت، وەکو پیسبوونی زەیت یان هەنگوین کە بواری پاککردنەوەیان نیە، ئەوا کڕین و فرۆشتنیان قەدەغەیە.

**شەشەم:** مامەڵەکردن قەدەغەیە بەو نووسراوو پەرتووکانەوە کە دژ بە ئایینی پیرۆزی ئیسلامن، بەڵام ڕێگەدراوە بە فرۆشتنی قورئان و کتێبە ئایینیەکان، لەبەرئەوەی ئەوانەی کە نووسیویانەتەوە مافی خۆیانە ئەرکی ماندووبوونیان وەربگرن.

**حەوتەم:** شتێك کاملْ نەبوو بێت و نەهاتبێتە بەرهەم، مامەڵەی پێوە ناکرێت، وەکو: بەری ئەو میوانەی بە تەواوی نەڕزاون و نازانرێت کۆتاییەکەیان چۆن دەبێت.

**هەشتەم:** مامەڵەکردن قەدەغەیە بە کەلوپەل و کەرەستەکانی بەرژەوەندیی گشتی.

**نۆیەم:** ئەگەر مامەڵەیك لەنێوان دووکەسدا کرا، قەدەغەیە کەسێکی تر بێتە نێوانەوەو نرخی ماڵەکە زیاد بکات و، وەکو هەڵخەڵەتاندنێك ماڵەکە لەبەرچاوی کڕیارەکە خۆشەویست بکات، یان بیەوێت مامەڵەکەی ئەوان هەڵوەشێنێتەوەو خۆی بیکڕێت، لەم بارەدا یەکەم کڕیار خاوەن مافترە ماڵەکە بکڕێت، یان کەسێك بە کڕیارەکە بڵێت: ئەوە نرخەکەی زۆرە، وازی لێبێنە من بە هەرزانتر پێت دەفرۆشم، بەڵام ئەگەر کەسێك کەلوپەلێکی خۆی خستە مەزادەوە لەنێو کۆمەڵێك خەڵکدا، ئەوا ماڵەکە دەبێت بە هی ئەوکەسەی کە زۆرترین نرخی داوەو، لەدوای ئەو کەسێکی تر نرخەکەی زیاد نەکردووە.

**(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، فەرموویەتی: با یەکێك لەئێوە بەسەر مامەڵەی یەکێکی ترتانەوە هەڵنەوەستێت)**.(٢٠٣)

دەیەم: نابێت فرۆشیاری ناوشارەکان کەلوپەلی گوندنیشینەکان وەربگرن و بۆیان بفرۆشن، لەبری ئەوەی شتێکیان هەقە دەلاَلی دەسکەوێت هەقی فرۆشتنەکە، با کڕیارەکانی ناوشار شتەکان لە گوندنیشینەکان بکڕن و بۆخۆیانی بفرۆشنەوە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، فەرموویەتی: با خەڵکی نیشتەجێ شتومەکی گوندنیشینەکان نەفرۆشن، با لە خەڵکی گەڕێن (بۆخۆیان شتەکانی خۆیان بفرۆشن)، خوا لە مامەڵی نێو خۆیاندا ڕزق و ڕۆزی دەداتە هەمووان).(٢٠٤)

یازدە: شاردنەوەی کەلوپەلەکان لەلایەن فرۆشیارەکانەوەو هێشتنەوەی بۆئەوەی لە کاتێکی تردا بە نرخی بەرزتر بیفرۆشن، لە ئیسلامدا قەدەغەکراوە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، فەرموویەتی: ئەوکەسەی کەلوپەلەکان دێنێت، خوا ڕزقی دەدات، ئەو کەسەش دەیانشارێتەوە نەفرینی خوای لەسەرە).(٢٠٥)

دوازدە: قەدەغەیە پێداهەڵدان بە کەلوپەلەکاندا بکرێت، بە مەبەستی ئەوەی خەڵکی پێ هەڵخەڵەتێنی.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ناڕەزامەندی دەربڕیوە لەسەر بەسەردا هەڵگوتنی کەلوپەلەکان).(٢٠٦)

سێزدە: قاچاغی کردن قەدەغەیە، نابێت کەلوپەل لە چەرچی و بازرگانە گەڕۆکەکان بکڕدێت، کە لە دەرەوەی ناوچەکەوە کەلوپەلە پێچراوەکان دێنن و، کەلوپەلی ناوچەکەش دەکڕن و دەیبەنەوە، چونکە دەبێتەهۆی تێکدانی بازارەکە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ناڕەزاییە لە پێشوازیی کردنی ئەو کالاَ پێچراوانەی لە دەرەوەی ناوچەکانەوە دێنەناوەوە).(٢٠٧)

چواردە: لەیەك کاتدا گونجاون نیە دوو مامەڵە بە کالاَیەکەوە بکرێت، وەکو ئەوەی بگوترێت ئەم کالاَیەت پێ دەفرۆشم بە کاش بە(١٠٠)دینارو، بە قەرزیش بە (١٥٠)دینار.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ناڕەزاییە لەوەی لە یەك كاتدا دوو مامەڵە بە كاڵایەكەوە بكرێت).(٢٠٨)

برگەی دووەم:

دوو مامەڵە هەن، هی سەردەمی نەزانین، یەكێكیان پێی دەگوترێت: (المنابذة)، كە بریتیە لەوەی هەر یەك لە كڕیارو فرۆشیار بێ ئەوەی ماڵەكە ببینن، ماڵەكانیان بۆ یەكتری هەڵدەدەن، دووەمیشیان پێی دەڵێن(الملامسه)، تەنها بەوەندەی دەستیان بە بەر ماڵەكە بكەوێت، ڕازی دەبوون بە كڕین و فرۆشتنەكە، ئەمەش مامەڵەیەكی چەوت بوو، چونكە نەدەزانرا شێوەو باری ماڵەكان چۆنن، بۆیە لە سەردەمی ئیسلامدا قەدەغە كران.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ناڕازییە بەرانبەر ئەو دوو شێوەیەی مامەڵەكردن، كە یەكێكیان بە(الملامسه) ناسراوەو، تەنها بە دەست لێدانی ماڵەكە مامەڵەكە پێكهاتووە، ئەوەی تریشیان كە بە(المنابذة) ناسراوەو، ماڵەكان بەبێ تەماشاكردن بۆ یەكتری هەڵدراون).(٢٠٨ب)

برگەی سێیەم:

بۆ مامەڵەكردن پێویستە ئەم مەرجانە ئامادەبن:

مەرجی یەكەم: پێویستە كڕیارو فرۆشیار كەسانی ژیرو كامڵ بن، بۆیە مامەڵەی منداڵ و گێل و شێت دروست نیە، هیچ مامەڵەیەكیش پێك نایەت ئەگەر خاوەنە ڕاستەقینەكەی خۆی یان وەكیلەكەی ئامادە نەبێت، بۆیە هەر ماڵێك خاوەندارێتی تەواوی خاوەنەكەی بەسەرەوە نەبێت نافرۆشرێت، هەروەها باڵندەیەك بە ئاسمانەوە، یان ماسییەك لە دەریادا نافرۆشرێت، لەبەرئەوەی خاوەندارێتییەكی تەواوی ئەوكەسە بەسەر باڵندەو ماسییەكەوە نیە، تا بتوانێت ڕادەستی كڕیارەكەیان بكات.

مەرجی دووەم:

پێویستە کڕیارو فرۆشیار هەردووکیان بە قسە ڕەزامەندی لەسەر کڕینو فرۆشتنەکە بدەن، دانی بڕێکی پارەکە وەکو پێشەکی دروستە بۆ پێکهێنانی مامەڵەکە، بەڵام مادام توانای قسەکردنیان هەیە، ئەوا هەردووکیان دەبێت بدوێن، فرۆشیارەکە دەبێت بڵێت: ئەوە ئەوماڵەم بەتۆ فرۆشت بەرانبەر ئەوەندە پارەیە، کڕیارەکەش هەر دەبێت بڵێت: ئەوە من ڕازی بووم بەوەی ئەو ماڵە لەتۆ بکرم بەو پارەیە.

(پێغەمبەر(صلى الله علی وسلم)، فەرموویەتی: کڕینو فرۆشتن بە ڕەزامەندی هەردووکلا پێکدێت).(٢٠٩)

**مەرجی سێیەم:**

ئەگەر مامەڵەیەك پێکهات، کڕیار یان فرۆشیار تەنها لەوماوەیەدا بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە کە لەگەڵ یەکترن، کە جیابوونەوە بواری پەشیمان بوونەوە نامێنێت.

**مەرجی چوارەم:**

گونجاونیە ماڵێك بفرۆشرێت بە نرخێك کاتی پارەدانەکەی دیاری نەکرێت، بۆیە پێویستە پارەکە بەتەواوی لەلایەن کڕیارەوە بدرێتو ماڵەکەش وەرگرێت، بەڵام ئەگەر گڕیارو فرۆشیارەکان جێگەی باوەڕی یەکتر بوون، ئەوا گونجاوە فرۆشیارەکە لەسەر هەندێك یان لە هەموو پارەکەی بووەستێت بۆ کاتێکی دیاریکراو، ئەگەر کڕیارەکەش لەوکاتەدا پارەی بەدەستەوە نەبوو، جێگەی باوەڕی فرۆشیارەکەش نەبوو، ئەوا پەیڕەوی مامەڵەی ماڵی بەبارمتە دانراو دەکەن، بەوەی کڕیارەکە ماڵێکی تری خۆی وەکو خانوویەك، یان باخێك، دەخاتە ئەستۆی کڕیارەکەوە، هەتا لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا پارەکەی دەدات، لەم بارەشدا هیچ داهاتێکی ئەم ماڵە بەبارمتە دانراوە لەو ماوەیەدا نابێت بە هی فرۆشیارەکە، ئەگەر واش ڕێککەوت کڕیارەکە لەماوەی

دیاریكراودا نەیتوانی پارەكە بدات، ئەوا فرۆشیارەكە ئەوماڵە بەبارمتە دانراوە دەفرۆشێتو پارەكەی خۆی هەڵدەگرێتەوەو باقیەكەش دەداتەوە بە كڕیارەكە.

**مەرجی پێنجەم:**

كڕیار هەتا ماڵەكەی وەرنەگرێت، ماڵەكە لە ئەستۆی فرۆشیاردا دەبێت، ئەگەر ماڵەكە تووشی هەر كارەساتێك بێت، ببێتەهۆی تێداچوون یان خراپ بوونی، ئەوا مامەڵەكە هەڵدەوەشێتەوە، هەروەها كڕیار هەتا ماڵەكەی وەرنەگرێت بۆی نیە بە یەكێكی تری بفرۆشێتەوە.

(پێغەمبەر(صلى الله علی وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر كەسێك لە ئێوە خۆراكێكی كڕی، با مامەڵەی پێوەنەكا، هەتا بە تەواوی دەكەوێتە دەستی).(٢١٠)

**بڕگەی چوارەم:**

هەموو مامەڵەیەك لەدوای بانگی نوێژی هەینی قەدەغەیە، هەتا نوێژەكە ئەنجام دەدەرێت، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (٩)

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، كاتێك بۆ نوێژی هەینی بانگدرا، ئەوا بۆ یادكردنەوەی خوا هەوڵ و تێكۆشان بكەن و، كڕین و فرۆشتن لێگەڕێن، ئەوە بۆئێوە باشترە، ئەگەردەزانن (ئەونوێژەی هەینی چەند پیرۆزە)﴾.

## یاسای قازانجی پارەی بەقەرزدراو

## (الربا)

(الربـا)، واتـە: قـەرزێك لـەكاتی دانەوەیـدا، زیادەیـەكی لەگەڵـدابێت، یـان گۆڕینەوەی توخمێك بە هەمان توخم زیادەیەكی لەگەڵدابێت.

**بڕگەی یەكەم:**

وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا.... (٢٧٥ البقرة)

﴿....خوا(قـازانجی) شـت فرۆشـتنی ڕەوا كـردووەو، سـوودی پـارەی بـە قەرزدراویشی قەدەغە كردووە....﴾.

(پێغەمبەر(صلى الله على وسلم)، فەرموویەتی: هەر قەرزێك قازانجێكی پێوەبێت، ئەوە شێوەیەكە لە شێوەكانی ڕیبا).(٢١١)

**بڕگەی دووەم:**

الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ

﴿...ئەوانـەی كـە سـوودی نایاسـایی پـارەی بـە قـەرزدراو دەخۆن(زیادەیـەك وەردەگـرن لـە پـارەی بـە قـەرزدراو)، لـە گۆڕەكانیـان ڕاسـت نابنـەوە، مەگـەر ڕاستبوونەوەكەیان وەكو ڕاستبوونەوەی ئەوانە بێـت كە شـەیتان تێكیـداون و لەئەنجامی دەست وەشاندن لێیان(شێتی كردوون)....﴾.

**بڕگەی سێیەم:**

(سـوودی قـازانجی قـەرز، ئەوەنـدە سـتەمە لـەلای پـەروەردگار، بۆیـە پێغەمبـەر(سڵاوی خوای لێبێت) دەفـەرموێت: (درهـەمێك لـە سوودی قازانجی قـەرز لـەلای خـوا، كاریگـەرترە لـە سـی و شـەش كـاری داوێنپیسـی كـە بـە نـەزانی بكرێت)، هەروەها دەفەرموێت: (سوودی قازانجی قەرز، نـەوەدو نۆ دەروازەی هەیە، ئەوەی هـەرە ژێرەوەیـان وەكـو ئەوەوایـە مرۆڤ بچێتە لای دایكی خۆی).

(٢١٢)

### بڕگەی چوارەم:

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەفرینی خوای لەو کەسە کردووە کە قازانجی پارەی بەقەرزدراو دەخوات‌و، لەو کەسەش کە پارەکە وەردەگرێت‌و، لەو کەسەش کە شاهیدی مامەڵەکەیەو، لەو کەسەش کە دەینووسێت).(٢١٣)

### بڕگەی پێنجەم:

هەر توخمێك بە توخمێکی وەکو خۆی بگۆڕدرێتەوە، ئەگەر بە کێشی خۆی نەبێت‌و دەست بە دەست‌و لەیەك کۆڕو مەجلیسدا نەبێت، دەبێت بە ڕیبا، ئەگەر زێڕ بە زێڕ، یان زیو بە زیو، یان هەموو ئەو خۆراکانەی کە دەخورێن وەکو: جۆ بە جۆ، یان خورما بە خورما، یان خوێ بە خوێ، بگۆڕدرێنەوەو هەر بڕێکی زیادیان لەسەر وەربگیرێت، دەبێت بە ڕیبا، بۆیە دەبێت زێڕەکەی خۆت بفرۆشیت‌و بیکەی بە پارە، ئەوسا بەو پارەیە زێڕێکی تری پێ بکڕیتەوە کە خۆت دەتەوێت.

### بڕگەی شەشەم:

شتێك ناگۆڕدرێتەوە بە دووشت کە یەکێکیان لەتوخمی خۆی بێت، چونکە دەکەوێتە قاڵبی ڕیباوە، بۆنموونە، تەنەکەیەك گەنمە گەورە، ناگۆڕدرێتەوە بە نیو تەنەکە گەنمە وردەو دینارێك، چونکە هەردووك گەنمەکان لە توخمێکن کە بە گەنم ناسراوە، یان کیلۆیەك خورمای خەستاوی، ناگۆڕدرێتەوە بە نیو دینارو کیلۆیەك خورمای زودی، لەبەرئەوەی هەردووکیان هەر خورمان‌و لەیەك ڕەگەزن، گەنمێکیش کە جۆی لەگەڵ تێکەڵ بێت ناگۆڕدرێتەوە بە گەنمێکی تر جۆی لەگەڵ تێکەڵ بێت، مەگەر سەربەسەر، دەنا هەر زیادەیەك دەبێت بەڕیبا. ئاردیش بە گەنم ناگۆڕدرێتەوە لەبەرئەوەی ئاردەکەش هەر توخمی گەنمەکەیە.

### ئاگادارکردنەوە:

(بەپێی یاساکە دەردەکەوێت دانانی پارە لە بانکەکان بە شێوەی(التوفير)، دەکەوێتە بەر یاساکانی ڕیباوە، چونکە پارە دانراوەکە ساڵانە قازانجی

دێتەسەر، لەم بارەدا حسابی(الجاري)ش تێوە دەگلێت، چونکە ڕیباکەرەکە بانکەکەیە، هەموو ئەوانەش کە تێوە دەگلێن لەعنەتی خوایان لەسەرە).

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ڕۆژکارێك بەسەر خەڵکیدا دێت، ئەگەر ماڵی (ڕیبا)ش نەخۆن، ئەوا لە تەپوتۆزەکەیەوە دەگلێن).(٢١٤)

## یاسای سەلەم

سەلەم، واتە: پێدانی پارە وەکو قەرزێك، لەبری وەرگرتنی ماڵێکی ناسراو لە کاتێکی دیاریکراودا، سولفەشی پێ دەگوترێ بە مەبەستی ئەوەی لە پێشەوە پارەکە وەربگیرێت، لەبری بەرهەمێکی ناسراودا کە لە کاتی پێگەیشتنیدا بەرهەمەکە لەبری پارەکە دەدرێتەوە بە قەرزدەرەکە.

### بڕگەی یەکەم:

ئەو مامەڵەیە لە هەموو ئەو کەلوپەل و کاڵایانەدا دەکرێت کە کڕین و فرۆشتنیان پێوەدەکرێت و دەتوانرێت ڕەوشتەکانیان دیاری بکرێن، وەکو: زەیت، دانەوێڵە، جل و بەرگ، بەروبوومی کشتوکاڵ، کەرەستەی بینا، داروتەختە، ئاسن، شووشە...هتد.

### بڕگەی دووەم:

پێویستە پارەدەرو پارەوەرگر بە ئامادەبوونی دوو شاهید لەلای نووسەرێك ئەم پەیمانەی نێوانیان واژۆ بکەن، کە لەنێو پەیماننامەکەدا جۆری ماڵە سەلەم کراوەکەو، کاتی تەسلیم کردنەکەی و، بڕی پارەکە دەخرێنە ڕوو.

### بڕگەی سێیەم:

ئەوشتانەی کە ناتوانرێت جۆرەکانیان بەوردی دابین بکرێن، سەلەمیان تێدا ناکرێت، بۆنموونە پێست، هەیە ئەستورە، هەیە تەنکە، تەنانەت لە پێستێکدا هەندێك بەشەکانی تەنکن و هەندێکیان ئەستوورن، بەڵام لە کاغەزدا گونجاوە، لەبەرئەوەی هەمووی یەك ئەستووری هەیە.

**بڕگەی چوارەم:**

پێویستە بڕی ماڵە سەلەم کراوەکە بە کێش و پێوانە دیاری بکرێت.(٢١٥)

**بڕگەی پێنجەم:**

هەرشتێك بەهۆی ئاگرەوە ببرژێت یان بکوڵێنرێت بە مەرجێك ئەو کوڵان و برژاندنە ببێتەهۆی ئەوەی ئەو توخمە هەندێك لە ڕەوشتەکانی خۆی لەدەست بدات، سەلەمی پێوە ناکرێت.

**بڕگەی شەشەم:**

ماڵی دیاریکراو بۆ سەلەم، بە بارمتە (رهن)وەرناگیرێت.

**بڕگەی حەوتەم:**

ئەو کەسەی سەلەمەکە دەکات دەبێت شایستەی ئەوەبێت لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا ماڵەکە بداتە دەست ئەوکەسەی کە پارەکەی داوە.

**بڕگەی هەشتەم:**

نابێت ئەو ماڵەی دەدرێت لە هەمان ڕەگەزی ئەو ماڵە بێت کە وەردەگیرێتەوە، بۆنموونە: نابێت گەنم بدرێت لەبری ئەوەی کە بەروبوومەکە پێگەیشت گەنمی بۆ بهێنرێتەوە، یان نابێت پارە بدرێت لەبری ئەوەی کە بەروبوومەکە پێگەیشت پارەی بۆ بهێنرێتەوە.

**بڕگەی نۆیەم:**

سەلەم لە ماڵێکی بەردەستدا ناکرێت، وەکو سەیارەیەك یان خانوویەك.

## یاسای قەرز

مَنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ وَلَهُ أَجْرٌ كَرِيمٌ (١١)الحديد

﴿كێیه ئەوكەسەی قەرزێكی چاك دەدات لە ڕێگەی خوادا؟ تا بۆی چەندجارە بكاتەوە، بۆ ئەو كەسەش (لەلایەن پەروەردگارەوە)، پاداشتێكی پیرۆز هەیە﴾.

**بڕگەی یەكەم:**

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: (هەركەسێك ناخۆشیەكی لە ناخۆشیەكانی دنیای لەسەر موسوڵمانێك لابرد، ئەوا خوا لە ناخۆشیەكانی ڕۆژی دوایی ناخۆشیەكی بۆ لادەبات، خواش لە پشتیوانی بەندەدایە مادام بەندە لە پشتیوانی براكەیدا بێت). (٢١٦)

**بڕگەی دووەم:**

ئەوكەسەی قەرزەكەی دەدرێتێ، دەبێت كەسێكی باڵغی عاقڵ بێت، توانای ئەوەی هەبێت قەرزەكە لە كاتی دیاریكراوی خۆیدا بداتەوە.

**بڕگەی سێیەم:**

پێویستە نووسەرێك لەنێوان قەرزدەرو قەرزوەرگردا بە ئامادەبوونی دوو شاهید، هەموو وردو درشتێك لەسەر بڕی قەرزەكەو، ماوەی گەڕانەوەكەی بنووسێت.

وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلاَ يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللّهُ... (٢٨٢ البقرة)

﴿....با نووسەرێكیش بەڕاستی و دروستی ئەوە لە نێوانتاندا بنووسێت و، گوێش نەدات(بە قسەی خەڵكی)، بەوەی بەو شێوەیە بنووسێت وەكو خوا فێری كردووە....﴾.

وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ ..... (٢٨٢ البقرة)

﴿...دوو شاهیدیش دیاری بكەن لە پیاوەكانتان، (بۆ شاهیدی دان لەسەر ڕاستی ئەم نووسراوە لە نێوانتان)...﴾.

**بڕگەی چوارەم:**

دەکرێت قەرزدەرەکە داوای ماڵێکی قەرز وەرگرەکە بکات، یان داوای کەفیلێك بکات، بۆئەوەی وەکو بارمتەیەك وابێت بەدەستیەوە، لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا ماڵەکەی دەسکەوێتەوە.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: (کەفیل بارمتەیەو قەرزەکەش پێویستە بدرێتەوە). (٢١٧)

**بڕگەی پێنجەم:**

قەرزدان هەموو ئەو کەلوپەلانە دەگرێتەوە کە دەتوانرێت مامەڵەیان پێوەبکرێت.

**بڕگەی شەشەم:**

لەو کاتەوە قەرزەکە دەدرێت بە قەرزوەرگرەکە، سەلامەتی ماڵە بە قەرزدراوەکەی دەکەوێتە ئەستۆوە، ئەگەر هاتو ماڵە بە قەرزدراوەکەش، مەڕێك یا چەند سەر مەڕێك بوون، بۆئەوەی قەرز وەرگرەکە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو کەڵك لە شیرەکەیان وەربگرێت، ئەوا هەموو خەرجییەکی ئەو مەڕانە لەسەر قەرزوەرگرەکەیە.

**بڕگەی حەوتەم:**

نابێت قەرزدانەکە ببێتە مایەی دەستکەوتنی دەسکەوتێکی ماددی بۆ خاوەن قەرزەکە، دەنا دەچێتە قاڵبی ڕیباوە.

**بڕگەی هەشتەم:**

بەپێی ئەو ڕێککەوتنە کە لەنێوان قەرزدەرو قەرزوەگردا دەکرێت، گونجاوە قەرزەکە لەشارێك بکرێت و لەشارێکی تر بدرێتەوە، بەمەرجێك هیچ لە بڕەکەی زیادوکەم نەکات و، لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا بێت.

**بڕگەی نۆیەم:**

لەكاتی دانەوەی قەرزەكەدا، ئەوەی قەرزەكەی داوە دەتوانێت لەبری پارەكەی كەلوپەلی مامەڵەكردن لە قەرز وەرگرەكە وەرگرێتەوە.

**بڕگەی دەیەم:**

ئەگەر قەرزدارێك تووشی تەنگەبەری بوو، نەیتوانی لە كاتی دیاریكراوی خۆیدا قەرزەكەی بداتەوەو، خاوەن قەرزەكەش كارئاسانی بۆ بكات، بەوەی ماوەی قەرزەكەی بۆ كاتێكی تر بۆ درێژ بكاتەوە، ئەوا خوا لە دنیاو دواڕۆژدا كارئاسانی بۆ ئەو خاوەن قەرزە دەكات.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: (ئەگە كەسێك كارئاسانی بۆ كەسێك كرد كە لە تەنگەبەریدا بوو، ئەوا خوا لە دنیاو دواڕۆژدا ئاسانكاری بۆ ئەوكەسە دەكات). (٢١٨)

**بڕگەی یازدە:**

ئەگەر قەرزوەرگر لە كاتی دانەوەی قەرزەكەیدا دەستودیاریەكی بۆ قەرزوەرگر هێنا، ئەوە وەكو دیاری مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت و خاوەن قەرزەكە تاوانبار نابێت وەری بگرێت.

## یاسای ماڵی بەبارمتە دانراو

## (الرهن)

**بڕگەی یەكەم:**

وَإِن كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُواْ كَاتِباً فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ....(٢٨٣ البقرة)

﴿ئەگەر لە سەفەریش بوون و نووسەرێكتان دەست نەكەوت نووسراوێك لە نێوانتان بنووسێت، ئەوا(لەم بارەدا پەیڕەوی شێوازی) بارمتەی وەرگیراو بكەن﴾.

واتە ئەگەر لە سەفەردا بوون و نووسەرێكتان دەست نەكەوت مامەڵەكردنەكە بنووسن، ئەوا پەیڕەوی ئەوە بكەن كە كڕیارەكە لەبری پارەی كەلوپەلەكانی، با

شتێك لە سامان و سەروەتەكانی تری بە بارمتە بخاتە ئەستۆی فرۆشیارەكەوە، بۆئەوەی مامەڵەكە پێك بێت و فرۆشیارەكەش سامانەكەی پارێزراو بێت.

**بڕگەی دووەم:**

**(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، بۆ خۆراكی كەس وكارەكەی، قەڵغانێكی خۆی كردە بارمتە لەلای جوولەكەیەك، لەبری(٣٠) ڕبە جۆ).** (٢١٩)

**بڕگەی سێیەم:**

ئەگەر قەرزێك لە نێوان قەرزدەرو قەرز وەرگرو شاهیدەكاندا واژۆی لەسەر كرا، ئەوە قەرزدەرەكە مافی خۆیەتی داوای بارمتەیەك بكات بۆ مسۆگەر كردنی وەرگرتنەوەی قەرزەكەی، چونكە جاری واهەیە واژۆكراوەكە بزر دەبێت، یان شاهیدەكان دەمرن.

**بڕگەی چوارەم:**

هەموو دەسكەوتێك كە بەهۆی ماڵە بارمتە كراوەكەوە دەسكەوێت لە ماوەی بارمتەكردنەكەدا، بۆ خاوەنە بنەڕەتیەكەیەتی، ئەو كەسەی ماڵەكەی بە بارمتە وەرگرتووە، هیچ مافێكی بەسەر داهات و دەسكەوتەكانی ئەم بارمتەیەوە نیە.

**بڕگەی پێنجەم:**

هەر ماڵێك داگیر كرابێت یان دزرابێت، بە بارمتە وەرناگیرێت.

**بڕگەی شەشەم:**

هەر كاتێك قەرزەكە درایەوە لە كاتی دیاریكراوی خۆیدا، ئەوا ماڵە بەبارمتە دانراوەكە لەژێر یاسای بارمتەدانان دێتە دەرەوەو، خاوەنەكەی سەربەست دەبێت لە مامەڵەكردن پێوەی.

**بڕگەی حەوتەم:**

كەسێك ماڵێكی خۆی بە بارمتە دانا لەبری قەرزێك كە وەری گرتووە، ئەگەر پێش هاتنی كاتی دانەوەی قەرزەكە ئەو كەسە مرد، ئەوا ماڵە بە بارمتە كراوەكە لە یاسای بە بارمتەیی دێتە دەرەوە، لەبەرئەوەی بە مردنی كەسەكە

پێش دابەشکردنی میراتەکەی دەبێت قەرزەکانی بدرێنەوە، بەڵام ئەگەر کەسێك قەرزێکی داو لە بەرانبەردا بارمتەیەکی وەرگرت، ئەوا دوای مردنی ئەوکەسە، ماڵەکە هەر بە بارمتەکراوی دەمێنێتەوە تا کاتی دانەوەی قەرزەکە دێت و میراتگرەکان ئەو ئەرکە دەگرنە ئەستۆ.

**بڕگەی هەشتەم:**

ماڵی وەقف کراو ئافرەتی خاوەن منداڵ و سەگ و بەرازو خواردنێك کە زوو خراپ ببێت، ناشێن بە بارمتە دابنرێن لەبری قەرزێك، چونکە مەبەست لە بارمتەکە ئەوەیە ئەگەر قەرزەکە نەدرایەوە ئەوە قەرزدەرەکە ئەو بارمتەیە بفرۆشێت و ماڵەکەی خۆی دەستکەوێتەوە.

**بڕگەی نۆیەم:**

ئەگەر کەسێك کۆیلەیەکی هەبوو کاتی ئازادکردنەکەی پێش دانەوەی قەرزێك بوو لە ئەستۆی خاوەنەکەیدا، ئەوا ئەو کۆیلەیە بە بارمتە دانادرێت.

**بڕگەی دەیەم:**

ئەگەر کەسێك بارمتەیەکی وەرگرت لەبری قەرزێك، ئەوا بۆی نیە لە مامەڵەیەکی تردا ئەو ماڵە بارمتەیە بە بارمتە دانێتەوە لەگەڵ کەسێکی تردا، مەگەر بە ڕەزامەندی خاوەنە بنەڕەتیەکەی.

**بڕگەی یازدە:**

ئەگەر قەرزدەرێك قەرزی لەلای کەسێك بوو، ئەوا ئەو قەرزە وەکو بارمتە دانانرێت لە مامەڵەی نێوان خاوەن قەرزەکەو کەسێکی تردا، هەر ماڵێکیش کە لەبەردەستدا نەبێت بە بارمتە دانانرێت، وەکو باڵندەیەك بەئاسمانەوە یان کۆیلەیەکی هەڵاتوو.

**بڕگەی دوازدە:**

هەر مەرجێك دژ بە یاساکانی ئیسلام بێت بە تاڵە، وەکو ئەوەی کە قەرز وەرگرەکە بڵێت: ئەو ماڵەم کرد بە بارمتە لەلای تۆ بەو مەرجەی، بەهۆی

قەرزەکەوە نەفرۆشریێت، یان بڵێت: ئەو ماڵەم کردە بارمتە هەموو داهاتەکەی بۆ تۆ بێت تا قەرزەکەت دەدەمەوە، چونکە ئەم مەرجانە لە بنەڕەتدا بەتاڵن.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەر مەرجێك ئەگەر لە کتێبەکەی خوای گەورەدا نەبێت، ئەوە بەتاڵە، ئەگەر سەد مەرجیش بن). (٢٢٠)

بڕگەی سێزدە:

ئەگەر هات و بارمتە دانراوەکە کەنیزەیەك بوو، ئەوا نادرێتە دەست قەرزدەرەکە، بەڵکو لەلای دادوەر، یان مێردەکەی، یان لەلای ئافرەتێك دەهێڵرێتەوە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: کەسێك لە ئێوە با بە تەنیا لەگەڵ ئافرەتێدا نەمێنێتەوە کە ئافرەتەکە یەکێك نەبێت لەوانەی کە لێی قەدەغە کراون، چونکە شەیتان سێیەمینە لەنێوان ئەو ژن و پاوەدا)، (٢٢١)

لەوانەیە تووشی کاری خراپیان بکات.

## یاسای مفلیس بوون

مفلیس بوون، واتە: بەدەستەوە نەمانی ماڵ و سامان.

بڕگەی یەکەم:

ئەگەر کەسێك لە ماڵ و سامانەکەی هیچی بەدەستەوە نەماو، قەرزێکی لە ئەستۆدا بوو کاتی دانەوەی نەهاتبوو، ئەوا خاوەن قەرزەکە بۆی نیە داوای قەرزەکەی لێ بکاتەوە.

بڕگەی دووەم:

ئەگەر کەسێك لە ماڵ و سامانەکەی هیچی بەدەستەوە نەماو، قەرزێکی لە ئەستۆدا بوو کاتی دانەوەی نەهاتبوو، ناتوانرێت ڕێگەی سەفەرکردنی لێ بگیرێت.

بڕگەی سێیەم:

ئەگەر كەسێك لە ماڵو سامانەكەی هیچی بەدەستەوە نەماو، قەرزێكی لە ئەستۆدا بوو كاتی دانەوەی نەهاتبوو، ناتوانرێت داوای كەفیلی لێ بكرێت.

### بڕگەی چوارەم:

ئەگەر كەسی موفلیس ماڵێكی بەدەستەوە بوو، قەرزداری خەڵكانی تریش بوو، وای نیشان دەدا ئەو ماڵە هی خەڵكی ترە كاسپی پێوە دەكات، ئەگەر یەكێك لە قەرزدەرەكان داوای ئەوەی كرد لەسەر ڕاستی قسەكانی سوێند بخوات، ئەوا سوێند نادرێت، چونكە خودی سوێنددانەكە بۆ ترساندنیەتی، بۆئەوەی لە قسەكەی پەشیمان بێتەوە، ئەگەر پەشیمانیش بێتەوە، هیچ لە كێشەكە ناگۆڕێت، بۆیە واتایەك نییە بۆ سوێنددانی.

### بڕگەی پێنجەم:

ئەگەر كەسی موفلیس قەرزێكی زۆری بەسەر شانەوە بوو، خاوەن قەرزەكانیش كێشەكەیان دایە دادگا، بۆئەوەی دادگا دەست بەسەر ماڵەكەیدا بگرێتو لەژێر چاودێریدا بیهێڵێتەوە، ئەوا دادوەر سەرنج دەدات، ئەگەر ماڵەكەی بەشی ئەوە بكات كە قەرزەكانی لێ بداتەوە، ئەوە فەرمانی پێدەكات قەرزەكان بداتەوە، ئەگەر دادوەریش زانی ماڵەكە بەشی قەرزەكان ناكات، ئەوە فەرمان دەكات بە دەست بەسەرداگرتنی ماڵەكەو فرۆشتنی، بۆئەوەی قەرزەكانی لێ بداتەوە، یان ماڵەكە بەسەر قەرزدارەكان دابەش بكات.

### بڕگەی شەشەم:

ئەگەر لەلایەن دادوەرەوە دەست بەسەر ماڵەكەیدا گیرا، واباشە موفلیسەكە ئامادە بێت بۆئەوەی خەڵكی ئاگاداری ئیفلاس كردنەكەی بن، جا گونجاوە كەسە موفلیسەكە دوای دەست بەسەرداگرتنی ماڵەكەی، مامەڵەیەك لەگەڵ كەسێكی تردا بكات، یان قەرزێكی لێ وەربگرێت، ئەوا ئەو مامەڵەیە كارناكاتە سەر مافی قەرزدارەكان، چونكە مافی قەرزدەرەكان لە ماڵە دەست بەسەرگیراوەكە دایە.

**بڕگەی حەوتەم:**

ئەگەر کەسێك ماڵێکی خۆی بە تەواوی لای کەسێکی موفلس دۆزیەوە، ئەوە ئەگەر ماڵەکە هیچی لێ نەفرۆشابێت، حەقی خاوەن ماڵەکەیە هەموو ماڵەکەی خۆی بباتەوە، بەڵام ئەگەر پێشتر هەندێکی لە نرخی ماڵەکەی دەستکەوتبۆوە، ئەوە خاوەن ماڵەکەش وەکو قەرزدەرەکاتی تر تەماشا دەکرێت.

**(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك کەلوپەلەکانی خۆی لەلای کەسێکی موفلیس بینیەوە، ئەوا ئەو لە هەمووکەس شایستەترە بە وەرگرتنەوەی ).** (٢٢٢)

**بڕگەی هەشتەم:**

لە کاتی دەست بەسەرداگرتنی ماڵەکەیدا، دادوەر ئەوەندەی بەدەستەوە دەهێڵێتەوە کە خۆیو ماڵو منداڵەکەی پێی بژیەن.

## یاساکانی قەدەغەکردن لەسەر شتێك

## (الحجر)

**بڕگەی یەکەم:**

ئەگەر منداڵێك، یان شێتێك، ماڵو سامانێکی هەبوو، ئەوا لەلایەن دادوەرەوە قەدەغە دەکرێت هەڵسوکەوت بەو ماڵەوە بکرێت، مەگەر بەهۆی باوکی، یان باپیری، یان بەخێوکەرەکەیەوە، ئەگەر بەخێوکەریش نەبوو، ئەوە گەورەی موسوڵمانان ئەو ئەرکە دەگرێتە ئەستۆ، بەڵگەش بۆ ئەمە خوا دەفەرموێت:

وَابْتَلُواْ الْيَتَامَى حَتَّىَ إِذَا بَلَغُواْ النِّكَاحَ فَإِنْ آنَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْداً فَادْفَعُواْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ (٦)النساء

﴿هەتیوەکانیش تاقی بکەنەوە(بەوەی کە گێل ونەزان نین)، هەتا ئەگەر گەیشتنە تەمەنی جووت بوون، جا ئەگەر هاتوو هەستتان پێکردن کە خۆیان ناسیوە، ماڵو سامانەکانیان بدنەوە،...﴾.

**بڕگەی دووەم:**

بەخێوکەری هەتیوەکان، دەتوانن ماڵی هەتیوەکان بخەنە بازرگانیەوە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: کەسێك بەخێوکردنی هەتیوێکی لە ئەستۆ گرت و، هەتیوەکەش ماڵ و سامانی هەبوو، با ئەوکەسە بازرگانی بە ماڵ و سامانەکەوە بکات و، لێ نەگەڕێت زەکاتی ساڵانە وردەوردە کەمی بکاتەوە).(٢٢٣)

**بڕگەی سێیەم:**

ئەو کەسەی چاودێری بەخێوکردنی هەتیوەکان دەکات، دروست نیە بەهۆی ماڵی هەتیوەکانەوە چاکەو پیاوەتی بۆخۆی بکات، وەکو ئەوەی بەندەیەك ئازاد بکات یان دیارییەك بدات، خوا دەفەرموێت:

وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ...(١٥٢ الانعام)

﴿نزیك ماڵی هەتیویش مەکەونەوە(دەستکاری ماڵی هەتیو مەکەن)، هەتا دەگەنە تەمەنی خۆناسین، مەگەر نزیك کەوتنەوەتان بە شێوەیەك بێت کە قازانج بە ماڵی هەتیوەکە بگەیەنێت....﴾.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەو کەسەی چاودێری بەخێوکردنی هەتیوەکان دەکات، پێویستە هەموو هەڵسوکەوتەکانی لە بەرژەوەندیی ماڵی هەتیوەکاندا بێت.

**بڕگەی پێنجەم:**

ئەو کەسەی چاودێری بەخێوکردنی هەتیوەکان دەکات، پێویستە لە بەخێوکردنیاندا زیادەڕەوی نەکات و دەست تەنگیش نەکات.

وَالَّذِينَ إِذَا أَنْفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَامًا (٦٧)....... أُولَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلاماً (٧٥) الفرقان

﴿ئەو خاوەنباوەڕانەی کە لە ماڵ و سامانەکانی خۆشیان بەخشیوەتەوەو زیادەڕەویان نەکردووەو دەست تەنگیشیان نەکردووەو، لەو نێوانەشدا

پێویستیەکانی خۆیان جێبەجێ کردوون،..........ئەوانە بەماڵێکی ناوماڵی گەورەی بەهەشت پاداشتیان دەدرێتەوە بەهۆی ئەوەی کە دانیان بەخۆیاندا گرت و، لەوێشدا هەواڵ پرسین و سەلام کردنیان پێ ڕادەگەیەنرێت﴾

**بڕگەی شەشەم:**

بەخێوکەرەکە دەتوانێت بۆ بژێوی خۆی و هەتیوەکان ماڵەکە تێکەڵ بکات، هەروەکو خوا دەفەرموێت:

....وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْيَتَامَى قُلْ إِصْلاَحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ وَإِنْ تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ وَاللّهُ يَعْلَمُ الْمُفْسِدَ مِنَ الْمُصْلِحِ وَلَوْ شَاء اللّهُ لأعْنَتَكُمْ إِنَّ اللّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٢٢٠)البقرة

﴿...(ئەی محەمەد)، پرسیاریشت لێدەکەن دەربارەی هەتیوەکان، بڵێ: چاکسازی لەگەڵ ئەوان خێروچاکەیەو، ئەگەر لەگەڵیشیان تێکەڵ بن، ئەوا ئەوان برای ئێوەن، خواش کەسی خراپەکار دەناسێ و جیای دەکاتەوە لە کەسی چاکەکارو، ئەگەر خواش ویستی لەسەربا (ڕێگەی ئەم تێکەڵ بوونەی نەدەدا لەگەڵ هەتیوەکان)، تەنگی پێ هەڵدەچنین و شەرمەزاری دەکردن، بەڕاستی خوا خاوەن دەسەڵات و کاردروستە﴾.

**بڕگەی حەوتەم:**

بۆ خواردنی ماڵی هەتیو لەلایەن بەخێوکەرەکەیەوە، ئەوا ئەگەر بەخێوکەرەکە دەوڵەمەندبوو، پێویستە دەست بگرێتەوەو، ئەگەر هەژاریش بوو، با بە ڕێکوپێکی بخوات، هەروەك خوا دەفەرموێت:

وَلاَ تَأْكُلُوهَا إِسْرَافاً وَبِدَاراً أَن يَكْبَرُواْ وَمَن كَانَ غَنِيّاً فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيراً فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ...(٦ النساء)

﴿لە خواردنی ماڵی هەتیوەکانیشدا، زیادەڕەوی و پەلەپەل مەکەن، پێش ئەوەی ئەوان گەورەبن، (ئەوەی کە ماڵی هەتیوی لایە)، ئەگەر دەوڵەمەند بوو، با دەست بکێشێتەوە لە خواردنی ئەو ماڵە، ئەوەی هەژاریش بوو با بە ڕێکوپێکی بخوات....﴾

بڕگەی هەشتەم:

پێویستە بەخێوکەرەکەیان دوای خۆناسینی هەتیوەکان، ماڵەکەیان بۆ بگێڕێتەوەو، دوو شاهیدیشیان لیٚ بگرێت، هەروەکو خوا دەفەرموێت:

....فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ فَأَشْهِدُواْ عَلَيْهِمْ وَكَفَى بِاللّهِ حَسِيباً (٦ النساء)

﴿....جا ئەگەر ماڵەکەتان دانەوە، ئەوا شاهیدیان لیٚ بگرن‌و، خواش بەسە بەوەی کە لێپرسەرەوە بێت(لەم کارەدا)﴾.

## یاساکانی ئاشتکردنەوە

بەو مانایەی ئەگەر دوو کەس کێشەیەکیان هەبوو دەتوانن خۆیان چارەسەری بکەن‌و ڕێککەون، یان کەسی سێیەم بکەوێتە نێوانیان‌و ڕێکیان بخاتەوە.

بڕگەی یەکەم:

ئەگەر کەسێك شتێکی لای یەکێکی تر بوو، یان قەرزێکی لای ئەو کەسە بوو، گونجاوە لەگەڵیدا ڕێك بکەوێت‌و حەقەکەی وەرگرێتەوە، بۆئەوەی دوژمنایەتی دروست نەبێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: موسوڵمانەکان لەسەر مەرجەکانی خۆیانن، ڕێککەوتنیش گونجاوە لە نێوان موسوڵمانەکان).(٢٢٤)

بڕگەی دووەم:

هەموو ڕێککەوتنێك گونجاوە لەنێو موسوڵمانەکاندا، تەنها ئەوانە نەبێت کە شتە حەڵاڵەکانی تێدا حەرام بکرێت، یان حەرامەکانی تێدا حەڵاڵ بکرێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ڕێککەوتن گونجاوە لە نێوان موسوڵمانەکاندا، تەنها ئەو ڕێککەوتنانە نەبێت کە شتە حەڵاڵەکان حەرام بکات‌و، شتە حەرامەکان حەڵاڵ بکات).(٢٢٥)

## ياساكانی حەواڵە

**بڕگەی یەکەم:**

حەواڵە، واتە: گۆڕینی قەرزدەر یان قەرزوەرگر بە کەسێکی تر، هۆکارێکە بۆ ئاسانکردنی وەرگرتنەوەی قەرزەکان، دەکرێت بە دوو بەشەوە:

**بەشی یەکەم:**

حەواڵەی ماف، واتە خاوەن قەرزەکە بگۆڕێت بە کەسێکی تر.

**بەشی دووەم:**

حەواڵەی قەرز: واتە قەرزدارەکە بگۆڕێت بە کەسێکی تر.

**بڕگەی دووەم:**

حەواڵە مامەڵەیەکی سەربەخۆ نیە، بەڵکو ڕێککەوتنێکی پەیوەندیدارە بە قەرزێکەوە کە پێشتر کراوە، لەلایەن قەرزدەرو قەرز وەرگرەوە.

**بڕگەی سێیەم:**

پێویستە هەرسێك لایەنی قەرزدەرو قەرزوەرگرو کەسی سێیەمیش کە قەرزەکە دەگرێتە ئەستۆی خۆی، ئامادەبن و ڕەزامەندبن لەسەر ڕێککەوتنەکە.

**بڕگەی چوارەم:**

حەواڵە بەوەندە پێکدێت کە کەسی سێیەم لە بەرانبەر قەرزدەرو قەرز وەرگرەکەدا، دان بەوەدا بنێت کە قەرزی قەرزدارەکە دەخاتە ئەستۆی خۆیەوە، بە پێچەوانەشەوە دەکرێت کەسی سێیەم ڕەزامەندی بنوێنێت لەسەرئەوەی کە ئەو ببێتە خاوەنی قەرزەکەو قەزدارەکە ماڵەکە بۆ ئەو بگێرێتەوە.

**بڕگەی پێنجەم:**

لە هەموو بارەکاندا پێویستە بڕی قەرزەکەو ماوەی دانەوەکەی دیاری بکرێت لەنێوان هەرسێك لایەنەکەدا.

**بڕگەی شەشەم:** دوای ڕێککەوتن لە نێوان هەرسێك لایەکان، هیچ کەسێك بۆی نییە پەشیمان ببێتەوە.

**بڕگەی حەوتەم:**

**بە مردنی کەسی سێیەم، کە قەرزەکەی خستۆتە ئەستۆی خۆی، ڕێککەوتنەکە بەردەوام دەبێت و قەرزدەرەکە بۆی نییە پەشیمان ببێتەوە، بەڵکو قەرزەکە دەکەوێتە ئەستۆی میراتگرەکانی کەسی سێیەمەوە.**

**بڕگەی هەشتەم:**

**هەرکاتێك قەرزەکە درایەوە، یان قەرزدەرەکە گەردنی کەسی سێیەمی ئازاد کرد، یان ڕێککەوتنێکی تر کرا لەنێوان قەرزدەرو کەسی سێیەمدا، بەوەی کە کەسی چوارەم قەرزەکە لە ئەستۆی خۆی بگرێت، ئەوا کۆتایی بەو ڕێککەوتنەی پێشتر دێت.**

**(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ستەمە بۆ کەسێکی دەوڵەمەند دانەوەی قەرزێك دوابخات، جا ئەگەر حەقی خاوەن قەرزەکەش لەلایەن قەرزدارەکەوە بگوازرێتەوە بۆ ئەستۆی کەسێکی تر کە توانای دانەوەی قەرزەکەی هەبێت، ئەوا دەبێت خاوەن قەرزەکە بەم گواستنەوەیە ڕازی بێت).** (٢٢٦)

## یاسای دابینکردنی مافەکان

## دەستەبەربوون(الضمان)

مەبەست لە دابینکردنی مافەکان: پتەوکردنی پابەندبوونە بۆ نەفەوتانی قەرزەکان.

**برگەی یەکەم:**

بۆ مسوگەرکردنی وەرگرتنەوەی قەرزێك، قەرزدەرەکە بۆی هەیە وەرگرتنەوەی قەرزەکەی دابین بکات، بەوەی داوای بارمتەیەك لە قەرزدارەکە بکات، هەتا کاتی قەرزدانەوەکە دێت.

**برگەی دووەم:**

گونجاوە خاوەن قەرز لە کاتی مامەڵەکەدا بە شێوەیەك زیاتر هەوڵی دابینکردنی قەرزەکەی بدات، وەکو ئەوەی داوا لە قەرزدارەکە بکات، ماڵێکی بارمتەو کەفیلێکیشی بۆ دابین بکات.

**برگەی سێیەم:**

ماڵی ئەمانەت پێویستی بە دابین کردن نیە، بەوەی کەفالەت یان بارمتە لەو کەسە وەربگیرێت کە ماڵەکەی لەلا دادەنرێت.

**برگەی چوارەم:**

لەیەك گرێبەستدا، کەسی وەکیل ناتوانێت ببێت بە کەفیل بۆ دابینکردنی مامەڵەکە.

**برگەی پێنجەم:**

هەموو ماڵێکی بەکرێدراو، دابینکردن و بارمتەی تێدا وەرناگیرێت بۆ سەلامەتی ماڵەکە، بەڵام لەکاتێکدا سەلمێنرا کە کرێچییەکە کەمتەرخەم بووە لە ئاست سەلامەتی ماڵەکەدا، ئەوا چاککردنەوەی کەموکوڕیەکانی دەکەوێتە ئەستۆ.

**برگەی شەشەم:**

بۆ دابینکردنی مافەکان، پێویستە گرێبەستەکان بنووسرێن و شاهیدیان لەسەر وەربگیرێت، بەلاَم لە مامەڵە قەدەغە کراوەکانی وەکو سوودی پارەی بە قەرزدراودا، ئەوە نابێت بە هیچ شێوەیەك ئەنجام بدرێت، لەبەرئەوەی مامەڵەکە لە بنەڕەتدا قەدەغەیە، سزای نووسەرو شاهیدەکانیش وەکو سزای قەرزدەرو قەرز وەرگرەکە وەهایە.

**بڕگەی حەوتەم:**

جێبەجێ کردنی هەر سزایەکی شەرعی بەسەر کەسێکدا، ئەگەر زیادەڕەوی تێدا نەکرێت، پاراستنی هیچ مافێك بۆ سزادراوەکە دابین ناکات.

## یاسای ماڵی شەراکەت

**بڕگەی یەکەم:**

دوو کەس یان چەند کەسێك، دەتوانن هاوبەش بن لە پێکهێنانی سامان و سەروەتێك، بە مەبەستی بازرگانی و مامەڵەکردن، لە هەموو زەرەرو قازانجێك شەریکن، بەپێی ڕێژەی بەشداریکردنی ماڵ و سامانەکانیان.

**بڕگەی دووەم:**

دەتوانرێت دووکەس ببن بە شەریك، یەکێکیان بە پارەو، ئەوەی تریان بە ڕاپەڕاندنی ئیش و کارەکان، دیاریکردنی ڕێژەی شەراکەتەکەش بە ڕێککەوتنی هەردووك لایان دەبێت، بۆ کاتێکی دیاریکراو.

**بڕگەی سێیەم:**

هەر یەکێك لە شەریکەکان مافی ئەوەی هەیە بەپێی بڕی بەشداریکردنەکەی سەرپەرشتی کاروبارەکان بکات.

**بڕگەی چوارەم:**

دەتوانرێـــت كەســـێكی دەرەوەی شـــەراكەتەكە ڕاپەڕانـــدنی كارەكـــانی پـــێ بسـپێردرێت و وەكیلـی هـەموویان بێـت، بـە موچـە، یـان بـە بـەش، بـەپێی ڕەزامەندی شەریكەكان.

**بڕگەی پێنجەم:**

ماڵی شەریك لەلای شەریكەكان، وەكو ماڵی ئەمانەت وەهایە لە ئەستۆیاندا.

**بڕگەی شەشەم:**

هـەركاتێك مـاڵێكی هاوبـەش، لـەلای یـەكێك لـە شـەریكەكان، تووشـی فـەوتان و تێداچوون بوو، بەهۆی كارەساتەكانی وەكو ئاگرو لافاوو دزی كردنـەوە، ئـەوا شـەریكەكانی تـر مـافی ئـەوەیان نیـە داوای بەشـەكانی خۆیـان لـەو شـەریكە بكەنەوە كە ماڵەكەی لابووە، بەڵام بۆیـان هەیـە سوێندی بدەن كـە كەمتەرخـەم نەبووە لە پارێزگاریكردنی ماڵە هاوبەشەكەدا.

**بڕگەی حەوتەم:**

ماڵی شەراكەت هەموو بەسەریەكەوە زەكاتی لێ دەردەكرێت.

**بڕگەی هەشتەم:**

هەموو شەراكەتێك بە مردنی یەكێك لە شەریكەكان هەڵدەوەشێتەوە، مەگەر ئەو شـەریكە مـردووە خـۆی وەسـیەتی كردبێـت، دوای مردنیشـی میراتگرەكـان بەردەوام بن لە شەراكەتەكە.

**بڕگەی نۆیەم:**

لـە مـاڵێكی هاوبەشـدا كـە بـەش نـەكرێت، وەكـو سـەیارەیەك، یـان خانوویـەك، ئەگـەر یـەكێك لـە شـەریكەكان بەشـەكەی خـۆی بفرۆشـێت، ئـەوا شـەریكەكانی خۆی خاوەن مافترن كە بە هەموویان ئەو بەشە بكڕنەوە، جا ئەو ماڵـە هاوبەشـە مـیرات بێـت لـەنێو میراتگرەكانـدا، یـان مـاڵێكی هاوبـەش بێـت لـەنێوان چـەند كەسێكدا.

**بڕگەی دەیەم:**

دەکرێت شەراکەت لەگەل ئەو بازرگانە جوولەکەو مەسیحیانەدا بکرێت کە لەژێر سێبەری ئیسلامدان، بەڵام هەرگیز شەراکەت لەگەڵ بێباوەڕدا ناکرێت.

**بڕگەی یازدە:**

لەلایەن نووسەرێکەوە ناوەڕۆکی شەراکەتەکە دەنووسرێت، شەریکەکان و دوو شاهید و دادەوری ئەو شوێنە واژۆی لەسەر دەکەن، ئەوە زیاتر بۆ سەلامەتی شەراکەتەکەیە، دەنا تەنها بە ڕەزامەندی هەردووك شەریکەکان شەرکەتەکەیان پێکدێت و دروست دەبێت.

**بڕگەی دوازدە:**

ئەگەر یەکێك لە شەریکەکان خیانەتی لە ماڵە هاوبەشەکە کرد، ئەوا: خوا پشتیوانی خۆی لەو مامەڵەیە دەکێشێتەوە.

**پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: خوای گەورە دەفەرموێت: لە نێوان دوو شەریکدا، من سێیەمیانم، تا ئەو کاتەی یەکێکیان خیانەت لەوەی تریان دەکات، جا کە خیانەتی لێکرد، ئەوا من لەنێوانیان دەردەچم).**(٢٢٧)

**بڕگەی سێزدە:**

مەرجە، پارەی هەردووك شەریکەکە یەك پارە بێت، ناگونجێت بەشی یەکێکیان تمەن بێت و، بەشی ئەوەی تریشیان دینار بێت.

**بڕگەی چواردە:**

هەموو شەراکەتێکی دەسکەوتی ماندووبوونی جەستەیی، لەنێوان دووکەسدا قەدەغەیە، هەر یەکە حەقی ماندووبوونی خۆی بۆ خۆیەتی.

**(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەر مەرجێك ئەگەر لە کتێبەکەی خوای گەورەدا نەبێت ئەوە بەتاڵە).**(٢٢٨)

## یاساکانی وەکالەت

**بڕگەی یەکەم:**

گونجاوە کەسێك یەکێکی تر بکات بە وەکیلی خۆی، بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی.

**بڕگەی دووەم:**

گونجاوە وەکیل هەبێت لە هەموو گرێبەستەکانی وەکو: ( ڕەهن، حەواڵە، ضمان، کەفالەت، شەراکەت، وەکالەت، ودیعە، اعارە، مضاربة، جعالە، مساقات، اجارە، القرض، الهبە، الوقف، الصدقە).

**بڕگەی سێیەم:**

وەکیل دەتوانێت لەجیاتی خاوەنەکەی گرێبەستی ژن و مێردایەتی واژۆ بکات.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): لە مارەکردنی ئوم حەبیبەدا، عمروی کوڕی ئومەیەی ئەلزەمەری کرد بە وەکیلی خۆی).(٢٢٩)

**بڕگەی چوارەم:**

هەموو کەسێك دەتوانێت وەکیلی هەبێت بۆ: تەلاقدان، یان بۆ ئازادکردنی کۆیلەیەك، یان لێك جیابوونەوەی ژن و مێرد بە ڕەزامەندی هەردووکیان، بەلاَم لە کێشەی سوێندخواردن لەسەر جووت نەبوون لەگەڵ ژنەکەی، یان لە کێشەی ئەوەی کە مرۆڤ بە ژنەکەی بڵێت تۆ وەکو پشتی دایکم وەهایت بۆمن، یان لە کێشەی یەکتر بە لەعنەت کردن لە نێوان ژن و مێردا، ناتوانێت وەکیلی هەبێت.

**بڕگەی پێنجەم:**

ئافرەت نابێت بە وەکیلی ئافرەتێکی تر بە مەبەستی مارەکردنی، بەلاَم دەکرێت ئافرەتێك ببێتە وەکیلی پیاوێك یان ژنێك بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی تری، جگە لە مارەکردن.

**بڕگەی شەشەم:**

منداڵ و شێت، نابن بە وەکیلی خەڵکانی تر.

**بڕگەی حەوتەم:**

دەبێت كردنە وەكیل بە ڕەزامەندی هەردووك لابێت و، بە قسە هەردووك لایان ڕەزامەندی خۆیان دەربڕن، بەوەی كە كەسەكە بڵێت: ئەوە تۆم كرد بە وەكیلی خۆم، ئەویش یەكسەر ڕەزامەندی لەسەر دەربڕێت.

برگەی هەشتەم:

وەكیل هەرگیز نابێتە جێگرەوەی كەسەكە لە هەموو وردو درشتێكی ژیانیدا، بەڵام دەكرێت بگوترێت: ئەوە تۆم كرد بە وەكیلی خۆم بۆ كڕین و فرۆشتنی ماڵ و سامانەكەم، یان بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەكانم.

برگەی نۆیەم:

وەكیل و ئەو كەسەش كە وەكیلەكەی بۆخۆی داناوە، كەی ویستیان دەتوانن گرێبەستەكەی نێوانیان كۆتایی پێبێنن.

## یاساكانی ماڵێكی جێهێشتراو

## (الودیعە)

إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا.... (٥٨)النساء

﴿بەڕاستی خوا فەرمانتان پێ دەكات ئەو ماڵانەی بەهۆی دەست پاكیتانەوە لەلاتان دانراون(ئەو ئەمانەتانە)، بیانگەڕێننەوە بۆ خاوەنەكانیان،....﴾.

الودیعە، واتە: ئەو ماڵەی لای كەسێكی تر وەكو ئەمانەت جێهێڵراوە، بۆئەوەی بیپارێزێت.

برگەی یەكەم:

واچاكە كەسێك كە توانای هەبێت بیپارێزێت، ئەو ماڵە لای خۆی بهێڵێتەوە، بەڵام ئەگەر زانی ناتوانێت بیپارێزێت و تێیدا تووشی خیانەت دەبێت، ئەوە واچاكە نەیگێڕێتەوە.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: (هەركەسێك ناخۆشییەكی لە ناخۆشیەكانی دنیای لەسەر موسوڵمانێك لابرد، ئەوا خوا لە ناخۆشیەكانی

ڕۆژی دوایی ناخۆشیەکی بۆ لادەبات، خواش لە پشتیوانی بەندەدایە مادام بەندە لە پشتیوانی براکەیدا بێت). (٢٣٠)

بڕگەی دووەم:

کەسێك ماڵێك لای یەکێکی تر جێهێڵێت، بۆئەوەی بۆی بپارێزرێت، دەبێت دەسەلاّتداریەکی تەواوی بەسەر ماڵەکەوە هەبێت، بۆیە منداڵێك یان گێلێك، ئەگەر ویستی ماڵێك جێهێڵێت، ئەوا لێی قبوولّ ناکرێت.

بڕگەی سێیەم:

گرێبەستی (الودیعە)، وەکو گرێبەستی وەکالەت وەهایە، چونکە ئەوەی ماڵەکەی لەلا دادەنرێت وەکو وەکیلێك وایە.

بڕگەی چوارەم:

ئەو ماڵەی جیّ دەهێڵرێت، هیچ بارمتەیەکی نیە، وەکو ئەمانەت وایە، ئەگەر بەبیّ کەموکوڕی لای ئەوکەسە فەوتا، ئەوا هیچ ناکەوێتە ئەستۆی ئەوکەسە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): فەرموویەتی: کەسێك ماڵێکی خۆی لای کەسێکی تر دانا، ئەوە هیچ پارمتەیەکی لەبری وەرناگرێت). (٢٣١)

بڕگەی پێنجەم:

مادام وەدیعە وەکو ماڵێکی ئەمانەت وایە، کەواتە پێویستە ئەوکەسەی کە ماڵەکەی لەلا دادەنرێت وەکو ماڵی خۆی بیپارێزێت.

بڕگەی شەشەم:

ئەوکەسەی کە ماڵەکەی لایە، ئەگەر ویستی سەفەر بکات، پێویستە ماڵەکە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەگەر نەشتوانرا، دەکرێت ماڵەکە لەلای دادوەر دانێت، بۆئەوەی بیداتەوە بە خاوەنەکەی، یان تا لە گەشتەکەی دێتەوە.

بڕگەی حەوتەم:

ئەگەر کەسێك ماڵێك لای کەسێکی تر دانێت، ئەویش بەبیّ پرسی خاوەنەکەی بردی لەلای کەسێکی تر داینا، ئەوا ئەو ماڵە دەکەوێتە ئەستۆی ئەوکەسەوە کە

یەکەمجار ماڵەکەی لادانراوە، چونکە ئەو بەبێ پرسی خاوەن ماڵەکە ئەوەی کردووە.

**بڕگەی هەشتەم:**

ئەگەر ماڵە دانراوەکە پارەی وردە بوو، ئەو کەسەی کە ماڵەکەی لایە لەگەڵ پارەکانی خۆی تێکەڵی کردن، ئەوا لەو ڕۆژەوە کە تێکەڵی دەکات، ئەوماڵە دەکەوێتە ئەستۆیەوە، ئەگەر تووشی تێداچوونێك هات، دەبێت حەقەکە بۆ خاوەنەکەی بگێڕێتەوە.

**بڕگەی نۆیەم:**

ئەگەر هاتو ماڵە جێهێڵراوەکە مانگایەك بوو، بەهۆی ئەوەی کە ئاوو ئالیکی نەدرێتێ و بمرێت، ئەوا حەقەکەی لەوکەسە وەردەگیرێتەوە کە ماڵەکەی لایە، چونکە کەموکوڕی هەبووە لە بەخێوکردنی مانگاکەدا.

**بڕگەی دەیەم:**

ئەگەر خاوەن ماڵەکە داوای ماڵەکەی کردەوە، ئەوەی کە ماڵەکەشی لایە دوایخست، ئەوا حەقی ماڵەکە دەکەوێتە ئەستۆی ئەوکەسەوە کە ماڵەکەی لادنراوە.

**بڕگەی یازدە:**

ئەگەر خاوەن ماڵەکە داوای ماڵەکەی کردەوەو، ئەو کەسەش کە ماڵەکەی لەلا دانراوە ئینکاری ئەوەی کرد ماڵی ئەوی لابێت، ئەوا لەم بارەدا شاهیدیدان و ڕوونکردنەوە لە حەقی خاوەن ماڵەکەن، سوێندخواردنیش حەقێکە بەسەر ئەو کەسەدا سەپێنراوە کە ماڵەکەی لەلا دانراوە.

**بڕگەی دوازدە:**

ئەگەر کەسێك ماڵی کەسێکی تری لەلا دانراو، ستەمکارێکارێك هات ویستی ئەوماڵەی لێ بستێنێت، ئەوا ئەوکەسە بۆ پاراستنی ماڵەکە ئەگەر سوێندیش بخوات بەوەی ماڵی کەسی لا نیە، سوێندی لێ ناکەوێت.

## یاساکانی ماڵی خوازراوە

**بڕگەی یەکەم:**

ماڵێك لە كەسێك دەخوازرێتەوە کە دەسەڵاتێکی تەواوی بەسەر ئەوماڵەوە هەبێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم):(ئەسپێکی لە ئەبی تەڵحە خوازتەوەو سواری بوو)(٢٣٢)

**بڕگەی دووەم:**

هەر ماڵێك لە ژیانی ڕۆژانەدا بەکاربهێنرێت، دەتوانرێت بخوازرێتەوە، وەکو: خانوو، جلو بەرگ، ئاژەڵ، سەیارە، کتێب، بە مەبەستی جێبەجێ کردنی ئەرکەکەو گەڕاندنەوە بەبێ کەموکوڕی.

**بڕگەی سێیەم:**

هەر کەسێك ماڵێکی خوازتەوە، ئەوە ماڵەکەی دەکەوێتە ئەستۆوە، پێویستە بە سەلامەتی بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەگەر کەسێك سەیارەیەکی لە کەسێك خوازتەوەو لەڕێگا سەیارەکە سوتا، ئەوا پێویستە سەیارەیەکی وەکو سەیارە سوتاوەکە بکڕێتەوە.

(سەفوان گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، چەند قەڵغانێکی لێ خوازتۆتەوە بۆ شەڕی حونەین، ئەویش گوتویەتی: ئایا بردنی قەڵغانەکان داگیر کردنیانە؟ پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی، نەخێر داگیرکردن نیە، بەڵکو خوازتنەوەیەکی دابین کراوە). (٢٣٣)

**بڕگەی چوارەم:**

ماڵی خوازراوە بۆ ئەوەیە کارێکی ژیانی خۆتی پێ جێبەجێ بکەیت، نەك بۆ مامەڵەکردن بەکاری بێنیت.

**بڕگەی پێنجەم:**

هیچ حەقە کرێیەك نادرێت لەبری خوازتنەوەی ماڵێکدا، مەگەر ماڵەکە لەوانە نەبێت بۆ خوازتنەوە بشێت.

## یاسای ماڵی دۆزراوە

واتای ماڵێك دەگەیەنێت كە بەدوایدا نەگەڕێت و بە ڕێكەوت بیدۆزیتەوە.

**بڕگەی یەكەم:**

ئەگەر كەسێك شتێكی دۆزییەوە نابێت وازی لێبێنێت و لەشوێنی خۆی جیهێڵێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: ڕێزگرتن لە ماڵ وسامانی خاوەنباوەڕ، وەكو ڕێزگرتنە لە خوێنەكەی). (٢٣٤)

**بڕگەی دووەم:**

ئەو كەسەی كە دەیدۆزێتەوە، دەبێت بە تەواوی تەماشای بكات و بزانێت چیەو چۆنەو نیشانەكانی دەستنیشان بكات، بۆئەوەی كە خاوەنەكەی پەیدا بوو، بەو نیشانانە بناسرێتەوەو ماڵەكەی بدرێتەوە.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەوكەسەی شتەكەی دۆزیوەتەوە، واباشە كەسێكی دادپەروەر بەشاهید بگرێت دەربارەی شتە دۆزراوەكە، بەڵام نهێنیەكانی شتە دوزراوەكەش ئاشكرا نەكات.

**بڕگەی چوارەم:**

هەتا ماوەی ساڵێك، دەبێت لەنێو خەڵكیدا باسی دۆزینەوەی ئەوشتە بكرێت، بەتایبەتی ئەو شوێنەی لێی دۆزراوەتەوەو شوێنە قەرەباڵغەكانی وەكو بازاڕو بەردەركی مزگەوتەكان، بۆئەوەی ئەو كەسەی شتەكەی لێ بزربووە بێت نیشانەكان هەڵدات، ئەگەر ماڵەكە هی ئەو بوو، بە شایەدی دوو شایەد دەیدرێتەوە.

**بڕگەی پێنجەم:**

ئەگەر دوای ساڵێك خاوەنی پەیدا نەبوو، ئەوا ئەوكەسەی كە دۆزیویەتیەوە تێكەڵ بە ماڵەكەی خۆی دەكات، بە مەرجێك نیازی ئەوەی هەبێت هەركاتێك خاوەنەكەی پەیدابوو، بیداتەوە.

## یاسای منداڵی فڕێدراو

### بڕگەی یەکەم:

هەڵگرتنەوەی منداڵێکی فڕێدراو ئەرکێکی مرۆییە، بۆیە نابێت گوێی پێ نەدرێت.

### بڕگەی دووەم:

ئەگەر پێداویستیەك یان پارەیەك یان جلو بەرگێك لە نزیك ئەو منداڵە دانرابێت، ئەوە هی ئەوە.

### بڕگەی سێیەم:

منداڵی ساوای تازە لە دایك بوو بە مووسوڵمان دادەنرێت، چونکە لە بنەما مرۆییەکاندا بە زگماك موسوڵمانە، پەروەردە خێزانیەکەشی دەستنیشانی ئەوە دەکات دەبێت بە کافر یان بە موسوڵمان، بۆیە هەر منداڵێکی ساوای فڕێدراو وەکو موسڵمانێك مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

### بڕگەی چوارەم:

گەورەی موسوڵمانان بژێوی بەخێوکردنی کۆرپەی فڕێدراو دەگرێتە ئەستۆ.

### بڕگەی پێنجەم:

مەرج نیە هەموو ساوایەکی فڕێدراو بەهۆی داوێن پیسیەوە لەدایك بووبێت، لەوانەیە لەبەر هەژاری فڕێدرابێت، بۆیە ئەو کۆرپەیە وەکو مرۆڤێك، هیچ تاوانێکی نیە لەو هەلانەی کە کراون، هەروەکو خوا دەفەرموێت:

وَلا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى......(١٨ فاطر)

﴿هیچ کەسێکیش تاوانی کەسێکی تری ناکەوێتە ئەستۆ،....﴾.

## یاساکانی قۆرغ کردن

## (الغصب)

واتە: دەست بەسەرداگرتنی ماڵی کەسێکی تر.

**بڕگەی یەکەم:**

هەر ماڵێك هی کەسێکی تر بێت، یان ماڵی گشتی بێت، داگیر کرابێت لەلایەن کەسێکەوە، ئەوماڵە لەو کەسە حەرامە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەر کەسێك ماڵی برایەکی خۆی بەبێ ڕەزامەندی براکەی ببات، ئەوە ئەو ماڵەی بۆ حەڵاڵ نیە).(٢٣٥)

لەم فەرموودەیەی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) زۆر وردەکاری یاساکە ئاشکرا دەبن، واتە: لە هەموو بارەکاندا خاوەندارێتی شتومەك و سەرمایەکان مافی خاوەنەکانیانن، بە هیچ شێوەیەك نابێت ئەو مافانەیان لێ داگیر بکرێت.

**بڕگەی دووەم:**

نە بە گاڵتەو نە بە ڕاستی، دەست بەسەر هیچ ماڵێك یان کەلوپەلێکی خەڵکیدا ناگیرێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: کەس لەئێوە بە ڕاست یان بە گاڵتە کەلوپەلێکی براکەی نەبات، جا ئەگەر یەکێکتان گۆچانی براکەی بردووە، با بۆی بەرێتەوە).(٢٣٦)

**بڕگەی سێیەم:**

ئەگەر کەسێك شتێکی کەسێکی تری داگیر کرد، ئەوە ئەو شتەی دەکەوێتە ئەستۆوە، دەبێت بیپارێزێت.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەگەر ماڵە دەست بەسەرداگیراوەکە دەکرا بەهۆی بە کرێدانیەوە داهاتێکی پێوەبایە بۆ خاوەنەکەی، ئەوا ئەو داهاتە پێویست دەبێت لەسەر داگیرکەری ماڵەکە.

**بڕگەی پێنجەم:**

ئەگەر هاتو ماڵە داگیرکراوەکە لای داگیرکەرەکە فەوتا، دەبێت یان دانەیەکی وەکو خۆی بۆ بکڕێتەوە، یان نرخەکەی دیاری دەکرێتو لەجیاتیان پارەی دەدرێتیٚ، بە مەرجێك پارەکە دەبێت پارەی ئەو وڵاتە بێت کە شتەکەی تێدا لەناوچووە.

**بڕگەی شەشەم:**

ئەگەر ماڵە داگیرکراوە فەوتاوەکە، گەنمو جۆو دانەوێڵە بوو، ئەوا دەکرێت گەنمو جۆو دانەوێڵە لە جیاتی ماڵە فەوتاوەکە بکڕدرێتەوەو بدرێنەوە بە خاوەنەکەی.

**بڕگەی حەوتەم:**

ئەگەر کەسێك شتێکی کەسێکی تری زەوت کردو، پاشان بەهۆی ئەوشتەوە تووشی ڕووداوێکی کوشتن بوو، ئەوە هەموو تاوانەکان دەکەونە ئەستۆی ئەو کەسەوە کە دەستی بەسەر شتەکەدا گرتووە.

**بڕگەی هەشتەم:**

لە مامەڵەی بە کرێداندا، دوای تەواوبوونی ماوەی گرێبەستی نێوان کرێچیو خاوەن موڵك، ئەگەر ویستەکانی خاوەن موڵکەکە جێبەجیٚ نەکرێت، ئەوا موڵکەکە دەکەوێتە قاڵبی ماڵی داگیرکراو، کرێچییەکەش دەبێت بە داگیرکەر.

**بڕگەی نۆیەم:**

هەر زیادەیەك بەسەر ماڵە سەپێنراوەکەدا بێت، بۆ خاوەنە بنەڕەتیەکەیەتی، وەکو ئەوەی مانگایەکی داگیرکراو بزێتو گوێلکێك بێنێت، جا ئەو گوێلكو مانگایە هەردووکیان هی خاوەنە بنەڕەتیەکەنی، ئەگەر شتێکیشیان لێبێت، ئەوا مانگاو گوێلکەکە دەکەونە ئەستۆی داگیرکرەکەوەو دەبیٚ بیانبژێرێت.

**بڕگەی دەیەم:**

ئەگەر کەسێك کۆمەڵە هێلکەیەکی لە کەسێکی تر داگیر کرد، پاش ماوەیەك هێلکەکان بوون بە جوجکە، ئەوە تەنها هێلکەکان لە ئەستۆی داگیرکەرەکەدان، بوونە جوجکەش، واتە: گۆڕانێك ڕوویداوە لە ماڵە دەست بەسەردا گیراوەکەدا، کە ئەم گۆڕانە دەبێتەهۆی ئەوەی خاوەنی هێلکەکان، تەنها مافی هێلکەکانی هەبێت، نەك ئەو گۆڕانکاریەی کە بەسەریاندا هاتووە.

**بڕگەی یازدە:**

ئەگەر کەسێك زەویەکی داگیر کردبوو، بەبێ پرسی خاوەنەکە دارودرەخت و خانووبەرەی تێدا دروستکرد، خاوەنە سەرەکیەکەش بەم کارە ڕازی نەبوو، ئەوا دەبێت ئەو زیادەکاریانە هەموو لابات، بەبێ ڕەزامەندی خاوەن موڵکەکەش، ناتوانێت بیرێکی ئاویش هەڵکەنێت.

**بڕگەی دوازدە:**

ئەگەر شتێك داگیرکرا، نرخەکەی بایی سەد دینار بوو، دوای ئەوەی کە ماڵەکە دەگەڕێنرێتەوە بۆ خاوەنەکەی نرخی شتەکە ببوو بە پێنج هەزار دینار، ئەوە ئەم جیاوازیە ناکەوێتە ئەستۆی داگیرکەرەکە، چونکە ئەو ماڵە داگیرکراوەکەی وەکو خۆی گێڕاوەتەوە.

## یاسای (شفعە)

## فرۆشتنی بەشی شەریکێك لەموڵکێکدا کەبەش نەکرێت لەبەرژەوەندیی شەریکەکەی تردا

**بڕگەی یەکەم:**

هەموو شتێکی هاوبەش لەنێوان دووکەسدا کە دابەش نەکرێت، ئەگەر یەکێکیان ویستی بەشەکەی خۆی بفرۆشێت، ئەوە مافی ئەوەی تریانە لەپێش هەموو کەسێکەوە بیکڕێت، چونکە بە فرۆشتنی بەشێکیان بەشەکەی تریان زەرەرمەند دەبێت، وەکو دیواری هاوبەشی نێوان دوو خانوو، یان خودی خانووەکە.

**بڕگەی دووەم:**

ئـەم یاسـایە تـەنها زەوی و خانووبـەرە دەگرێتـەوە، ئـەو ماڵانـە ناگرێتـەوە کـە دەگوازرێنەوە.

(پێغەمبـەر(صـلى الله علیـه وسـلم) فەرموویـەتی: فرۆشـتنی بەشـی شـەریکێك لـە موڵکێکدا کە بەش نەکرێت، تەنها لەموڵك، یا دارو دیواری هاوبەش دایە).(٢٣٧)

**بڕگەی سێیەم:**

ئەگـەر زەویـەك دارودرەختـی تێـدابوو، ئـەوە لەگـەڵ فرۆشـتنی بەشـێکیدا، دارو درەختەکانیش دەکەونە ناو یاساکەوە.

ئەگەر خانوویەك دوونهۆم بوو، قاتی ژێـرەوەی بە بانەکەیـەوە بـۆ کەسـێك بـوو، قاتی سەرەوەشـی بـۆ چەند کەسێك بـوو، یـەکێك لەوانـەی سـەرەوە بەشـەکەی خۆی فرۆشت، ئەوا ئـەو بەشـە فرۆشـراوە ناکەوێتەبەر دەسـەڵاتی ئـەم یاسـایە، خاوەنی قاتی ژێـرەوە ناتوانێـت دەسـەڵاتی ئـەم یاسـایە بـەکاربێنێت بـۆ کڕینـی ئەو بەشەی کە لە قاتی سەرەوە دەفرۆشرێت، چونکە قاتی سـەرەوە بینایـەکی سەربەخۆیە.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەم یاسایە تەنها ئەو شـەریکانە دەگرێتـەوە کە هاوبەشـن لـە موڵکێکدا دابەش نـەکرێت، جـیران و ئـەو موڵکـەی کـە دەکرێـت بـەش بکرێـت، ئـەم یاسـایە نایانگرێتەوە.

## یاسای پارەدان بەکەسێك بەمەبەستی کاسپی کردن

**بڕگە یەکەم:**

کەسێکی خاوەن ماڵو سامان، دەتوانێت پارە بداتە کەسێکی تر کە جێگەی متمانەی بێت، بۆئەوەی کاسپی پێوە بکات.

**بڕگەی دووەم:**

ئەوپارەیە بۆئەوە دەدرێت کاسپی پێوە بکرێت، پێویستە لەم مامەڵەکردنەدا، دوو شاهید ئامادەبن و، نووسەرێکیش لەنێوانیاندا گرێبەستەکە بنووسێت، چونکە دەکەوێتە قاڵبی مامەڵەکردنەوە.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەو بڕە پارەیەی کە دیاری دەکرێت بۆ ئەم مەبەستە، دەبێت پارەیەکی ناسراو بێت و، ڕێژەکەی دیاریکراو بێت.

**بڕگەی چوارەم:**

دەبێت لەنێوانیان ڕێژەی قازانج و زەرەر دیاری بکرێت، بۆنموونە: هەردووکیان ڕێك دەکەون لەسەرئەوەی لە قازانج و زەرەردا شەریکن، بەو ڕێژەیەی کە لەسەری ڕێککەوتوون، جا ئەگەر وا هاتەپێش قازانجیان کرد، ئەوا قازانجەکە بەپێی ڕێژەکە بەش دەکرێت، ئەگەر زەرەریشیان کرد، ئەوا هەریەکەیان بەپێی ڕێژەکە زەرەرەکەی بەردەکەوێت.

**بڕگەی پێنجەم:**

لە حاڵەتێکدا ئەگەر خاوەن پارەکە، ڕازی بوو بەوەی قازانجی هەموو پارەکە بۆ کاسپی کەرەکە بێت، ئەوا ئەو مامەڵەیە لەسنووری ئەم یاسایە دەچێتە دەرەوەو، بە مامەڵەیەکی بەتاڵ دادەندرێت و، دەبێت خاوەن پارەکە تەواوی پارەکەی وەرگرێتەوە، دەکرێت پاشان خاوەن پارەکە بە گرێبەستێکی نوێ، بەپێی یاسای قەرز، بڕە پارەکە بدات بە کاسپی کەرەکە بۆ کاتێکی دیاریکراو.

**بڕگەی شەشەم:**

دەكرێت خاوەن پارەو كەسە كاسبەكە، لەسەر ئەوە ڕێك بكەون كە بەو پارەیە ئامێرێك بكڕن، كەسە كاسب كەرەكە ئیشی پێ بكات و، بە ڕەزامەندی هەردووكلا مانگانەیەكیشی بۆ دیاری بكرێت، بۆ گوزەرانی ژیانی و ئیش بەو ئامێرەوە بكات، هەموو داهاتەكەی بداتە دەست خاوەن پارەكە هەتا نرخەكەی تەواو پڕ دەبێتەوەو، خاوەن پارەكە تەواوی پارەكەی خۆی دەست دەكەوێتەوە، ئەوسا كاسب كارەكە ببێت بە خاوەن بەشێك لەو ئامێرەدا، بەپێی ئەو ڕێككەوتنەی كە لە سەرەتای كارەكەدا هەردووكلایان لەسەری ڕێك دەكەون.

**بڕگەی حەوتەم:**

ئەو كەسەی پارەكە وەردەگرێت، ناتوانێت پارەكە بدات بە یەكێكی تر، بۆئەوەی ئەویش بە بەش كاسپی پێوە بكات.

**بڕگەی هەشتەم:**

لەكاتی دابەشكردنی قازانجەكاندا، دەبێت لە پێشەوە پارە بنەڕەتیەكە جیا بكرێتەوە، ئینجا ئەوەی مایەوە بەش بكرێت.

**بڕگەی نۆیەم :**

لەكاتی مردنی یان شێت بوونی هەر یەكێكیان، گرێبەستەكە هەڵدەوەشێتەوە.

## یاسای باخەوانی

لەلایەن کەسێکەوە دەبێت بۆ بەرهەم هێنانی بەری ڕەزو باخەکان، لەبەرانبەر کرێیەك یان حەقە بەشێك، ئەوکەسە لە خاوەن باخەکەی وەردەگرێت.

**بڕگەی یەکەم:**

دەکرێت هەردووك لایان لەسەرئەوە ڕێك بکەون کە ئەو کرێکارە خزمەتی باخەکە بکاتو بیهێنێتە بەرهەم، لەبەرانبەردا بەشێکی لە بەرهەمەکە بۆ دیاری بکرێت، بە مەرجێك بەشەکە دیاریکراو بێت، وەکو: نیوە، یان سێیەك، یان چواریەك، بەڵام نابێت بەشەکە وا دیاری بکرێت لەبری باخەوانیەکە سەد کیلۆ خورمای بدرێتێ، یان دە بەرچنە هەنجیری بدرێتێ.

**(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): بەشێوەیەك مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی خەیبەردا کرد، (لە بەرانبەر باخەوانیەکەیان)، بەشێك لە بەرهەمی میوەکە، یان کشتوکاڵەکەیان بداتێ).** (٢٣٨)

**بڕگەی دووەم:**

ئەم مامەڵەیە، دەکرێت بەپێی ڕێککەوتنی خۆیان مامەڵەکە ئەنجام بدەن، ئەگەر بە بەش ڕێك نەکەوتن، ئەوا دەتوانن بەکرێ ڕێك بکەون، جا یا کرێی مانگانە، یان کرێی وەرزێك تا کۆتایی بەرهەم هێنانی بەرەکە، بەڵام شێوەی بڕگەی یەکەم باشترە، لەبەرئەوەی باخەوانەکە دەبێت بە خاوەنی بەشێکی بەرهەمەکە، بۆیە زیاتر خزمەتی باخەکە دەکات.

**بڕگەی سێیەم:**

پێویستە باخەکە، دیاریکراو بێتو، سنووری هەبێت لەگەڵ جیرانەکان.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەگەر کەسێك باخێکی چاندو، لەگەڵ باخەوانێکدا ڕێك کەوتن بە چواریەك بۆ ماوەی دووساڵ، بەڵام باخەکە دوای چوار ساڵ هاتەبەر، ئەوە باخەوانەکە هیچی ناکەوێت.

### بڕگەی پێنجەم:

ئەگەر باخەوانیەکە بە بەش بوو، ئەوە خاوێن کردنەوەی جۆگەکانو، ڕنینی گیاوگۆڵی نێو دێراوەکانو، فڕێدانی میوە ڕزیوە وەریوەکان، لە ئەستۆی باخەوانەکەدان.

### بڕگەی شەشەم:

ئەگەر کێشە کەوتە نێوانیانەوە لەسەرئەوەی بە نیوەیی یان بەسێیەك بووە، ئەوا سوێند دەدرێن، پاشان هەردووکلا، یان لایەنێك، یان دادوەر، مامەڵەکە هەڵدەوەشێننەوەو، ئیشکەرەکە حەقە کرێیەکی دەدرێتێ لە هاوتای کرێی ئەو ئیشەی کە کردوویەتی.

## یاسای جووتیاری

المزارعە: واتە بە کرێگرتنی زەویەك بۆ داچاندنی بە کشتوکاڵ.

المخابرە: هەمان (مزارعە)یە تەنها ئەوەندە نەبێت مامەڵەکردنەکە بە وەرگرتنی بەشێکی دیاریکراوە لە بەروبوومەکە.

(زەیدی کوڕی سابت، دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ڕای نەبوو لەسەر بە کرێدانی زەوی بەشێوەی(المخابرە)، منیش گوتم: (المخابرە)چیە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە زەویەك بەکرێ بگریت بە نیوەیی، یان بەسێیەك، یان بەچواریەك).(٢٣٩)

### بڕگەی یەکەم:

زەوی کشتوکاڵی بە بەش نادرێت، وەکو ئەوەی بە نیوەیی یان بە سێیەك یان بە چواریەك بەروبوومەکە لەنێوان جوتیارو خاوەن موڵك بەش بکرێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك زەویەکی هەبوو، با بۆخۆی دایچێنێتو، بە سێیەكو چواریەك یان بە بڕێکی دیاری کراوی خۆراکی نەدات).(٢٤٠)

### بڕگەی دووەم:

دەكرێت وەكو هەموو موڵكێك، زەویە كشتوكاڵیەكە لەلایەن خاوەنەكەیەوە بە بڕە پارەیەكی دیاریكراو بەكرێ بدرێت.

### بڕگەی سێیەم:

دەتوانرێت زەویەكی بێكەڵكی بێ خاوەن چاك بكرێت و دابچێنرێت و، هەموو داهاتەكەش بۆ ئەوكەسەیە كە دایچاندووە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: كەسێك كە زەوییەكی بێكەڵكی بێ خاوەنی زیندوو كردەوەو دایچاند، ئەوە بەروبوومەكە بۆ خۆیەتی و مافی هیچ ستەمكارێكیشی بەسەرەوە نیە).(٢٤١)

### بڕگەی چوارەم:

ئەگەر كەسێك زەوی كەسێكی تر بەبێ ڕەزامەندی خاوەنەكەی داچێنێت، ئەوە هیچی لە بەرووبوومەكەی دەست ناكەوێت، تەنها مافی ئەوەی هەیە خەرجیەكانی وەرگرێتەوە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: كەسێك كە زەوی كەسێكی تری داچاند بەبێ پرسی خاوەنەكەی، ئەوە هیچی لە بەروبومەكە ناكەوێت، تەنها ئەو حەقەی دەدرێتەوە كە خەرجی كردووە).(٢٤٢)

## یاسای حەقی كاركردن

واتە: حەقی كاركردن لە كارێكی ڕەوادا.

### بڕگەی یەكەم:

هەركەسێك كارێك بكات، لە بەرانبەردا مافی خۆیەتی حەقە كرێی خۆی وەربگرێت، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ (٦)الطلاق

﴿....جا ئەگەر شیریان بە منداڵەكانتان دا، ئەوا مافەكانیان بدەنێ﴾.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): حوجامەیەكی كردو حەقەكەشی دا بە حوجامەكەرەكە).(٢٤٣)

بڕگەی دووەم:

پێویستە ئەوكارەی ئەنجام دەدرێت كارێكی قەدەغە نەبێت، بۆنموونە: سەرتاشین حەق دەستی سەرتاشینەكە دەدرێت، جل دروون، حەق دەستی جل دروونەكە دەدرێت، كرێكاری كردن ڕۆژانەكەی وەردەگرێت، بەڵام ناكرێت خاوەنی جوانەگایەك حەقی ئەوە وەرگرێت كە جوانەگاكە خۆی هەڵداتەسەر مانگای كەسێكی تر.

بڕگەی سێیەم:

دەكرێت كەسێكی موسوڵمان ئیش بۆ كەسێكی جولەكە بكاتو، حەق دەستەكەی خۆی لێ وەربگرێت.

(ئیمامی عەلی( ڕەزای خوای لێبێت)، ئاوی بۆ ئافرەتێكی جولەكە دەكێشا، هەر ستلەی بە دنكە خورمایەك). (٢٤٤)

بڕگەی چوارەم:

دەكرێت كەسێك یەكێك بەكرێ بگرێت بەرانبەر پارەیەكی دیاریكراو، بۆئەوەی فێری پیشەیەك یان زانستێكی بكات.

بڕگەی پێنجەم:

پێویستە پێش ئەنجامدانی كارەكە، جۆری كارەكەو، حەق دەستەكەی بزانرێتو، هەردووكیان ڕازیبن لەسەر ئەنجامدانی كارەكە.

بڕگەی شەشەم:

ئەگەر كەسێك یەكێك بەكرێ بگرێت بۆ ئەنجامدانی كارێكی درێژخایەن، وەكو ڕەنجبەرێك بۆ هەڵسوڕاندنی كارەكانی، ئەوە پێویستە هەردووكلایان لەسەر هەموو وردەكاریەكان ڕێك بكەون، ئەوسا دەست بە كارەكە بكرێت، بۆنموونە: خاوەن مەڕێك كەسێك بە شوان دەگرێت، لەسەرەتاوە شوانەكە دەڵێت: من

مانگانە کرێکەی خۆمم دەوێت، حەقی خواردنیش لەسەر تۆیە، ساڵانەش دەستێك جل‌وبەرگی تازەم دەوێت، بۆماوەی دووساڵ لات دەمێنمەوە، لە شوانیش زیاتر هیچی ترت بۆ ناکەم، جا کە خاوەن مەڕەکە ڕازی نەبوو، ئەوە مامەڵەکە پێك نایەت، ئەگەر ڕازیش بوو لە کۆتاییدا نابێت ستەم لە شوانەکە بکات، لەم بارەیەوە خوا لە چیرۆکی مووساو شووعەیبدا دەفەرموێت:

قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنْكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَنْ تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِنْدِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ (٢٧) قَالَ ذَلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَى مَانَقُولُ وَكِيلٌ (٢٨)القصص

﴿(**شووعەیب**)گوتی: من دەمەوێت یەکێك لەو دووکچانەی خۆمت لێ مارەکەم، لە بەرانبەر ئەوەی ماوەی هەشت حەج کردن(**هەشت ساڵ**)کارم بۆبکەی، جا ئەگەر ماوەکەت کرد بە دە ساڵ، ئەوە لە چاکەی خۆتەوەیە، منیش نامەوێت بارەکەت لەسەر قورس بکەم، بە پشتیوانی خوا وام دەبینیەوە کە لە چاکەکارەکانم، (**مووسا**)گوتی: (**ڕێککەوتنەکە**) ئاوەهایە لە نێوانی من‌و تۆدا، کام لەم دوو ماوەیەم تەواوکرد، ئەوە بۆت نیە دەستدرێژی بکەیە سەرم‌و داوای شتی ترم لێ بکەیت، خواش بەسەر قسەکانمانەوە چاودێرو ئاگادارە﴾.

## یاسای بەخشینەکان

## (الهبات)

واتە: بەخشینیماڵو سامانەکان، خوا لەسوورەتی( ال عمران) دەفەرموویێت:

لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ اللّهَ بِهِ عَلِيمٌ (٩٢)

﴿چاکەتان دەست ناکەوێت هەتا لەو(سامانە) نەبەخشنەوە کە خۆشتان دەوێت، ئەو شتەش کە دەیبەخشنەوە، بەڕاستی خوا پێی ئاگادارە﴾.

**بڕگەی یەکەم:**

بەخشینەوەی هەر شتێك چاکەکەی بۆ خاوەنەکەیەتی.

(پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: خاوەن بەزەییەکان، خوا بەزەیی پێیاندا دێتەوە، ئێوەش بەزەییتان بە خەڵکی زەویدا بێتەوە، ئەوەی لە ئاسمانە بەزەیی پێتاندا دێتەوە، پەیوەندیەکانی رحم بەشێکە لە خوای خاوەن ناوی(الرحمن)، هەرکەسێك ئەو پەیوەندیانە ئەنجام بدات، ئەوە خواش لەگەڵ ئەو کەسەدا ئەنجامی دەدات، هەرکەسێکیش ئەو پەیوەندیانە بپچڕێنێت، ئەوا خواش لەگەڵیدا دەیپچڕێنێت).(٢٤٥)

**بڕگەی دووەم:**

لەکاتی بەخشینی شتێکدا، بەسەر منداڵەکاندا، واچاکە هیچ لە منداڵەکان بەسەر ئەوانی ترەوە دانەنرێن.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: خۆتان لە سزای خوا بپارێزنو پەیڕەوی دادوەری بکەن لەنێوان منداڵەکانتان).(٢٤٦)

**بڕگەی سێیەم:**

هەرشتێك بە کەڵکی فرۆشتن بێت، دەکرێت ببەخشرێتەوە.

**بڕگەی چوارەم:**

هەر ماڵێك نادیار بێتو لەبەردەستدا نەبێت، ناگونجێت ببەخشرێتەوە.

**بڕگەی پێنجەم:**

بەخشینەوەی شتێك بە داهاتووەوە نابەسترێتەوە.

**بڕگەی شەشەم:**

کە شتێك دەبەخشرێتەوە، پێویستە بەخشەرەکە بڵێت: ئەوە ئەوەم پێ بەخشیت، ئەویش بڵێت: ئەوە قبووڵم کرد، یان بە کردار بەجێی بێنێت.

**بڕگەی حەوتەم:**

کەسێك کە بەخشینێك بدات بە کەسێکی تر، بۆی نیە لێی پەشیمان ببێتەوە، مەگەر تەنها باوك بۆی هەیە لە پێ بەخشینی کوڕەکەی یان کچەکەی پەشیمان ببێتەوە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: بۆ کەسێك نابێت بەخشینێك بدات بە کەسێك، پاشان لێی پەشیمان ببێتەوە، مەگەر تەنها باوك بۆی هەیە لە پێبەخشینی منداڵەکەی پەشیمان ببێتەوە).(٢٤٧)

**بڕگەی هەشتەم:**

دەکرێت کەسێکی بەخشەر بە یەکێکی تر بڵێت: ئەو خانووەم پێ بەخشیت هەتا دەمریت تێیدابیت، لەدوای خۆشت بۆئەوانەی دوای خۆت، ئەوە دوای مردنی بەخشەرەکەش خانووەکە بۆ میراتگرەکانی ئەوکەسە دەبێت کە ماڵەکەی پێ بەخشراوە.

**بڕگەی نۆیەم:**

دەکرێت کەسێکی بەخشەر بە یەکێکی تر بڵێت: ئەو خانووەم پێ بەخشیت، کەی تۆ مردیت، خانووەکە بۆ من بگەڕێتەوە، کە منیش پێش تۆ مردم ئەوە خانووەکە بۆخۆت بێت، بەڵام مەرجەکە بەتاڵ دەبێتەوەو خانووەکە ناگەڕێتەوە بۆ بەخشەرەکەو دەبێتە میرات بۆ میراتگانی پێ بەخشراوەکە.

**بڕگەی دەیەم:**

ئەگەر کەسێك قەرزێکی لای یەکێکی تربوو، دەتوانێت لە قەرزەکەی ببەخشێت، بەبێ ڕەزامەندی قەرزدارەکەش، چونکە دەکرێت ئەم بەخشەرە

بڕێك باره ببەخشێتە خاوەن قەرزەکەو پاشان خاوەن قەرزەکە بێت بڕە قەرزەکە بداتەوە، واتە بەخشینەکە پێویستی بەڕەزامەندی خاوەن قەرزەکە نیە.

## یاسای ڕاسپاردنەکان

ئیمامی ئەبوبەکر، ئیمامی عومەری ڕاسپارد(ڕەزای خوایان لێبێت)، دوای خۆی ببێت بە خەلیفەی موسوڵمانان، ئیمامی عومەریش دوای خۆی مەجلیسی شورای ڕاسپارد خەلیفەیەك بۆ موسوڵمانان دەستنیشان بکەن، هاوڕێکانی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) هەموویان بەمە ڕازی بوون.

**بڕگەی یەکەم:**

کەسێك منداڵی وردی هەبن، دەتوانێت کەسێك ڕاسپێرێت دوای مردنی خۆی چاودێری منداڵەکانی بکات.

**بڕگەی دووەم:**

کچێکی هەتیو کە کاتی شووکردنی هات، ئەوکەسەی کە لەلایەن باوکیەوە ڕاسپێردراوە بۆ چاودێری منداڵەکانی، ناتوانێت ئەو کچە بە شوو بدات، بەڵکو کچەکە بۆخۆی سەربەستە لە شوو کردنەکەیدا.

(ئیبن عومەر گێڕایەوە، دەڵێ: قودامەی کوڕی مظعون، کچی عوسمانی کوڕی مظعونی برای لێ مارەکردم، جا قودامە هات بۆلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گوتی: من مامی ئەو کچەو ڕاسپێرراوی باوکیشیم، لە عبداللەی کوڕی عومەرم مارە کرد، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەوە هەتیوە بەئارەزووی خۆی نەبێت بە شوو نادرێت). (٢٤٨)

**بڕگەی سێیەم:**

ڕاسپاردەی کەسێکی دەوڵەمەند لە ماڵەکەیدا دوای مردنی، نابێت لە سێیەکی ماڵەکەی زیاتر بێت، ڕاسپاردەی کەسێکی هەژاریش پێویستە لە سێیەك کەمتر بێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: سێیەکی ماڵەکەت زۆرە بیکەی بە وەسیەت، تۆ ئەگەر میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی جێهێڵیت، باشترە لەوەی بە هەژاری جێیانهێڵیت، دەست لەبەر خەڵکی پان بکەنەوە).(٢٤٩)

**بڕگەی چوارەم:**

پێویستە لەسەر کەسێك کە لای نەخۆشێکە نەهێڵێت لە وەسیەت کردنەکەیدا لە سنووری خۆی لادات.

**بڕگەی پێنجەم:**

خێرو چاکەکردنی پێش مردن، باشترە لە وەسیەت کردنی دوای مردن.

**بڕگەی شەشەم:**

وەسیەت کردنێك خزمەت بە ئایینی ئیسلام نەکات، ئیشی پێ ناکرێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: خوای گەورە دوای مردنی خۆتان سێیەکی ماڵەکەتانی بۆ داناون بۆئەوەی لە چاکەکانتانی پێ زیاد بکەن).(٢٥٠)

**بڕگەی حەوتەم:**

ئەو سێیەکەی وەسیەت، دادەنرێت بۆ دانەوەی قەرزەکانی خەڵکی کە بەسەریەوەن، یان بۆدانەوەی حەقەکانی خوا، وەکو حەج و زەکات، یان بۆ هەر ڕاسپاردەیەکی تر کە مردووەکە ڕایسپاردووە.

## یاسای وەقف کردن

واتە بەخشینی ماڵێك لە پێناوی خوادا.

**بڕگەی یەکەم:**

هەموو شتێك کە کەڵکی لێ وەرگیرێت، دەتوانرێت وەقف بکرێت لەپێناوی خوادا، وەکو: خانوو، ئاژەڵ، کەلوپەل، چەك.

**بڕگەی دووەم:**

دەکرێت پارە ببەخشرێت لەپێناوی خوادا، بۆ دروستکردنی مزگەوتێك، یان نەخۆشخانەیەك، یان هەر پڕۆژەیك کە خزمەت بە کۆمەڵگای ئیسلامی بکات.

**بڕگەی سێیەم:**

هەر پارەیەك وەقف بکرێت، مامەڵەکردن پێیەوە دەوەستێنرێت و لەو ڕۆژەوە کە وەقف کراوە ناکەوێتە بەر یاساکانی زەکاتەوە.

**بڕگەی چوارەم:**

هەرماڵێك وەقف بکرێت، وەکو خانوو، ئەگەر خانووەکە هی چەند کەسێکیش بێت و نەتوانرێت بەش بکرێت، ئەوا بەشی یەکێك لە شەریکەکان دەتوانرێت وەقف بکرێت.

**بڕگەی پێنجەم:**

وەقف کردن بە هیچ مەرجێکەوە نابەسترێتەوە.

**بڕگەی شەشەم:**

وەقف کردن نابەسترێتەوە بە کاتەوە.

**بڕگەی حەوتەم:**

دەتوانرێت نهۆمی دووەمی خانوویەك بە بێ نهۆمی یەکەمی وەقف بکرێت، هەروەها دەتوانرێت نهۆمی یەکەمی بە بێ نهۆمی دووەمی وەقف بکرێت.

**برگەی هەشتەم:**

**دەبێـت ئەوكەسـەی كـە ماڵەكـە وەقـف دەكـات، بـە دەم نـاوی وەقـف كردنەكـە بێنێت، ئەویش شەش وێردی هەیە: (وقفت، حبست، سبلت، تصدقت، ابَّدت، حرمت)**

**برگەی نۆیەم:**

**ماڵی وەقف كراو لەلایەن خاوەنەكەیەوە، نە دەفرۆشرێتو نە دەبەخشرێتو نە دەبێت بەمیرات بۆ میراتگرەكان.**

## یاسای ئازادكردنی بەندەكان

## (العتق)

فَلا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ (١١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ (١٢) فَكُّ رَقَبَةٍ (١٣)البلد

**﴿جا(ئەو ئادەمیزادە) تـا ئێـستا كۆسـپە سـەختەكەی نـەبڕیوە، (ئـەی محەمـەد)، تۆش چوزانیت كۆسپە سەختەكە چیە؟ ئازادكردنی بەندەیەكە لە كۆیلایەتی﴾.**

**برگەی یەكەم:**

**ئازادكردنی بەندەیەك، چاكەیەكە بۆ ئازادكەرەكە دەگەڕێتەوە.**

**(پێغەمبـەر(صلى الله عليـه وسـلم) فەرموویـەتی: هەركەسـێك بەندەیـەك ئـازاد بكـات، لەبری ئازادكردنی هەر ئەندامێكی جەستەی ئەو بەندەیە، ئەوا خـوا ئەندامێكی جەستەی ئەوكەسە ڕزگار دەكات لە ئاگر).**(٢٥١)

**برگەی دووەم:**

**كەسـێكی خـاوەن مـاڵو سـامان، دەتوانێـت بەندەیـەك بكڕێـتو ئـازادی بكـات، بەمـەرجێك خـۆی قـەرزدار نـەبێت، یـان نـەخۆش نـەبێت پێویـستی بـە مـاڵو سامانەكەی هەبێت.**

برگەی سێیەم:

ئەوکەسەی کە بەندەیەکی خۆی ئازاد دەکات، هەر ئەوەندە بەسە پێی بڵێت: من هیچم بەسەر تۆوە نەماوە، یان بڵێت: وازم لێ هێنایت، یان بڵێت تۆ سەربەستیت، بەڵام ئەگەر کەسێك بە کەنیزەیەکی خۆی بڵێت: تۆ وەکو دایکم وای بۆمن، ئەوە ئازادی نابێت، تەنها لەکاری جووتبوون قەدەغە دەکرێت.

برگەی چوارەم:

ئەگەر کەسێك بە بەندەیەکی خۆی بڵێت: ئەوە ئازادم کردیت لە بەرانبەر ئەوەی هەزار دینارم بدەیتێ، بەندەکەش ڕەزامەندی نیشاندا، ئەوە یەکسەر هەزار دینارەکە دەکەوێتە ئەستۆی بەندەکەوە، کە پارەکەی دا بە خاوەنەکەی، ئازاد دەکرێت.

برگەی پێنجەم:

هەرکەسێك لە کۆیلەکەی ژێر دەسەلاتی خۆی بدات، ئەوە بۆ پاك بوونەوە لەو تاوانە، پێویستە کۆیلەکە ئازاد بکات.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەرکەسێك تەوقاتێك لە بەندەکەی بدات، یان لێیداو بیکوتێت، حەقی پاك بوونەوە لەو تاوانە ئەوەیە، بەندەکە ئازاد بکات).(٢٥٢)

برگەی شەشەم: دەکرێت زەکات، یان خێر، بدرێت بە بەندەی موسوڵمان، بۆئەوەی خۆی پێ ئازاد بکرێت.

وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَآَتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آَتَاكُمْ.....(٣٣ النور)

﴿....ئەو کۆیلانەش کە لەبەردەستی ئێوەدان و دەیانەوێت بۆ دیاریکردنی ماوەی ئازادبوونیان گرێبەستێکتان لەگەڵدا بنووسن، ئەوا ئەگەر چاکەکاریەکتان لەوانەوە دیت(کە دەتوانن دوای ئازادبوونیان خۆیان بژیەنن و خێرو چاکەو توانای کارکردن و خۆ ئازادکردنتان لێ دیتن)، گرێبەستیان

لەگەڵدا بنووسن، لەوماڵەش کە خوا بەئێوەی داوە بەشی ئەوانی لێ بدەن، (بۆئەوەی بەزوویی ڕزگاریان بێت لە کۆیلەیی)...﴾.

هەروەها کۆیلەکان یەکێکن لەو هەشت پۆلەی کە یاسای زەکات دەیانگرێتەوە، خوا لەم بارەیەوە لە سوورەتی (التوبه)، دەفەرموویێت:

إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٦٠)

﴿بەڕاستی زەکات بۆ ئەوانەیە کە(خەڵکی) لاتو گەدان، بۆ ئەوانەش لە کۆکردنەوەی زەکات کاردەکەن و، بۆ نوێ موسوڵمانە دڵ ڕاگیراوەکان و، بۆ بەندەو(کۆیلەو)، بۆ قەرزدارەکان و، بۆ(خەرجکردنی) لەڕێگەی خواداو، بۆئەو ڕێبوارانەش کە لەڕێگادا تووێشویان لێ دەبڕێت و ناگەنەوە جێگەی خۆیان، (زەکات لەسەر پەیڕەوانی ئاپینی ئیسلام) لەلایەن پەروەردگارەوە پێویستکراوە، بەڕاستی پەروەردگار زاناو شارەزاو کاردروستە﴾.

برگەی حەوتەم: هەر کەسێك ببێتە خاوەنی کۆیلەیەك، کە پەیوەندی ڕوحمی لەگەڵدا هەبێت، ئەوا ئەو کۆیلەیە ئازاد دەبێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەر کەسێك ببێتە خاوەنی کۆیلەیك کە پەیوەندی ڕوحمی لەگەڵدا هەبێت، ئەوا ئەو کۆیلەیە ئازاد دەبێت).(٢٥٣)

برگەی هەشتەم:

لەم بارانەی خوارەوەدا، لەجیاتی حەقی تاوانەکان کۆیلە ئازاد دەکرێ.

یەکەم: لە حەقە تۆڵەی کوشتنی کەسێك بە هەڵە، کۆیلەك ئازاد دەکرێ.

دووەم: لە حەقە تۆڵەی ئەو کەسەی کە بە ژنەکەی دەڵێت، تۆ و بۆ من وەکو دایکم وایت، بەندەیەك ئازاد دەکرێت.

سێیەم: لە حەقە تۆڵەی سوێند خواردنی بە درۆدا، بەندەیەك ئازاد دەکرێت.

چوارەم: ڕۆژوو شکاندنی مانگی ڕەمەزان بەهۆی جووت بوونەوە، حەقە تۆڵەکەی ئازادکردنی بەندەیەکە.

## یاساکانی لەئەستۆگرتن

## (النذر)

**بڕگەی یەکەم:**

لەئەستۆ گرتن دروستە بۆ هەموو موسوڵمانێکی کامڵی ژیر.

**بڕگەی دووەم:**

هەرکەسێك شتێك لەئەستۆی خۆی بگرێت، دەبێت جێبەجێی بکات.

**(عومەر(ڕەزای خوای لێبێت) بە پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) گوت: لەسەردەمی نەزانیدا مانەوەی شەوێکم بۆ خواپەرستی لەئەستۆی خۆم گرتووە، ئەویش فەرمووی: پەیمانەکەت بەجێبێنە)**.(٢٥٤)

**بڕگەی سێیەم:**

منداڵ و شێت بەرپرس نابن لەوەی شتێك لەئەستۆی خۆیان بگرن.

**بڕگەی چوارەم:**

پێویستە شت لە ئەستۆگرتنەکە تەنها بۆ خوا بێت و بە قسە دانی پێدابنرێت، بۆنموونە: ئەوکەسە بڵێت: ئەوە مەڕێکم خستە ئەستۆی خۆمەوە لە پێناوی خوادا سەری ببڕم.

**بڕگەی پێنجەم:**

بۆ پاکبوونەوە لە ئەستۆگرتنێك کە ئەنجام نەدرابێت، دەبێت لەبریدانێك بدرێت، وەکو لەبریدانی سوێند خواردن.

**(فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی: خۆ پاککردنەوە لە ئەستۆگرتێك کە ئەنجام نەدرابێت، وەکو لەبریدانی سوێند خواردن وایە)**.(٢٥٥)

**بڕگەی شەشەم:**

موسوڵمانەکان دەتوانن هەر خوا پەرستیەك بۆ خوا لە ئەستۆی خۆیان بگرن و جێبەجێی بکەن، بۆنموونە: کەسێك دەتوانێت بڵێت: ئەگەر خوا لەم کارەساتە ڕزگارم بکات، ئەوا مانگێك بەڕۆژوو بوون لە ئەستۆی خۆم دەگرم، جا پێویستە

هەموو مانگەکە بەسەریەکەوە بەڕۆژوو بێت و لە مانگی ڕەمەزاندا نەبێت، ئەگەر هات و ئەو کەسە لەو ماوەیەدا مرد، لە ئەستۆگرتنەکەی ئەنجام نەدرا، ئەوا پێویستە کەس و کارەکەی بۆی ئەنجام بدەن.

**بڕگەی حەوتەم:**

ئەگەر کەسێك مەڕێکی لەئەستۆی خۆی گرت لە مەککە سەری ببڕێت لە پێناوی خوادا، دەبێت سەربڕینەکە لە مەککە بێت، هەر کەسێکیش نوێژێکی مزگەوتی کەعبەی لە ئەستۆی خۆی گرت، ئەوا دەبێت نوێژکردنەکە لە کەعبە بێت.

**بڕگەی هەشتەم:**

ئەگەر کەسێك بەڕۆژووبوونی هەموو دوو شەممەو پێنج شەممەیەکی لە ئەستۆی خۆی گرت، ئەوا ئەو دوو شەممەو پێنج شەممانەی کە دەکەونە مانگی ڕەمەزانەوە، کێشەی بۆ دروست ناکەن و پێویست بە گرتنەوە ناکەن.

**بڕگەی نۆیەم:**

ئەگەر کەسێك لە ئەستۆگرتنەکەی بە هاتنی کەسێکی ترەوە ببەستێتەوە، وەکو ئەوەی بڵێت: کە کوڕەکەم هاتەوە، ئەوا ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبم، ئەوا بەڕۆژووبوونەکە لە ڕۆژی دوای هاتنی کوڕەکەیەوە پێویست دەبێت لەسەری. بەڵام کەسێك مانەوەی ڕۆژێکی لە مزگەوت لە ئەستۆی خۆی گرت کە کوڕەکەی تێیدا دەگەڕێتەوە، بەڵام کوڕەکە بەشەو گەڕایەوە، ئەوا لە ئەستۆ گرتنەکە پێویست نابێت لەسەری، لەبەرئەوەی مەرجەکە نەهاتۆتە دی کە هاتنەوەی کوڕەکەیە لە ڕۆژێکدا، جا ئەگەر کوڕەکەش لە کاتێکی ڕۆژدا هاتەوە، ئەوا پێویستە ئەوماوەیەی کە ماوە لە ڕۆژەکە، بچێت لە مزگەوت بمێنێتەوە.

**بڕگەی دەیەم:**

ئەگەر کەسێك حەج کردنی لەم ساڵدا خستە ئەستۆی خۆیەوەو، بە ئارەزووی خۆی حەجەکەی نەکرد، ئەوە دەبێتە قەرز بەسەریەوە، بەڵام ئەگەر لە توانایدا نەبوو حەجەکە بکات، ئەوا لە ئەستۆگرتنەکەی لەسەر نامێنێت.

## یاسای خۆداپۆشینی ئافرەتان

بنــەما بنەڕەتیــەکانی مرۆڤایــەتی، قبــووڵ ناکــەن ئــادەمیزاد ڕووت بێــت، جـا هـەرکاتێك ئـادەمیزاد ئـەو ڕەوشـتەی لەدەسـتدا، ئـەوا لـە سـنوورە مرۆییـەکان دادەبەزێتە خوارەوە، تەنانەت دەرخستنی ڕانی پیاوانیش قەدەغەیە.

سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً (٦٢)الاحزاب

﴿ئەمە شێوازو(داب‌ونەریتی)ڕێبازی خوایە لەنێو ئەوانەی کە لەپێش ئێوەوە تێپەڕین، هیچ کاتێکیش گۆڕانکاریەك نابینی لەشێوازو(داب‌ونەریتی خوادا)﴾.

### بڕگەی یەکەم:

خۆ داپۆشین ڕەوشتێکی مرۆییە، تەنها تایبەت نیە بە ئیسلامەوە.

ئادەمو حەوا کاتێك لە بەهەشت لەبەری دارەکەیان خوارد، عەیب‌و عارەکانیان دەرکەوتن، بۆیە بە پەلە بەهۆی گەڵای دارەکانی بەهەشتەوە کەوتنە داپۆشینی جەستەکانی خۆیان، خوا لەم بارەیەوە لەسوورەتی (الاعراف) دەفەرموێت:

فَلَمَّا ذَاقَا الشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ (٢٢)

﴿..کاتێك لـە دارەکـەیان چێشـت، دامێنـەکانیان دەرکـەوتن‌و، دەسـتیان کـرد بـە پێکەوەنان‌و پێوە نووساندنی گەڵای دارەکانی بەهەشت بە دامێنەکانیانەوە﴾.

### بڕگەی دووەم:

ئافرەتــان دەبێــت هــەموو جەســتەی خۆیــان داپۆشــن، تــەنها دەموچــاوو دەستەکانیان نەبێت هەتا مەچەکەکان.

### بڕگەی سێیەم:

داپۆشـینی قـژی ئافرەتـان لـە هـەموو ئایینەکانـدا پێویسـت کـراوە، چـونکە دەرکەوتنی قژی ئافرەتان ڕێگرە لە هاتنی فریشتەکان بۆ ئەو شوێنە.(٢٥٦)

### بڕگەی چوارەم:

هـەر ئافرەتێك جوانیەکـەی خـۆی بـۆ خـەڵکی دەرخـات، ئـەوە دژایـەتی کردنـی ویستەکانی خوایە، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ.... (٣١ النور)

﴿...جوانیەکانی خۆشیان دەرنەخەن، مەگەر تەنها ئەوەندەی کە بەدەرەوەیە، با چارشێوەکانیشیان بەسەر کۆڵمەکانیاندا بدەن، جوانیەکەشیان دەرنەخەن، مەگەر تەنها بۆ مێردەکانیان، یان بۆ باوانەکانیان، یان بۆ باوانی مێردەکانیان، یان بۆمنداڵەکانی خۆیان.........﴾.

**بڕگەی پێنجەم:**

ئافرەتەکان بۆئەوەی نەکەونە بەر سێرەی ئارەزووەکانی خەڵکی و ئازار نەدرێن، پێویستە خۆیان داپۆشن.

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً (٥٩)الاحزاب

﴿ئەی پێغەمبەر، بە خێزانەکانت و، کچەکانت و، خێزانی خاوەنباوەڕەکان، بڵێ: با پۆشاکەکانیان بەسەر خۆیان دادەن، ئەوە گونجاوترە بۆ ئەوان، لەوەی کە بناسرێن، جا بەهۆی ئەو خۆداپۆشینەیان دوور دەکەونەوە لەوەی (بە قسە) ئازار بدرێن، خواش لێبوردەو خاوەن بەزەییە﴾.

**بڕگەی شەشەم:**

هەر ئافرەتێك لە ژیانی ڕۆژانەیدا، لە کاروپیشەیدا داپۆشراو نەبێت لە سنووری یاساکانی خوادا، ئەوە ئەو ئافرەتە لادەرە لە ئیسلام، هەر خواپەرستیەك بکات لێی وەرناگیرێت، چونکە یەکێك لە مەرجەکانی چوونە ناو خواپەرستیەکەوە ئەوەیە کە ئافرەتەکە خۆی داپۆشێت.

وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ (٤٤)المائدة

﴿....هەر کەسێکیش کار بەو یاسایانە نەکات کە خوا ناردوونیە خوارەوە، ئەوا ئەوانە بێباوەڕەن﴾.

## یاسای قەدەغەکردنی کوشتن و تاوانەکانی تر

## قانون الجنايات

هەرکەسێك تاوانبار بێت بە کێشەیەکەوە، دەخرێتە بەندیخانەوە، تا لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکە دەکرێت:

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەهۆی تۆمەتێکەوە کەسێکی خستە زیندانەوە، پاشان بەرەڵای کرد). (٢٥٧)

برگەی یەکەم:

وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِناً مُّتَعَمِّداً فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا وَغَضِبَ اللهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَاباً عَظِيماً (٩٣)النساء

﴿هەرکەسێکیش بە ویستوئارەزوو خاوەن باوەڕێك بکوژێت، ئەوە سزای ئەو کەسە بە نەمری مانەوەیەتی لە جەهەندەمدا، خواش ڕق‌وقینی لێ داگرتووەو نەفرینی لێکردووەو سزایەکی گەورەی بۆ سازداوە﴾.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: کوشتنی خاوەن باوەڕێك لەلای خوا لەوە گەورەترە کە هەموو دنیا لەناوبچێت). (٢٥٨)

برگەی دووەم:

تەنها لەسێ حاڵەتدا بڕیاری کوشتن دەدرێت:

یەکەم: ئەگەر پیاوێکی خاوەن ژن، یان ژنێکی خاوەن مێرد، داوێنپیسی بکات.

دووەم: ئەگەر موسوڵمانێك لە ئایینەکەی هەڵگەڕابێتەوە.

سێیەم: ئەگەر کەسێك یەکێکی تر بکوژێت، ئەوا دەبێت لە تۆڵەی کوژراوەکەدا ئەوکەسە بکوژرێتەوە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە خوێنی مرۆڤێکی موسوڵمان بڕژێت، تەنها لەم سێ بارەدا نەبێت: پیاوێکی خاوەن ژن داوێنپیسی کردبێت، یان کەسێك لەئایینەکەی هەڵگەڕابێتەوە، یان ئەو کەسە کەسێکی تری کوشتبێت). (٢٥٩)

بەلاَم ئەگەر هاتوو لەنێوان تیرەو هۆزەكاندا یەكێك كوژرا، ئەوا خوا دەفەرموێت:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى..(١٧٨ البقرة)

﴿ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە، لەسـەرتان نووسـراوە لـە (یاسـای) تۆڵـەی كوژراوەكاندا، كەسی سەربەست لـەجیاتی كەسێكی سەربەست دەكوژرێتـەوە، كەسێكی كۆیلـەش لـەجیاتی كۆیلەیـەكی كوژراو دەكوژرێتـەوە، مێیینەیـەكیش لەجیاتی مێیینەیەكی كوژراو دەكوژرێتەوە ....﴾.

**بڕگەی سێیەم:**

مندالَو شێت كوشتنەوەیان لەسەر نیە.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەگەر پیاوێك ژنێك بكوژێت، ئەوە پیاوەكە دەكوژرێتەوە.

**بڕگەی پێنجەم:**

باپیرو نەنك، یان دایكو باوكێك، ئەگەر كوڕەكەی یان نەوەكەی خۆیان كوشت، تۆڵەیان لیٚ ناكرێتەوە، بەمەرجێك دایكو باوكەكە موسولَمان بن، بەلاَم ئەگەر كەسێكی تر یارمەتی دایكو باوكەكەیاندا بۆ كوشتنی كوڕەكەیان، ئەوا ئەوكەسە دەكوژرێتەوە.

**بڕگەی شەشەم:**

ئەگەر كوڕێك یا كچێك، دایكو باوكی خۆی بكوژێت، ئەوە ئەو كوڕە، یان ئەو كچە، دەكوژرێتەوە.

**بڕگەی حەوتەم:**

ئەگەر سەلمێنرا كە كۆمەلَێك هاوبەشن لە كوشتنی كەسێدا، ئەوا هەموویان دەكوژرێنەوە.

**بڕگەی هەشتەم:**

ئەگەر یەکێك کەسێکی بریندارکردو ئەوکەسە بەهۆی برینەکەیەوە مرد، جا بریندارکردنەکە بەهۆی هەر شتیکەوە بێت، ئەوا بریندارکەرەکە لەبری کەسە مردووەکە دەکوژرێتەوە، بەڵام ئەگەر هات و مردنی کەسەکە بەهۆی تێگرتنی پێنووسێکەوە یان بەهۆی دەسکەلایەکەوە بوو، ئەوا کەتن کەرەکە ناکوژرێتەوەو حەقە خوێنی مردووەکەی لێ وەردەگیرێت، چونکە پێنووس یان دەسکەلا، نابنەهۆی مردنی کەسێك.

**بڕگەی نۆیەم:**

ئەگەر کەسێك دەستی خستە سەر دەمی کەسێکی ترو، بەرینەدا هەتا خنکاندی، یان سەرینێکی خستە سەردەمی و خنکاندی، یان گونەکانی بادان و بەرینەدان هەتا مرد، ئەوا ئەو کەسە دەکوژرێتەوە.

**بڕگەی دەیەم:**

ئەگەر کەسێك یەکێکی تر لە شوێنێکی بەرز فرێداتە خوارەوەو ببێتەهۆی مردنی، یان هەڵیداتە ناو ئاگرەوەو بسووتێت و بمرێت، یان هەڵیداتە ناو ئاوێکەوەو نەتوانێت دەرباز بێت و بخنکێت، ئەوا ئەوکەسە دەکوژرێتەوە.

**بڕگەی یازدە:**

ئەگەر کەسێك یەکێکی بەند کرد بۆماوەیەك و هیچ خواردن و خواردنەوەیەکی نەدایەو بەهۆیەوە مرد، ئەوا ئەو کەسە دەکوژێتەوە.

**بڕگەی دوازدە:**

ئەگەر کەسێك کەسێکی تری دەرمانداو کردو بەهۆیەوە کەسەکە مرد، ئەوا ئەو کەسە لە تۆڵەی مردووەکەدا دەکوژرێتەوە.

**بڕگەی سێزدە:**

ئەگەر کەسێك پارەی دا بە کەسێکی تر، بۆئەوەی یەکێکی بۆ بکوژێت، ئەویش ئیشەکەی ئەنجامدا، ئەوە بکوژەکە دەکوژرێتەوەو، هیچ حەقە خوێنێکیش ناکەوێتە ئەستۆی پارەدەرەکە.

ئەگەر دەسەڵاتدارێك داوای كوشتنی كەسێكی لە یەكێكی تر كرد، ئەوا ئەو كەسەی دووەم نابێت بە قسەی دەسەڵاتدارەكە بكات.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: نابێت گوێڕایەڵی كەسێك بكرێت كە دژی ویستەكانی خوا بێت). (٢٦٠)

ئەگەر دەسەڵاتدارێكیش فەرمانی بە منداڵێك كرد، یان فەرمانی بە كەسێكی بیانی كرد كە شارەزا نەبوو لەوەی كە نابێت بۆ ئەوشتانە بە قسەی گەورەكەی بكاتو، كوشتنەكە ئەنجامدرا، ئەوا تۆڵەكردنەوەكە بە كوشتنی دەسەڵاتدارەكە دەبێت، بەڵام ئەگەر دەسەڵاتدارەكە فەرمانی دزی كردنێكی بەسەر كەسێكدا كردو، ئەویش دزیەكەی ئەنجامدا، ئەوا سزاكە بەسەر ئەنجامدەرەكەدا دەسەپێت.

## بڕگەی چواردە:

ئەگەر دوو كەس شاهیدیاندا بەوەی كەسی سێیەم پیاوكوژەو یەكێكی تری كوشتووەو، بەم هۆیەوە كەسی سێیەم كوژرایەوە، پاشان دوو شاهیدەكان لە شاهیدیدانەكەیان پەشیمان بوونەوە، ئەوا ئەو دووكەسە كە شاهیدیان داوە هەردووكیان دەكوژرێنەوە.

## بڕگەی پازدە:

ئەگەر كەسێك چەند كەسێك بەیەكەوە بكوژێت، ئەوە لە تۆڵەی كوشتنی هەر یەكێكیاندا، سزای كوشتنێكی بەسەردا دەدرێت، ئەگەر سزای تۆڵەی كوژراوی یەكەم بەسەریدا سەپێنرا، ئەوا كێشەی كوژرانی كەسی دووەم دێتە بەردەم دادگاو، لەویش سزای كوشتنی بۆ دادەنرێت، بۆیە لە تۆڵەی هەموو ئەو كوژراوانەی كە بە یەكەوە كوشتونی، ئەوەندە سزای كوشتنەی بەسەردا دەدرێت، حەقە خوێنەكانیش لە میراتەكەی دەدرێن.

## بڕگەی شازدە:

لەتۆڵەی كوشتنی هەڵەدا كەخاوەن باوەڕێك بەهەڵە بكوژرێت، خوا دەفەرموێت:

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِناً إِلاَّ خَطَئاً وَمَن قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَئاً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلاَّ أَن يَصَّدَّقُواْ

﴿بۆ هیچ خاوەنباوەڕێكیش نەبووە خاوەنباوەڕێكی تر بكوژێت، مەگەر بە هەڵە، جا كەسێك كە خاوەنباوەڕێكی بە هەڵە كوشت، ئەوا لەسەری پێویستكراوە بەندەیەكی خاوەن باوەڕ ئازاد بكات و، حەقە خوێنەكەشی دەدرێتە دەست كەسوكارەكەی، مەگەر ئازادی بكەن و خوێنی لێ وەرنەگرن....﴾.

جا ئەگەر هات و خاوەن باوەڕە كوژراوەكە لە نێو تیرەو هۆزێكدا بوو دوژمنایەتیتان لەگەڵدا هەبوون:

فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مْؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ

﴿..جا ئەگەر ئەوكەسە كوژراوە خاوەنباوەڕ بوو، لە هۆزێكی دوژمنی ئێوە بوو، ئەوا ئازادكردنی بەندەیەكی خاوەنباوەڕ(**پێویستكراوە لەسەرتان**)....﴾.

بەڵام ئەگەر هات و خاوەنباوەڕە بە هەڵە كوژراوەكە لە تیرەو هۆزێك بوو كە پەیمانتان لەگەڵدا هەبوون، ئەوا خوا لەسوورەتی( النساء) دەفەرموێت:

وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِّيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةً فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ اللهِ وَكَانَ اللهُ عَلِيماً حَكِيماً (٩٢)

﴿....ئەگەر ئەو كەسە كوژراوەش لە هۆزێك بوو لەنێوانتان پەیمان وبەڵێن هەبوو، ئەوا لەبریدانێك (**پێویستە لەسەرتان بیدەنە دەست كەس وكاری كوژراوەكە**)، ئازادكردنی بەندەیەكی خاوەنباوەڕیش لەبری خوێنەكەی، جا كەسێك كە نەیبوو بەندەیەكی خاوەنباوەڕ ئازاد بكات، ئەوە وەكو لێخۆشبوونێك لەلایەن خواوە بەڕۆژووبوونی دوومانگتان لەسەریەك (**لەسەر پێویستكراوە**)، خواش زاناو كاردروستە﴾.

**بڕگەی حەقدە:**

ئەگەر کەسێك سزای کوشتنی بەسەردادرا، جا بەهۆی گەڕانەوەی بێت بۆ بێباوەڕی، یان بەهۆی داوێن پیسی یەوە بێت، یان بەهۆی تۆڵەی کوشتنی یەکێکی ترەوە، ڕایکردە ناو مزگەوتی کەعبەوە بۆئەوەی ڕزگاری بێت، ئەوە پیرۆزی مزگەوتی کەعبە، یان هەر مزگەوتێکی تر، تاوانبارەکان لە سزاکانیان ناپارێزێت، لەنێو مزگەوتەکەدا دەگیرێت و دەکوژرێت، هەروەکو خوا دەفەرموێت:

فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتَّمُوهُمْ ...... (٨٩)النساء

﴿.....بیانگرن و بیانکوژن لەهەر شوێنێك کە تووشیان بوون.......﴾.

## تۆڵەی برین و ئەندامە بڕدراوەکان

**بڕگەی یەکەم:**

وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ

﴿لە تەوراتیشدا لەسەرمان نووسیون (لەسەرمان پێویست کردوون) کە(لە تۆڵەکردنەوەدا)، کەسێك لەبری کەسێك و، چاو لەبری چاوو، لووت لەبری لووت و، گوێ لەبری گوێ و، ددان لەبری ددان، تۆڵە دەکرێنەوە....﴾.

**بڕگەی دووەم:**

وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُ.....(٤٥ المائدة)

﴿.....برینەکانیش هەقە تۆڵەیان هەیە، جا هەر کەسێك لەو حەقە تۆڵەیە خۆشبێت، ئەوە(ئەو لێخۆشبوونە) لەلایەن خواوە لێخۆشبونێکە لە تاوانەکانی ئەوکەسە....﴾.

**بڕگەی سێیەم:**

وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (٤٥)المائدة

﴿....هەرکەسێکیش کار بەو یاسایانە نەکات کە خوا ناردوونیە خوارەوە، ئەوا ئەوانە ستەمکارن﴾.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەگەر تاوانەکە نەبووبێتە هۆی برینێك، گۆشت و پێستەکەی هەتا سەر ئێسقان هەڵدڕیبێت، تەنها شکان بێت لە ئێسکەکانی قۆڵ و دەست و مەچەك و پەراسووەکان، ئەوە تۆڵەکردنەوەی جەستەیی لەسەر نیە، لەبەرئەوەی نازانی شکاوەکە چۆن شکاوە، بەلاّم بە ڕێککەوتنی ماڵی، تۆڵەکەی بەسەردا دەسەپێنرێت.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەگەر هاتوو تاوانەکە ببوە هۆی برینێك گەیشتبوە سەر ئێسقان، ئەوا تۆڵە لە جەستەی دەستدرێژکەرەکە دەکرێتەوە، بە ئەندازەی ئەوبرینەی کە لەسەر جەستەی بریندارەکە دروستی کردووە، جا ئەو برینە لەهەر شوێنێکدا بێت، لە سەر، یان ڕوومەت، یان مل، یان دەست، یان قاچ.

**بڕگەی پێنجەم:**

ئەگەر برینێك گەیبێتە سەر ئێسقان و ئێسکەکەی ورد بووبێت، یا پارچەی لێ هەڵبووبێت، یان مۆخەکەی دەرکەوتبێت، ئەوا تۆڵەکردنەوەی جەستەیی لەسەر نیە، چونکە ناتوانرێت بەهەمان شێوە ئەو برینە لە جەستەی تاوانبارەکە بکرێتەوە، بۆیە بە سزای ماڵی سزا دەدرێت.

**بڕگەی شەشەم:**

ئەگەر کەسێك دەست یان قاچ یان گوێ یان لووت یان پەنجە یان هەر ئەندامێکی کەسێکی تری بڕی و لێی کردەوە، ئەوا لە تۆڵەیدا هەمان ئەندامی جەستەی ئەوکەسە دەبڕدرێت.

**بڕگەی حەوتەم:** ئەگەر کەسێك لە کێشەیەکدا بوو بە شەڕی، دەستی کەسێکی لێکردەوە و کەسێکی تریشی کوشت، ئەوا ئەو کەسە دەگیرێت و سەرەتا تۆڵەی دەستە براوەکەی لێ دەکرێتەوە و هەمان دەستی دەبڕدرێتەوە، ئینجا ئامادە دەبێت بۆئەوەی سزای کوشتنەکەش بداتەوە بەوەی دەبێت بکوژرێتەوە.

## كەڵك وەرگرتن لەتۆڵە وەرگرتنەوە

## (حەقە خوێنەكان)

### بڕگەی یەكەم:

خوا دەفەرموێت:

وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاْ أُولِيْ الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٧٩)البقرة

﴿ئەی خاوەن بیروهۆشەكان، لەیاسای تۆڵەكردنەوەشدا(بەردەوامی و خۆشی) ژیانتان بۆ هەیە، (بەو هیوایەی) بەڵكو لەخوا دەترسێن و خۆتان دەپارێزن (لە یەكتر كوشتن)﴾.

(خوا مەبەستی لەوەیە كە لە تۆڵەسەندنەوەدا بەردەوامی و خۆشی ژیان هەیە، چونكە پیاوكوژەكە ئەگەر بزانێت لە تۆڵەی ئەم كارەیدا دەكوژرێتەوە، ئەوا وازدێنێت لە ئەنجامدانی كارەكەی و، ژیانی خۆی دەكڕێتەوەو تووشی ئەوە نابێت كە تۆڵەی لێ وەربگیرێتەوەو بكوژرێتەوە).

### بڕگەی دووەم:

حەقە خوێنی كەسێكی كوژراو، وەكو میراتەكەی وایە، بەپێی یاساكانی میرات بەسەر میراتگرەكاندا دابەش دەكرێت.

### بڕگەی سێیەم:

بۆ نەبوونی زیادەڕەوی لە تۆڵە وەرگرتنەوەكەدا، پێویستە دەسەڵاتداری ناوچەكە ئامادە بێت و، دوو شاهیدیش ئامادەی تۆڵە وەرگرتنەوەكە بن.

### بڕگەی چوارەم:

لە تۆڵەكردنەوەی كەسێكی ستەم لێكراودا خوا دەفەرموێ:

وَلا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَمَنْ قُتِلَ مَظْلُوماً فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَاناً فَلا يُسْرِفْ فِي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنصُوراً (٣٣)الاسراء

﴿ئەو دەروونەش مەكوژن كە خوا قەدەغەی كردووە، مەگەر مافێكتان بەسەریەوە هەبێت (كە شایستەی ئەوەبێت بیكوژن)، هەركەسێكیش ستەم

لێكراوێك بكوژێت، ئەوا ئێمە بەڵگەو دەسەلاٌتێك دەدەین بە كەس‌وكارەكەی (بۆئەوەی تۆڵەی بكاتەوە)، جا با لە كوشتنەوەی پیاوكوژەكەدا زیادەڕەوی نەكات، بەڕاستی ئەو كەسەی كە تۆڵەی كوژرانی ستەم لێكراوێك دەكاتەوە، لەلایەن خواوە پشتیوانی لێكراوە﴾.

بڕگەی پێنجەم:

ئافرەتی زگ پڕ، ئەگەر كەسێكی كوشت، ئەوا تۆڵەی لێ ناكرێتەوە هەتا منداڵەكەی دەبێت، پاشان لە تۆڵەی كوشتنەكەدا دەكوژرێتەوە.

بڕگەی شەشەم:

كوشتن سێ جۆرە:

یەكەم: بە هەڵەو بەبێ نیاز، ئەوە كوشتنەوەی لەسەرنیە، وەكو ئەوەی تیرێك بۆ باڵندەیەك بهاوێت بە كەسێك بكەوێت‌و بیكوژێت، دەبێت حەقەخوێنەكەی بدرێت‌و بەندەیەكیش لە پێناوی خوادا ئازاد بكرێت.

دووەم: ئەگەر هات‌و مەبەستی لێدانەكە كوشتنی كەسەكە نەبووبێت، ئەوا دەبێت حەقەخوێنەكەی بدرێت‌و بەندەیەكیش لە پێناوی خوادا ئازاد بكرێت.

سێیەم: ئەگەر كەسێك: عەمدی كەسێكی كوشت، ئەوا یەكسەر دەكوژرێتەوە، لەو میراتەش كە لەدوای جێدەمێنێ بەندەیەكی پێ ئازاد دەكرێت.

بڕگەی حەوتەم:

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (كوژراوێك بە هەڵە، وەكو ئەوەی بە نیمچە ئەنقەست كوژرابێت بە قامچی یان بە گۆچان، خوێنەكەی سەد حوشترە، چل لەو حوشترانە دەبێت ئاوس بن).(٢٦١)

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ خەڵكی یەمەنی نووسیی: (حەقە خوێنی ئادەمیزادێك سەد حوشترە، بۆ خاوەن زێڕەكانیش هەزار مسقاڵەو بۆ خاوەن پارەكانیش، دوازدە هەزار درهەمە.).(٢٦٢)

بڕگەی هەشتەم:

کوژراوێك لە پەیڕەوانی ئاینی مەسیحیو ئاینی جوولەکە، کە بە هەڵە لەلایەن موسوڵمانێکەوە بکوژرێن، سێیەکی حەقەخوێنی کەسێکی موسوڵمانە، دەکەوێتە ئەستۆی بکوژەکەوە.

**بڕگەی نۆیەم:**

کوژراوێك لە بت پەرستەکان یان ئاگر پەرستێك کە لەئارامیدا بێت لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامیدا، بە هەڵە لەلایەن موسوڵمانێکەوە کوژرابێت، ئەوە حەقە خوێنەکەی دوو لەسەر سێی دەیەکی خوێنی کەسێکی موسوڵمانە.

**بڕگەی دەیەم:**

کەسێك کە ئایینی ئیسلامی نەگەیەنرابێتیو لەلایەن کەسێکی موسوڵمانەوە بە هەڵە بکوژرێت، حەقە خوێنەکەی وەکو حەقە خوێنی کەسێکی پەیڕەوانی ئایینەکەی خۆی وایە، ئەگەر حەقەخوێنی پەیڕەوانی ئایینەکەش نەزانرا، ئەوا حەقەخوێنێکی وەکو حەقەخوێنی کەسی مەجوسی دەدرێتێ.

**بڕگەی یازدە:**

حەقەخوێنی ئافرەتێکی موسڵمان کە بە نەزانی لەلایەن موسوڵمانێکی ترەوە کوژرابێت، نیوەی حەقە خوێنی پیاوێکی موسوڵمانە کە بە هەڵە کوژرابێت.

**بڕگەی دوازدە:**

ئەگەر منداڵێك لەسەربانێك بوو، بەهۆی هاواری کەسێکی گەورەوە شڵەژاو کەوتە خوارەوەو مرد، ئەوا خوێنی ئەو منداڵە لەسەر ئەوکەسەیە کە هاوارەکەی کردووە.

**بڕگەی سێزدە:**

ئەگەر ئافرەتێکی دووگیانیش لەلایەن کەسێکی دەسەڵاتدار بەهۆی لێپرسینەوەوە شڵەژا، ئەوەش بوو بەهۆی ئەوەی کۆرپەکەی لەبەربچێت، ئەوا ئەو دەسەڵاتدارە بەرپرسە لە لەدەستدانی ئەو کۆرپەیە.

**بڕگەی چواردە:**

کەسێك بەهۆی گیانەوەرێکی هەر کەسێکەوە، تووشی هەر کارەساتێك ببێت، ئەوە تۆڵەکان دەکەونە ئەستۆی خاوەن ئاژەڵەکەوە.

برگەی پازدە:

ئەگەر (دە) کەس بەردیان بە مەنجەنیق دەهاویشت، لەکاتی هاویشتنەکەدا بەردێك گەڕایەوەو یەکێکیانی کوشت، ئەوە خوێنی ئەو کەسە کوژراوە دەکرێت بە دە بەشەوە بەشێکیان لە ئەستۆی خۆیدایەو، نۆ بەشەکەی تریش دەکەوێتە ئەستۆی نۆکەسەکەی ترەوە.

برگەی شازدە:

حەقەخوێنی کۆرپەیەك لەنێو زگی دایکەکەیدا بمرێت بەهۆی شەڕکردنەوە، ئازادکردنی باشترین بەندە، یان باشترین کەنیزەکە.

(دوو ئافرەت لە هۆزی هوزەیل بەشەڕهاتن، یەکێکیان بەردێکی هاویشت بۆ ئەوەی تریان و خۆی و کۆرپەکەی ناو زگی کوشت، پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) بڕیاریدا حەقەخوێنی کۆرپەی ناو زگی ئافرەت، ئازادکردنی باشترین بەندە، یان باشترین کەنیزەکە). (٢٦٣)

هەروەها ئەگەر زەبرێك لە زگی ئافرەتێکی ئاوس درا، ئەوا پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکرێت:

یەکەم: ئەگەر ئاوساویەکە نیشتەوەو هیچ ڕووینەدا، ئەوا لەوانەیە باوبژ بووبێت لەنێو زگی ئافرەتەکەدا.

دووەم: ئەگەر لەدوای لێدانەکە پارچە گۆشتێك لەدامێنی ئافرەتەکەوە هاتە دەرەوە، ئەوا چوار ئافرەت تەماشای دەکەن، ئەگەر گۆشتەکە شێوەی ئادەمیزادی وەرگرتبێت، ئەوا ئازادکردنی باشترین بەندە یان باشترین کەنیزەکە پێویست دەبێت لەسەر ئەوکەسەی کە لە ئافرەتەکەی داوە.

سێیەم: ئەگەر لە دوای لێدانەکە سەرێك یان دوو سەرو دوو دەست و چەند قاچێك هاتنەدەرەوە، ئەوە تەنها یەك حوکمیان هەیە کە دەبێت ئەوکەسە یەکێك

له باشترینی کۆیلەکان یان کەنیزەکەکان ئازاد بکات، بەڵام ئەگەر دوو کۆرپە دەرپەڕینە دەرەوە، ئەوا حوکمەکە دەبێت بە دووجار، ئەگەر سێ کۆرپەش دەرپەڕینە دەرەوە، حوکمەکە دەبێت بە سێ جار.

**چوارەم:** ئەگەر لەگەڵ لێدانەکەشدا منداڵەکە دەرپەڕیە دەرەوەو دوای کەمێك مرد، ئەوا ئەوکەسەی لەئافرەتەکەی داوە، دەبێت یەکێك لەباشترینی کۆیلەکان یان کەنیزکەکان ئازاد بکات.

**پێنجەم:** ئەگەر لەگەڵ لێدانەکەشدا منداڵەکە دەرپەڕیە دەرەوەو لەنگەری گرت لە ژیانداو کەسێکی تر هات بۆ یارمەتیدانی شەرکەرەکەو کۆرپەکەی کوشت، ئەوا لەم بارەدا کەسی دووەم دەبێت تۆڵەی کوشتنەکەشی لێ بکرێتەوەو حەقە خوێنەکەش بەتەواوەتی بدات.

**بڕگەی حەڤدە:**

حەقەخوێنی برینەکانی سەرو دەموچاو بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

**یەکەم:** الموضحة: ئەوبرینەی کە گەیشتبێتە سەر ئێسقان، حەقە خوێنەکەی پێنج حوشترە، بۆ هەر برینێك.

**دووەم:** الهاشمە: برینێك ئێسکەکەی ورد بووبێت، حەقە خوێنەکەی دە حوشترە بۆ هەر برینێك.

سێیەم: المنقلە: ئەو برینەی کە وردە ئێسکەکانی بە دەرەوەبن، حەقە خوێنەکەی پازدە حوشترە.

چوارەم: المأمومە ئەو برینەی کە ئێسك و پێستی سەر دەبڕێت و دەگاتە بەرگی مێشك، حەقە خوێنەکەی سێ یەکی حەقە خوێنی کەسێکە بە ئەنقەست نەکوژرابێت.

**(پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بڕیاریدا حەقە خوێنی ئەو برینەی کە گەیشتۆتە بەرگی مێشك، سێیەکی حەقە خوێنی کەسێکە بە هەڵە کوژرابێت)**.(٢٦٤)

**بڕگەی هەژدە:**

حەقەخوێنی برینە سوکەکانی تری لەش، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

یەکەم: ئەو برینانەی قوڵ نین و نەگەیشتونە ناو جەستەی بریندارەکەوە، ئەوە دەبێت بڕیاریان لەسەر بدرێت، بەپێی برینەکان حەقەکە دیاری دەکرێت.

دووەم: ئەو برینانەی قوڵن و گەیشتونە ناو بۆشایی زگ، یان پشت، یان قوڕگ، ئەوە حەقە خوێنەکەیان سێ یەکی حەقە خوێنی کەسێکە بە ئەنقەست نەکوژرا بێت.

برگەی نۆزدە:

بۆ لەدەستدانی هەر چاوێك، هەقە خوێنەکەی پەنجا حوشترە، بەڵام ئەگەر چاوێك پێشتر بۆخۆی کوێر بووبێت و بەهۆی شەڕێکەوە چاوە کوێرەکەی لەدەستدا، ئەوە حەقە خوێنەکەی بیست‌وپێنج حوشترە، بەڵام ئەگەر چاوێك بەهۆی شەڕێکەوە خێل بێت یان بسوڕێت، ئەوە دەبێت بڕیاریان لەسەر بدرێت بۆ دیاریکردنی حەقە خوێنەکەیان.

برگەی بیست:

ئەگەر لە شەڕێکدا پێڵوی چاوێك تێداچوو، ئەوا حەقە خوێنەکەی بیست و پێنج حوشترە، بۆ هەر پێڵویەك.

برگەی بیست و یەك:

ئەگەر کەسێك لە شەڕێکدا برژانگەکانی لەدەستدان، ئەوا بڕیاردەدرێت بۆ دیاریکردنی حەقەخوێنی برژانگەکان، بەپێی کاریگەری نەمانی برژانگەکان لەسەر دیمەنی ئەوکەسە.

برگەی بیست‌ودوو:

حەقە خوێنی بڕین و فەوتانی هەر گوێچکەیەك، پەنجا حوشترە.

برگەی بیست و سێ:

ئەگەر کەسێك لە شەڕێکدا هەستی بیستنی لەدەستدا، ئەوا حەقە خوێنەکەی پەنجا حوشترە، ئەم حەقە سەربەخۆیەو پەیوەندی بە بڕینی گوێچکەکانەوە

نیه. ئەگەر سستەمی بیستنەکەشی لاواز بوو، ئەوا بە ئەندازەی لاوازبوونەکە حەقەخوێنەکە دیاری دەکرێت.

### بڕگەی بیست و چوار:

بڕینی لووت هەقە خوێنی تەواوی هەیە، بەڵام ئەگەر بەشێکی نەرمایی لووتەکە بڕدرابێت، ئەوە لە حەقە خوێنەکەدا تەنها حەقی ئەو ئەندازەیەی دەکەوێت کە بڕدراوە، لەدەستدانی هەستی بۆن کردنیش، حەقەخوێنی تەواوی هەیە، وەکو حەقە خوێنی کەسێك کە بە هەڵە کوژرابێت، بەڵام ئەگەر هەستی بۆن کردنەکە تەنها لە کونە لوتێکدا لەدەست درابێت، ئەوە نیو حەقە خوێنی هەیە.

### بڕگەی بیست و پێنج:

ئەگەر کەسێك زەبرێکی لەسەری کەسێکی تر داو، بەهۆیەوە عەقڵی تێکچوو، ئەوا حەقە خوێنەکەی بەتەواوی دەدرێتێ، وەکو حەقەخوێنی کەسێك کە بەهەڵە کوژرابێت.

### بڕگەی بیست و شەش:

لەدەستدانی لێوەکان، هەر یەکەیان حەقە خوێنەکەی نیوەی حەقەخوێنی کەسێکە کە بەهەڵە کوژرابێت.

### بڕگەی بیست و حەوت:

لەدەستدانی زمان، ئەگەر کەسێك زمانەکەی لەدەستداو نەیتوانی قسەی پێ بکات، ئەوە هەقە خوێنی تەواوی دەدرێتێ، وەکو حەقەخوێنی کەسێکی بە هەڵە کوژراو، بەڵام ئەگەر هاتوو زمانەکە هەمووی بەرنەکەوتبوو، ئەوا پەیڕەوی زمانی قسەکردنی ئەوکەسە دەکرێت، بەوەی حەقە خوێنەکە دابەشی پیتەکان دەکرێت و حەقی ئەو پیتانەی دەدرێتێ کە زمانەکەی ناتوانێت دەریان بڕێت، بۆنموونە: زمانی عەرەبی بیست وهەشت پیتە، سەد حوشتری حەقە خوێنی زمانەکە دابەشی بیست وهەشت پیتەکە دەکرێت، جا هەر پیتەی چەندی بەرکەوت، ئەوە حەقە خوێنی ئەو پیتەیە، بەم پێیە ئەوکەسە چەند پیتی لە

دەستداوە، حەقی ئەوەندە پیتەی دەکەوێت، جا ئەگەر دوای ماوەیەك زمانەکە ڕوایەوە، ئەوە بە هیچ شێوەیەك حەقی زمانەکە ڕەت ناکرێتەوە، بەلاّم ئەگەر ڕووانەوەکە ببێتە هۆی ئەوەی بتوانێت هێندێك لەو پیتانە بلێت کە پێشتر نەیتوانیوە بیانلێت، ئەوە هەقی ئەو پیتانەی لیٚ وەردەگیرێتەوە.

**بڕگەی بیست و هەشت:**

ئەگەر کەسێك بەهۆی زمان بڕینیەوە هەستی تام کردنی لە دەستدا، ئەوە حەقە خوێنێکی تەواوی دەکەوێت، وەکو حەقە خوێنی کەسێکی کوژراو بە هەڵە، ئەم حەقەش سەربەخۆیەو پەیوەندی بە حەقی بڕینی زمانەوە نیە.

**بڕگەی بیست ونۆ:**

ئەگەر زمانی لاڵێك ببڕدرێت، ئەوا وەکو بڕینی زمان حەقی ناکەوێت، بەلاّم مادام ببێتە هۆی لە دەستدانی هەستی تام کردن، ئەوا حەقە خوێنێکی تەواوی دەدرێتیٚ، وەکو حەقە خوێنی ئەو کەسەی بە هەڵە کوژرابێت.

**بڕگەی سی:**

حەقە خوێنی فەوتانی هەر ددانێك پێنج سەر حوشترە، ئەگەر هەر سی ودوو ددانەکەی کەسێك هەڵکێشران، ئەوا حەقە خوێنەکەی دەبێت بە سەدو شەست حوشتر، بەلاّم ئەگەر ددانەکە هەلوەریبێت، ئەوە حەقەکەی بە ئەندازەی شکانەکەی دەبێت، ئەگەر بەهۆی لێدانیشەوە ددانێك ڕەش یان سور ببێت، ئەوە پێویستی بەوە هەیە حوکم لەسەر ڕێژەی حەقە خوێنەکە بدرێت، ئەگەر ددانی منداڵێکیش هەڵکێشرا، ئەوە حەقەخوێنی نیە، چونکە پاش ساڵێك دەڕوێتەوە، ئەگەر هات و نەشڕوایەوە، ئەوە حەقە خوێنەکەی دەکەوێت.

**بڕگەی سی ویەك:**

ئەگەر شەویلکەکان بە ددانەکانەوە هەڵکەندران، ئەوا شەویلکەکان سەربەخۆن، حەقە خوێنی تەواوی خۆیان هەیە، بە هەردووك شەویلکەکە حەقە خوێنی کەسێکی بە هەڵە کوژراویان هەیە.

**بڕگەی سی ودوو:**

**حەقەخوێنی بڕینی هەر دەستێك، پەنجا سەر حوشترە، دەستێکیش کە بە هۆی شەڕەوە توشی ئیفلیجی بووبێت، هەمان حەقەخوێنی دەستی بڕدراوەی هەیە.**

**بڕگەی سی وسێ:**

**هەر پەنجەیەك حەقە خوێنەکەی دە حوشترە، هەر پەنجیەکیش بەهۆی لێدانێکەوە تووشی ئیفلیجی بووبێت، هەقە خوێنەکەی وەکو حەقەخوێنی پەنجەیەکی بڕاوە وەهایە.**

**بڕگەی سی وچوار:**

**بڕینەوەی هەرقاچێك، یان تووشبوونی بە ئیفلیجی بەهۆی لێدانێکەوە، ئەوا حەقە خوێنەکەی پەنجا حوشترە.**

**بڕگەی سی و پێنج:**

**هەقە خوێنی لەدەستدانی تۆپەی سمتەکان، بۆ هەریەکێکیان پەنجا حوشترە.**

**بڕگەی سی و شەش:**

**حەقە خوێنی شکانی بڕبڕەی پشت، بەهۆی شکستی کەسەکەوە دیاری دەکرێت، ئەگەر بە تەواوی نەیتوانی بڕوات، ئەوا حەقە خوێنەکە سەد حوشترە، وەکو حەقە خوێنێکی بە هەڵە کوژراو.**

**بڕگەی سی و حەوت:**

**بڕینی ئەندامی نێرینەی نێرینەیەك، پیر بێت یان گەنج، حەقە خوێنەکەی سەد حوشترە.**

**بڕگەی سی و هەشت:**

**بڕینی یەکێك لە لێوارەکانی عەورەتی ئافرەت، حەقە خوێنەکەی پەنجا حوشترە.**

**بڕگەی سی ونۆ:**

**بڕینی هەر مەمکێکی ئافرەت، حەقە خوێنەکەی پەنجا حوشترە.**

**بڕگەی چل:**

بڕینی هەر گونێك یان هەڵکەندنی، هەقە خوێنەکەی پەنجا حوشترە.

**بڕگەی چل ویەك:**

ئەگەر پیاوێك بەهۆی کارێکی داوێنپیسیەوە پەردەی کچێنی مێینەیەکی دڕاند، ئەوە حەقە خوێنی ئەو پەردە دڕانە، سەد حوشترە، بەڵام ئەم پەردە دڕاندنە لەنێوان ژن و مێرددا ناکەوێتە بەر حوکمی ئەو یاسایە.

**بڕگەی چل ودوو:**

ئەگەر ئافرەتێکی کۆیلەی دووگیان، بەهۆی لێدانیەوە لەلایەن ئافرەتێکی کۆیلەی ترەوە، زگەکەی لە دەستدا، ئەوا حەقەخوێنی ئەو منداڵە مردووە، دەیەکی نرخی دایکیەتی.

**بڕگەی چل و سێ:**

ئەگەر کەسێك خۆی کوشت، یان خۆی دەرمانداو کرد، یان لەشوێنێکی بەرزەوە خۆی هەڵدێراند، هیچ حەقە خوێنێکی ناکەوێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (کەسێك خۆی کوشتبێت بە پارچە ئاسنێك، ئەوا پارچە ئاسنەکە بە دەستیەوەیەتی لە زگی دەدرێت لە ئاگری جەهەنەدەمدا بۆ هەتاهەتایی بەنەمری تێیدا دەمێنێتەوە، کەسێکیش ژەهرێکی خواردەوەو خۆی کوشت، ئەوە ئەو کەسە لە ئاگری جەهەندەمدا ئەو ژەهرە فڕدەکات و بە نەمری تێیدا دمێنێتەوە بۆ هەتاهەتایی، کەسێکیش لە شاخێك خۆی هەڵدێرابیٚ و خۆی کوشتبێت، ئەوا هەڵدەدێرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، بە نەمری تیایدا دەمێنێتەوە بۆ هەتاهەتایی). (٢٦٥)

## خزمە نزیکەکان‌و ئەو حەقانەی دەکەوێتە سەرشانیان

ئەم یاسایە بۆ ئەوەیە خەڵکە ژیرەکە بخرێنە نێو ڕووداوەکانەوە بۆئەوەی کێشەیەك کە جارێك ڕویدا جارێکی تر ڕوونەداتەوە.

**بڕگەی یەکەم:**

کوشتنی کەسێکی سەربەست بە هەڵە، حەقەخوێنەکەی دەکەوێتە ئەستۆی خزمە نزیکەکانی بکوژەکە، بە مەرجێك لەسەر یەك ئایین بن.

**بڕگەی دووەم:**

کەسێك بە هەڵە خۆی بکوژێت، حەقەخوێنی نیەو خزمەکانیشی تێوە ناگلێن.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەگەر کەسێکی جوولەکە خزم‌وکەسەکانی هەموو جوولەکە بوون، تیرێکی هاویشت‌و بەر کەسێك کەوت‌و مرد، دواتر کەسە جوولەکەکە هاتەسەر ئایینی ئیسلام، ئەوا ئەو کەسە ئەو مافەی لەسەر لاناچێت‌و دەبێت هەقە خوێنەکە بۆخۆی بیدات، خزمە جوولەکەکانیشی لەم کێشەیەوە ناگلێن.

**بڕگەی چوارەم:**

مندال‌و سەرلێشێواوو ئافرەت، نایەنە ڕیزی خزمە نزیکەکانەوە بۆ بەخشینی هیچ حەقە خوێنێك.

**بڕگەی پێنجەم:**

پیاوێکی پیر، کە نەتەپیبێت، یان نەخۆشێك کە نەکەوتبێتە ناو جێگاوە، دەکرێت لە خزمە نزیکەکان دابنرێن لەچارەسەری کێشەی بەخشینی حەقە خوێنێك، لەبەرئەوەی ئەوانە بە خەڵکانی پشتیوانیکەر دادەنرێن بەو ڕێوشوێنە چاکانەی کە دایان دەڕێژن.

**بڕگەی شەشەم:**

خەڵکانی فەقیر ناخرێنە ڕیزی ئەوخزمە نزیکانەوە کە حەقە خوێنی کەسێکیان دەکەوێتە ئەستۆوە.

**بڕگەی حەوتەم:**

**ئەگەر دادوەر ویستی حەقە خوێنەکە بەسەر خزمەنزیکەکاندا دابەش بکات، ئەوا سەرەتا لە نزیکترینیانەوە دەست پێدەکات.**

**بڕگەی هەشتەم:**

**ئەگەر ئەندامانی بەرەبابێك بەشی ئەوەیان نەدەکرد هەموو حەقە خوێنەکە کۆکەنەوە، ئەوە خزمە دوورەکانی تر دێنەناوەوە، لەگەڵ پەیڕەوی کردنی شوێنەکانیان، ئەوانەی شوێنیان نزیکترە پێشتر دەخرێنە ناو بەخشینی هەقە خوێنەکەوە.**

## ڕووبەڕووبوونەوەی خراپەکارەکان

**بڕگەی یەکەم:**

**(پێغەمبەر** (صلى الله عليه وسلم) **فەرموویەتی: هەرکەسێك دژ بە ئێمە چەك هەڵگرێت، ئەوە لە ئێمە نیە).** (٢٦٦)

**بڕگەی دووەم:**

وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ (٩)**الحجرات**

**﴿ئەگەر دوو دەستەش لە خاوەنباوەڕەکان دژ بەیەکتر بە شەڕ هاتن، ئەوا ئێوە نێوانەکەیان چاك بکەنەوە، جا ئەگەر یەکێکیان(گوێی نەدایەو) لەسەر دەستدرێژی کردن بۆسەر ئەوەی تریان بەردەوام بوو، ئەوا ئێوە(لەگەڵ دەستەکەی تردا) دژی ئەوەیان بجەنگن کە لە دەستدرێژی کردن بەردەوامە هەتا بۆلای فەرمانی خوا دەگەڕێتەوە، جا هەرکاتێك گەڕایەوە، ئەوا ئێوە بە ڕێكوپێکی ئاشتیان بکەنەوەو دادوەری بکەن لە نێوانیاندا، بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کە پەیڕەوی دادوەری دەکەن﴾.**

**بڕگەی سێیەم:**

بریندارى لایەنى دوژمن، سوکایەتى پىَ ناکرێت و ناشکوژرێت.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەسیرى شەڕ ناکوژرێت و، لیَى نادرێت و، سوکایەتى پیَ ناکرێت.

**بڕگەی پێنجەم:**

ژن و منداڵ و پیرەکانیان ناکوژرێن.

**بڕگەی شەشەم:**

نابێت بە ئاگرو مەنجەنیق شەڕیان لەگەڵدا بکرێت.

**بڕگەی حەوتەم:**

ماڵ و سامانیان بەتاڵان نابرێت.

## سزای داوێنپیسی

**بڕگەی یەکەم:**

ئەگەر نێرو مێیەك بەبىَ پەیوەندیى ژن و مێردایەتى کارى جووتبونیان کرد، ئەوە ئەوکارە پێی دەگوترێت: داوێنپیسى، دەردێکى کوشندەى ناو کۆمەڵگایە، بۆیە پەروەردگار سنووردارى کردووەو، لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وَلا تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً (٣٢)الاسراء

﴿نزیکى داوێنپیسیش مەکەونەوە، بەڕاستى ئەو کارە کارێکى ناشیرین و ڕێبازێکى خراپە﴾.

**بڕگەی دووەم:**

ئەگەر نێرینەیەك بۆخۆی بە دەم دانى پێدا نا، کە داوێنپیسى کردووە، ئەوە حوکمەکەی بەسەردا دەدرێت، بەڵام ئەگەر مێیینەیەك کارێکى واى کرد حوکمەکەی دوادەخرێت تا بزانرێت دووگیانە یان نا، جا کە دووگیان بوو، ئەوا حوکمەکە دوادەخرێت بۆ دواى منداڵبوونەکە، ئەگەر کەسیشى نەبوو منداڵەکە

بـەخێو بكـات، ئـەوا حوكمەكـە دوادەخرێـت بـۆ دوو سـاڵی شـیرخواردنەكەو پەروەردەكردنی.

**بڕگەی سێیەم:**

الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ...(٢ النور)

﴿ئەوانەی كاری داوێنپیسی دەكەن لە مێینەكان و لە نێرینەكان، جا هەریەكێك لەوان سەد شواڕكیان لێدەن﴾.

ئەگەر ئەو نێرو مێیـەی كـاری داوێنپیسـیان ئەنجامـدا، كوڕو كچ بوون و یەكەم جار بوو لە تەمەنیاندا ئەو جووتبوونـە ئەنجام بدەن، ئەوا سـزاكەیان، پشـتیان پـێ ڕووت دەكرێـت و، بە بەرچاوی خەڵكەوە سەد شـواڕكیان لێـدەدرێت و لێـك دوور دەخرێنـەوە هەریەكـەیان بـۆ شـوێنێك، كـەس و كارەكەشـیان بۆیـان نیـە سنوورەكانی خوا ببـەزێنن و بیـانكوژن، ئەگـەر چەندجاریش داوێنپیسـیەكەیان دووبارە ببێتەوە، ئەوا سزاكەیان هەر سەد شواڕكەو، سزای ڕەجمیـان بەسـەردا نادرێت، مادام كوڕەكە ژنی نەهێنابێت و كچەكەش شووی نەكردبێت.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەگەر ژنێكی خاوەن مێرد، لەگەڵ پیاوێكی خاوەن ژن، داوێنپیسـیان ئەنجامـدا، حوكمەكەیان ڕەجم كردنە هەتا مردن، دەخرێنە چاڵێكەوەو بەرد باران دەكـرێن، هـەتا مـردن، یاسـای ڕەجـم كـردن، یەكێكـە لـە یاسا زگماكـەكان، لـە بنەڕەتـەوە سەپێنراوە، تەنانەت نەتەوەی مەیمونەكانیش پەیڕەوی دەكەن.

**بڕگەی پێنجەم:**

ئەگـەر یـەكێك ژن و پیـاوێكی ببینـی بـە ڕووتـی، كـاری داوێنپیسـیان دەكـرد، بەشێوەیەك خەنجەرەكە لەنێو كالانەكەدا بوو، ئەوە ئەو پیاوە بۆی نیە لێیان لـە هەڵادات و خەبەرەكـە بڵاوبكاتـەوە، هـەتا چـوار شـاهید نـەهێنێت، جا كـە چـوار شـاهیدەكە شـاهیدیاندا، ئـەوا حـوكمی ڕەجـم كـردن بەسـەریاندا دەسـەپێنرێت، بــەڵام پێویســتە شــاهیدەكان هــەموو ئــەو وردەكاریانــە ڕوون بكەنــەوە كــە

پەیوەندیان بە ئەنجامدانی داوێنپیسیەکەوە هەیە: بۆنموونە: دەبێت هەردووك داوێنپیسەکە بناسرێن و، ڕووداوەکە بەچاوی خۆیان ببینن کە خەنجەرەکە لەنێو کالانەکەدا بووە، جا کە هاتوو سیّ لە شاهیدەکان ئەو شاهیدیەیان دا، بەلاّم شاهیدی چوارەم، بێدەنگ بوو لەوەی کە خەنجەرەکە لە کالانەکەیدا بووبێت، ئەوا سزادانەکە جێبەجیّ ناکرێت، ئەگەر شاهیدەکانیش باسی ئەو وردەکاریە نەکەن، ئەوا پێویستە دادوەرەکە لێیان بپرسێت و لێکۆلینەوەیان لەگەلّ بکات، ئەگەر یەکێك لەو چوارشاهیدانەش پێش ئەم لێکۆلّینەوەو وردەکاریانە بمرێت، ئەوا سزادانەکە ڕادەگیرێت، لەم بارەدا شاهیدەکانی تریش بە درۆ ناهێنرێنەوەو سزادانیان لەسەر نیە، یان ئەگەر قسەی شاهیدەکان تێکیان نەکردەوە، یەکیان گوتی: من لەو سوچەی ژوورەکەدا بینیومن و، ئەوەی تریان گوتی: من لەو سوچەی تردا بینیومن و، ئەوەی تریان گوتی: من لەسەر تەختەکە بینیومن و، چوارەمیان گوتی: من لە ناوەڕاستی ژورەکەدا بینیومن، ئەوا سزادانەکە جێبەجیّ ناکرێت، ئەوەی مەبەستە دەبێت قسەی شاهیدەکان تێك بکاتەوە، پێویستە ئەوەش ڕوون بکرێتەوە لەلایەن شاهیدەکانەوە کە ئافرەتەکە لە بارێکی وادابووە بە زۆر ئەم کارەی پێکراوە یان خۆی مەیلی لێبووە، چونکە ئەگەر ئافرەتەکە بە مەیلی خۆی نەبووبێت و بە زۆرەملیّ ئەم کارەی لەگەلّ کرابێت، ئەوا لە سزادانەکە دەردەچێت و، تەنها پیاوەکە دەکەوێتە بەر زەبری سزاکە، تەنانەت ئەگەر سیّ شاهید شاهیدی بدەن کە ئافرەتەکە بە ئارەزووی خۆی بووەو، شاهیدی چوارەم بلّێت من وام بینی ئافرەتەکە ناڕازی بوو بەم کارە، ئەوا سزاکە ناسەپێنرێت.

ئەگەر چوار شاهیدیش دەست نەکەوت، ئەوا ئەو کەسەی هەواڵەکەی بلاّوکردەوە، سزای هەشتا شواڕکی لێدەن، هەروەك پەروەردگار دەفەرموێت:

وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ (٤)النور

﴿ئەو کەسانەش کە ئافرەتە پاکەکان لەکەدار دەکەن، جا چوار شاهید ناهێنن (بۆ ڕاستی ڕووداوەکە)، ئەوانە دارکاری بکەن بە لێدانی هەشتا شوارِكو، بۆ هەتاهەتایش شاهیدیان لیٚ قبوولٚ مەکەن، (لە ڕاستیشدا) ئەوانە لادەرن لەسەر بەرنامەی پەروەردگار﴾.

دانانی ئەم چوار شاهیدە، زیاتر بۆئەوەیە کاری داوێنپیسی نەکەوێتە سەرزاری خەڵك‌و داوێنپیسەکان دەستنیشان نەکرێن، چونکە دەستنیشان کردنیان زیاتر دەردەکە لەنێو کۆمەڵدا بڵاودەکاتەوە، هەروەها بۆئەوەی داوێنپیسی ئەگەر کراش وا بە ئاشکرا نەکرێت بە ئاسانی لە یەککاتدا چوارکەس بتوانن بیبینن، لەبەرئەوەی دەردێکی کوشندەیە کۆمەڵگا لەبەر یەك هەڵدەوەشێنێت، بۆیە خوا ئەو فەرمانەی داوە، ئەگەر داوێنپیسیەکە ئەوەندە بە بەرەڵایی کرا، تۆ بتوانیت چوار شاهید بێنی بیبینن، ئەوا بۆت هەیە هەواڵەکە بڵاو بکەیتەوە، دەنا هەواڵەکە لەلای خۆت بپارێزەو، خواش لە دواڕۆژدا تۆڵەی خۆی لە داوێنپیسەکان دەکاتەوە، ئەگەر بەبیٚ چوار شاهیدیش هەواڵەکە بڵاوبکەیتەوە ئەوە تووشی سزای هەشتا شوارکی دەبیت.

**بڕگەی شەشەم:**

خوا مزگێنی دەدات بە داوێنپیسەکان‌و، دڵنیایان دەکاتەوە کە پیاوێك داوێپیسی کردبێت، ئەوا ژنەکەشی هەر کردوویەتی.

الزَّانِي لا يَنكِحُ إلاَّ زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لا يَنكِحُهَا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ (٣)النور

﴿....پیاوی داوێن پیس مارەیی ژنێك نابڕێت، مەگەر ئەو ژنە داوێنپیس بێت، یان بێباوەڕ بێت بە خوا، ئافرەتی داوێنپیسیش شوو ناکات بە پیاوێك، مەگەر ئەو پیاوە داوێنپیس بێت یان بێباوەڕ بێت بە خوا، ئەو کردەوەیەش لەسەر خاوەنباوەڕەکان قەدەغە کراوە﴾.

**بڕگەی حەوتەم:**

پیاوێك ئەگەر بە چاوی خۆی کەسێکی بەسەر ژنەکەیەوە بینی، ئەوا ئەگەر ئەو کەسەی کوشت، هیچ خوێنێکی ناکەوێتە ئەستۆ، بەڵام بۆی نیە ئافرەتەکەی خۆی بکوژێت، جا ئەگەر هاتوو پیاوەکە شکاتی کرد لای گەورەی موسوڵمانان کە ژنەکەی خۆی بە چاوی خۆی بینیوە، ئەوا گەورەی موسوڵمانان پیاوەکە بەم شێوەیە سوێند دەدات:

وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ (٦)النور

﴿ئەوانەش بە کرداری داوێنپیسی هاوسەرەکانی خۆیان تاوانبار دەکەن و لەخۆیان زیاتر هیچ شاهیدێکی تریان نیە، جا شایەدیدانی هەریەکێك لەوان ئەوەیە چوارجار سوێند بخوات بە خوا بەوەی کە ئەو لە ڕاستگۆکانە(**کە دەڵێت ژنەکەم داوێنپیسی کردووەو بەچاوی خۆی دیتوویەتی**)..﴾.

وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ (٧)النور

﴿....سوێندی پێنجەمیش ئەوەیە کە بڵێت: نەفرینی خوام لەسەربێت ئەگەر لە درۆزنەکان بم﴾.

بۆ لابردنی تاوانەکەش لەسەر ژنەکە بەم شێوەیە سوێند دەدرێت:

وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ (٨)النور

﴿ئافرەتەکەش سزاکەی لەسەر لادەدرێت، ئەگەر چوارجار سوێند بخوات بەوەی کە(**مێردەکەی**) لە درۆزنەکانە﴾.

وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ (٩)النور

﴿.....سوێندی پێنجەمیش ئەوەیە کە(**ئافرەتەکە**) بڵێت: ڕق وقینی خوام لەسەربێ ئەگەرهاتوو(**مێردەکەم**) لە ڕاستگۆکان بێت﴾.

لەم بارەدا ژن و پیاوەکە لە یەکتری جیادەبنەوە، چونکە ناتوانن بەیەکەوە بژین، سزاکەی خواش جێگیرە لە دواڕۆژدا تاوانبار سزای خۆی وەردەگرێتەوە.

**بڕگەی هەشتەم:**

ئەگەر پیاوێك بە زۆرەملێ داوێنپیسی لەگەڵ ژنێك كردو، بەهۆیەوە ژنەكە دووگیان بوو، پاشان بەهۆی لەدایكبوونی منداڵەكەوە، ئافرەتەكە گیانی لە دەستدا، ئەوا حەقە خوێنی ئەو ئافرەتە دەكەوێتە ئەستۆی ئەو كەسەی داوێنپیسیەكەی لەگەڵدا كردووەو، حەقی بەخێوكردنی منداڵەكەش دەكەوێتە ئەستۆی هەمان ئەو كەسەوە كە باوكی منداڵەكەیە لە ڕێی داوێنپیسییەوە.

**بڕگەی نۆیەم:**

ئەو كۆرپەیەی بەهۆی داوێن پیسییەوە لە دایك دەبێت، هیچ تاوانێكی لەسەر نیەو، نابێت فڕێ بدرێت، یان بكوژرێت، یان سوكایەتی پێ بكرێت.

**بڕگەی دەیەم:**

ئەو كەسەی لە كۆمەوە جووت بوون لەگەڵ نێرینەیەك یان مێینەیەك بكات، سزاكەی ڕەجم كردنە.

**بڕگەی یازدە:**

ئەگەر دوو مێینە خەریكی یەكتری بوون، ئەوە وەكو كاری داوێن پیسیان ئەنجام دابێت وەهایە، بەڵام لەبەرئەوەی كردەوەكە پێداكردن نیە، سزاكەی لەژێر شوارك لێدانەوەیە، زیاتر سزای تەمبێ كردنە، گەورەكەی سزایەكی دەدات بۆئەوەی جارێكی تر كاری ئاوەها نەكاتەوە.

**بڕگەی دوازدە:**

ئەگەر كەنیزەیەك داوێنپیسی كرد، ئەوا سزاكەی شوارك لێدانە، چەند دووبارەی بكاتەوە سزاكەی هەر شوارك لێدانە، لەبەرئەوەی سزاو مافی كۆیلەكان نیوەی سزاو مافی كەسە سەربەستەكانە، سزای داوێنپیسی كەسێكی سەربەستی خاوەن ژن كوشتنە، كەواتە دەبێت سزای داوێنپیسی كەسێكی كۆیلەی خاوەن ژن، نیو كوشتن بێت، كوشتنیش بەش ناكرێت، بۆیە سزاكە لە سنووری شوارك لێداندا دەمێنێتەوە.

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر کەنیزەکی یەکێك لەئێوە داوێنپیسی کردو، دەرکەوت کە داوێنپیسی کردووە، ئەوا سزای شوارك لێدانی بەسەردادەن و، لۆمەش ناکرێن لەسەری، پاشان ئەگەر بۆ دووەم جار داوێنپیسی کردەوە، بەهەمان شێوە سزای شوارك لێدانی بەسەردا دەدرێت و لۆمەش ناکرێن لەسەری، ئەگەر بۆ جاری سێیەمیش داوێن پیسیەکەی ئەنجام دایەوە، ئەوا بیفرۆشن ئەگەر بە گوریسێکیش بێت لەموو دروستکرابێت).(٢٦٧)

برگەی سێزدە:

کەسێك کاری داوێنپیسی لەگەڵ ئاژەڵێکدا بکات، کە گۆشتەکەی بخورێت، ئەوا هەردووکیان دەکوژرێن، کەسەکە سزای ڕەجمی بەسەردا دەدریٚ و، ئاژەڵەکەش سەردەبڕدرێت و گۆشتەکەی دەخورێت. بەڵام ئەگەر داوێنپیسیەکە لەگەڵ ئاژەڵێکدا ئەنجام بدرێت کە گۆشتەکەی نەخورێت، ئەوا ئەوکەسە ناکوژرێت و دەکەوێتە بەر یاسای تەمبیٚ کردن، ئاژەڵەکەش ناکوژرێت.

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: هەر کەسێك داوێنپیسی لەگەڵ ئاژەڵێکدا ئەنجامدا، ئەوە خۆی و ئاژەڵەکەش بکوژن).(٢٦٨)

برگەی چواردە:

واپێویستە لە کاتی ئەنجامدانی سزاکاندا، کۆمەڵێك لە خاوەنباوەڕەکان ئامادەبن، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (٢)النور

﴿با دەستەیەکیش لە خاوەنباوەڕەکان ئامادەی سزادانەکەیان بن....﴾.

برگەی پازدە:

لە سزای شوارکەکاندا، هەموو جەستەی کەسەکە شوارك لێدان دەکرێت، تەنها دەموچاوی نەبێت، ئەگەر هات و ئاووهەواش زۆر سارد یان زۆر گەرم بوو، یان کەسەکە نەخۆش بوو، ئەوا گەورەی موسوڵمانان دەتوانێت سزادانەکە دوابخات بۆ کاتێکی دیاریکراو.

### بڕگەی شازدە:

ئەگەر هاتو سزای شوارك لێدانەكە بەسەر كەسێكدا بوو كە بەرگەی نەدەگرت، ئـەوا هـەر سـەد شـوارِكەكە بەیەكـەوە دەبەسـترێنەوەو لـە جەسـتەی كەسـەكە دەدرێن.

### بڕگەی حەڤدە:

ئەوانەی سزای سەد شواركیان بەسەردا دەسەپێت، گەورەی موسوڵمانان بۆی هەیە دوای سزادانەكەیان ماوەیەك دووریان بخاتەوە لەو ناوچەیە، كە لە ساڵێك زیاتر نەبێت، بۆ ئەوشوێنەی كە بۆی دەستنیشـان دەكرێت، لەلایـەن پێشـەوای موسـوڵمانانەوە، مەبەسـتیش لـەم دوورخسـتنەوەیە سـزادانیەتی بۆئـەوەی جـارێكی تـر بـەلای ئـەم كـارەدا نەچـێتەوە، بـەڵام مێیینـە بـە تـەنها دوور ناخرێتەوە، ئەگەر كەسێكی نزیكی خۆی لەگەڵدا نەبێت.

### بڕگەی هەژدە:

كەسـێكی سەربەسـت تۆمـەت بـۆ یـەكێكی تـر هەڵبەسـتێتو نـەتوانێت بیسـەلمێنێت، ئـەوا هەشـتا شـواركی لـیَ دەدرێـت، بـەڵام ئەگـەر ئـەو كەسـە كۆیلەیەك بێت، ئەوا چل شواركی لیَ دەدرێت.

### بڕگەی نۆزدە:

هەر وتەیەك كە بە دەمدا بێتو تۆمەتبار كردن بێت بۆ كەسی بەرانبەر، وەكو ئەوەی بەیەكێك بگوترێت: هەی قوندەر، یان بگوترێـت: هـەی داوێنپیس، ئەوە ئەوكەسـە دەكەوێتـە بـەر سـزای شـوارك لێـدان، مەگـەر تۆمەتباركراوەكـە لێـی ببورێتو داوای مافەكەی نەكات، بەڵام ئەگەر دایكێك لە كاتی توڕەبووندا بە كوڕەكـەی بڵێـت، هـەی بیـژوو، ئـەوە ناكەوێتـە بـەر یاسـای تۆمـەتباركردن. تۆمـەتباركردنی كۆمـەڵێكیش كـاری پـیَ ناكرێـت، وەكـو ئـەوەی بڵێـی خـەڵكی بەغدا هەموویان داوێن پیسن، لێرەدا قسەكردنەكە دەچێتە قاڵبی درۆ كردنەوە، بۆ سزای درۆكردنەكەش پەیڕەوی سزای تەمبیَ كردن دەكرێت.

## بڕگەی بیست:

ئەگەر کەسێك بە ژنە داوێن پارێزەکەی بڵێت: هەی قەحبەی کچی قەحبە، ئەوە پێویستە دووجار بکەوێتە بەر یاسای شوارك لێدان، جارێکیان لەسەر ژنەکەیو، جارێکیش لەسەر خەسوەکەی.

## بڕگەی بیست و یەك:

یەکێك کەسێکی نادیار تۆمەتبار بکات، وەکو ئەوەی بگوترێت: جارێکیان پیاوێك داوێنپیسی کرد، ئەوە سزای لەسەر نیەو نابێت بەدواداچوونیش بکرێت، لە بارەی ناسینی ئەوکەسەوە کە داوێنپیسیەکەی کردووە، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ.... (١٠١)المائدة

﴿ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە پرسیار لە شتی وامەکەن کە ئەگەر ڕوون بکرێتەوە بۆئێوە خراپ بێت﴾.

(کەسێك لەپێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) پرسی: باوکم لە کوێیە؟ ئەویش فەرمووی لە دۆزەخە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕاستیەکەی گوت، بەڵام پیاوەکە دڵگران بوو، کەسێکی تر لەدوای پێویستکرنی حەج کردن لەسەر موسوڵمانان لەلایەن خواوە، پرسیاری کرد، ئایا ئێمە پێویستە هەموو ساڵێك حەج بکەین؟ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەڵامی نەدایەوە، پاشان پێیگوت: ئەگەر گوتبام بەڵێ، ئەوە بەدرێژایی تەمەنتان هەموو ساڵێك جارێك حەج کردندتان بەسەردا دەنووسرا، بۆیە پەروەردگار جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەم جۆرە پرسیارانە مەکەن. (تەفسیرەکانی(الطبری، القرطبی، البیضاوی)).

## سزاكانی دزی كردن

### بڕگەی یەكەم:

خوا دەفەرمویێت:

وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا... (٣٨)المائدة

﴿پیاوی دزو ژنی دزیش، دەستیان ببڕن، وەكو پەندێك لەلایەن خواوە، سزای ئەوەی كە بەدەستیان هێناوە،﴾.

### بڕگەی دووەم:

یاسای دەست بڕین بەسەر كەسێدا جێبەجێ دەكرێت كە موسوڵمانێكی كاملی خاوەن ژیری بێت ماڵێك بدزێت، بۆیە منداڵو شێتو سەرخۆش، یاساكە نایانگرێتەوە.

### بڕگەی سێیەم:

ئەوانەی بە ئاشكرا هەڵدەكوتنە سەر ماڵێكو بەزۆرەملێ دەیفڕێنن، ناكەونە بەر زەبری ئەم یاسایەوە، لەبەرئەوەی بواری گێڕانەوەی ماڵەكە لەبەر دەست دایەو دەتوانرێت بەپشتیوانی خەڵكو هێزی دەسەڵاتەوە ماڵەكەیان لێ بستێنرێتەوە.

(پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)فەرموویەتی: كەسێك بەبێ هیچ مافێك بەزۆرەملێ ماڵێك لە كەسێكی تر بستێنێ، ئەوە دەست بڕینی لەسەر نیە، هەركەسێكیش بە زۆرەملێ ماڵێكی ئاشكرای لە كەسێكی تر زەوت كرد، ئەو لەئێمە نیە).(٢٦٩)

### بڕگەی چوارەم:

ڕێژەی ماڵە دزراوەكە دەبێت بكاتە نرخی چارەگە مسقاڵێك زێڕ، ئەوسا یاساكە دەسەپێنرێت، واتە ئەگەر لە ڕۆژی دزی كردنەكەدا، زێڕ مسقاڵی بە (٢٠٠)هەزار دینار بوو، ئەوا پێویستە نرخی ماڵە دزراوەكە لە (٥٠)پەنجا هەزار دینار كەمتر نەبێت، بۆئەوەی كار بە یاسای دەست بڕین بكرێت.

(پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)دەستی دزێكی نەدەبڕی، ئەگەر نرخی ماڵە دزراوەكە لە چارەگە مسقاڵێك، یان زیاتر نەبایە).(٢٧٠)

## بڕگەی پێنجەم:

هەرماڵێك لەلایەن خاوەنەکەیەوە قایم کرابێت، بۆئەوەی دەستی خەڵکی تری نەگاتێ، ئەوا دزینی ئەوماڵە دەکەوێتە باری جێبەجێ کردنی یاسای دەست بڕینەوە، وەکو کەلوپەلی ناومالْ کە لەنێو ماڵەکەدا پارێزراون، یان وەکو کەلوپەلی بازرگانی کە لە دوکانەکانی ناو بازاڕو عەمبارو دەرمانخانەکان قوفلْ دراون، ئەوانە خاوەنەکانیان هۆکاری پاراستنیان بۆ داناون، بردنیان بەبێ ئاگاداری خاوەنەکانیان دەچێتە ڕیزی دزی کردنەوە.

## بڕگەی شەشەم:

بردنی دەرگای ماڵێك، کە بۆ پاراستنی ماڵەکە دانراوە، یان بردنی دەڕابەی دوکانێك، کە بۆپاراستنی دوکانەکە دانراوە، یان کۆمەڵەدارێك لەلایەن خاوەنەکەیەوە لەسەریەك دانراون و توند بەستراون، بردنیان بەبێ ئاگاداری خاوەنەکانیان دەچێتە ڕیزی دزی کردنەوە.

## بڕگەی حەوتەم:

ئەگەر کفنی مردوویەك لەگۆڕستانێکدا بدزرێت، ئەوە دەستی دزەکە دەبڕدرێت، لەبەرئەوەی مردووەکەش و کفنەکەش بۆ پاراستنیان خراونە گۆڕەوە.

## بڕگەی هەشتەم:

دزینی فەرشێك یان کۆمبارێك یان حەسیرێك یان پارچە قوماشێك کە کەسێکی لەسەر خەوتبێت، دەکەوێتە بەر یاسای دەست بڕین، لەبەرئەوەی بوونی کەسەکە لەسەر ڕایەخەکە وای لە ڕایەخەکە کردووە کە پارێزراو بێت.

## بڕگەی نۆیەم:

ئەگەر خاوەن پارەیەك پارەکانی لەبەر دەستیدا بوون و یەکێکی تر چاوی تێوەبڕین و خاوەن پارەکەی سەرقالْ کردو پارەکانی لێ دزی، ئەوا دەستەکە دەبڕدرێت.

**بڕگەی دەیەم:**

ئەگەر کەسێك خەوت و پارەکانی خستە باخەڵەکانیەوە یان لە شوێنێکی جەستەیدا قایمی کردن و، کەسێکی تر دەستی بۆ ئەو پارانە بردوو دزینی، ئەوا دەستی دزەکە دەبڕدرێت، بەڵام ئەگەر پارەکان دوور لە خۆیەوە دانرابوون لە پشتیەوە یان لە پێشیەوە، ئەوا دەستەکە نابڕدرێت، لەبەرئەوەی ماڵەکە لەلایەن خاوەنەکەیەوە قایم نەکراوە.

**بڕگەی یازدە:**

ئەگەر ئاژەڵێك شوانی هەبێت و ببردرێت، ئەوە دەکەوێتە قاڵبی دەست بڕینەوە، بەڵام ئەگەر ئاژەڵەکان بەرەڵابن و شوانیان نەبێت، ئەوا دەستەکە نابڕدرێت.

**بڕگەی دوازدە:**

هەر دزی کردنێك لە هەر شتێکدا بکرێت، شتەکە بۆ مەبەستی هەڵگرتن لەوێدا دانرابێت، وەکو قاسە بۆ پارەو، گۆزە بۆ هەڵگرتنی خۆراك، ئەوە دەستەکە دەبڕدرێت، بۆنموونە: بە دەست پێداکردنی و هێنانە دەرەوەی بڕێك لەوەی کە لە شوێنی هەڵگرتنەکەدایە، حوکمی دەستبڕینەکە دەسەپێنێت، ئەگەر بڕەکەش نەبات و بیخاتەوە شوێنی خۆی.

**بڕگەی سێزدە:**

ئەگەر باخەڵی کەسێك یان بەرگەکەی بەهۆی شتێکەوە دابدڕێنرێت و لە شوێنی ئەو دڕانەوە پارەکەی بەربێتەوەو بکەوێت، ئەوا ئەودەستەی کە دڕینەکەی ئەنجامداوە، دەبڕدرێت.

**بڕگەی چواردە:**

دزینی ئەو شتانەی کە لە ئیسلامدا قەدەغەن دەست بڕینیان لەسەر نیە، وەکو دزینی شەراب و عەرەق و بەراز.

**بڕگەی پازدە:**

دزینی پێکهاتەیەکی مزگەوتەکان، دەستی دزیکەرەکە دەبڕدرێت.

**بڕگەی شازدە:**

دزینی ماڵی دایك و باوك و باپیرو برا، دەستی دزیکەرەکە دەبڕدرێت.

**بڕگەی حەڤدە:**

دزی کردن لەلایەن کۆیلەو کەنیزەکەوە لە ماڵی خاوەنەکەیاندا، دەستیان نابڕدرێت، لەبەرئەوەی کۆیلەو کەنیزەك نیوەی ماف و ئەرکی کەسی سەربەستیان هەیە، بەڵام لە دزینی ماڵی خەڵکی تردا دەستیان دەبڕدرێت.

**بڕگەی هەژدە:**

دەستی ژن و مێرد نابڕدرێت لەسەر دەستبردن بۆ ماڵی یەکتری.

**بڕگەی نۆزدە:**

لە ساڵەکانی گرانیدا، لەسەر دزینی خواردن، دەستەکان نابڕدرێن.

**بڕگەی بیست:**

ئەگەر لە خانوویەکی بەکرێدا، خاوەن خانووەکە شتێکی لە خانووەکەی شاردبۆوەو کرێچیەکەش بەدوایدا گەڕاو بۆخۆی برد، ئەوە دەکەوێتە بەر یاسای دزی کردن و دەستەکە دەبڕدرێت.

**بڕگەی بیست و یەك:**

کەسێك دوای دەستگیرکردنی، دانی بە دزیکردنەکەدا نا، ئەوە دەکەوێتە بەر یاسای دەست بڕینەوە.

**بڕگەی بیست و دوو:**

ئەگەر دەست بڕینەکە لەلایەن دەسەڵاتەوە بڕیاری لەسەر درا، نابێت پاشەکشەی لێ بکرێت، پاڕانەوەشی تێدا ناکرێت و، دەست بڕینەکە ئەنجام دەدرێت.

**(قورەیشیەکان (چارەسەری)کێشەی ئافرەتێکی بەنی مەخزومیان زۆر بەلاوە مەبەست بوو، کە دزی کردبوو، بۆیە لەنێوان خۆیاندا گوتیان: کێ باشە لەم بارەیەوە لەگەڵ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بدوێت؟ هەندێکیان گوتیان: ئوسامە**

خۆشەویستی پێغەمبەره(صلی الله علیه وسلم)، جگە لەو کێ جورئەتی ئەوەی هەیە بابەتێکی ئاوای لەگەڵدا باس بکات، بۆیە ئوسامە لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)کرد، پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم)، فەرمووی:

(ئەوەتۆ لەبارەی جێبەجێ کردنی سزایەك لە سزادانەکانی خوا، بۆ کەسێك دەپارێیتەوە؟) جا هەستایە سەرپێ و وتارێکی خوێندنەوەو فەرمووی: ئەی خەڵکینە، ئەو خەڵکانەی پێش ئێوە کە تووشی لەناوچوون بوون، بەهۆی ئەوەوە بووە کە ئەگەر خاوەن ڕێزێك لەنێویاندا دزی کردبا، چاوپۆشیان لێ دەکردو، ئەگەر هەژارێکیش لەنێویاندا دزی کردبا، دەستیان دەبڕی، سوێند بەخوا، ئەگەر فاتیمەی کچی محەمەد دزی کردبا، دەستیم دەبڕی).(٢٧١)

**بڕگەی بیست وسێ:**

کەسێك کە شاهیدی لەسەر دزی کردنێکدا، ئەوا پێویستە دزەکەو جۆرو بڕی ماڵە دزراوەکە دەستنیشان بکات، چونکە ئەم وردەکاریانە کاریگەرییان هەیە لەسەر بڕیاری دەست بڕینەکە.

**بڕگەی بیست و چوار:**

لەیاسای دەست بڕینەکەدا پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکەین:

**خاڵی یەکەم:** جاری یەکەم دەستی ڕاستی لە مەچەکیەوە دەبڕدرێت.

**خاڵی دووەم:** دزکەر لەسەر سزادانی جاری دووەمی دزی کردنەکەی، قاچی چەپی لە جومگەکەیەوە دەبڕدرێتەوە.

**خاڵی سێیەم:** دزکەر لە سزادانی سێیەمیدا لەسەر دزی کردن، دەستی چەپی لە مەچەکیەوە دەبڕدرێتەوە.

**خاڵی چوارەم:** دزکەر لە سزادانی چوارەمیدا لەسەر دزی کردن، قاچی ڕاستی لە جومگەکەیەوە دەبڕدرێتەوە.

**خاڵی پێنجەم:** لەسزای یەکەمدا ئەگەر ئەوکەسە دوای دزی کردنەکە دەستی ڕاستی لەدەستدا بەهۆی کارەساتێکەوە، ئەوا بڕینەکە جێبەجێ ناکرێت.

چونكە لەكاتی پێویست بوونی حوكمەكەدا دەستەكە بڕدراوەتەوە، بەڵام ئەگەر هات و دزەكە پێش دزی كردنەكە دەستی بڕدرابۆوە، ئەوا بۆ سزادانی یەكەمی دزیكردن پێی چەپی لە جومگەی قاچییەوە دەبڕدرێتەوە، بۆ ئەندامەكانی تریش بەهەمان شێوە.

خاڵی شەشەم: ئەگەر دەستەكان یان قاچەكان ناتەواویش بن، كە كەوتنە بەر سزای بڕینەوە دەبڕدرێنەوە، چونكە حوكمی ئایەتەكە بنبڕە بە بڕینەوە، ناتەواوی دەستەكان كارناكاتە سەر حوكمی ئایەتەكە.

خاڵی حەوتەم: زەیتێك سور دەكرێتەوەو ئەو بەشەی كە بە جەستەكەیەوە بڕیندارە، دەخرێتە ئەو زەیتەوە، بۆئەوەی خوێنەكەی بوەستێت و ڕەگەكان یەك بگرنەوەو، دەستەكە بەرز دەكرێتەوەو بە ملییەوە هەڵدەواسرێت بۆماوەی سەعاتێك، حەقی بڕینەكەو پارەی زەیتەكەش لە(بیت المال)دەدرێت.

### بڕگەی بیست وپێنج:

ئەم سزادانە ئەوانە ناگرێتەوە پێش ئەوەی ئاشكرا ببن خۆیان بێن دان بە تاوانەكەیاندا بنێن و، پەشیمانی بنوێنن و، ماڵە دزراوەكە بۆ خاوەنەكەی بگێڕنەوە، خوا لەم بارەیەوە دەفەرمویێت:

إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٣٤)المائدة

﴿(ئەم سزادانە) ئەوانەیان(ناگرێتەوە)كە پەشیمان بووبنەوە پێش ئەوەی لەلایەن ئێوەوە دەسگیر كرابن، جا بزانن بەڕاستی خوا لێبوردەو بە بەزەییە﴾.

### بڕگەی بیست و شەش:

بەهۆی خیانەتكاریەوە دەست نابڕدرێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: خائین دەست بڕینی لەسەر نیە).(٢٧٢)

### بڕگەی بیست و حەوت:

دەكرێت دزكەرو دزی لێكراو ڕێككەون لەنێوان خۆیانداو شكاتەكە نەكرێت، چونكە دوای شكات كردنەكە بڕیارەكە هەڵناوەشێتەوە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: پێش ئەوەی تاوانبارەکان بێنن بۆلای من، ئەگەر دەتانەوێت بۆخۆتان بیان بورن، دەنا کە گەیشتنە لای من، ئەوا سزادانەکەیان بەسەردا پێویست دەکرێت).(٢٧٣)

برگەی بیست وهەشت:

ئەگەر کەسێك ماڵێکی لە کەسێکی تر وەرگرت و پاشان ئینکاری وەرگرتنی ماڵەکەی کرد، ئەوا دوای لێکۆڵینەوە ئەگەر ڕوون ببێتەوە کە ئەو ماڵەی وەرگرتووە، ئەوا ئەوکەسە دەستی دەبڕدرێت.

(ئافرەتێکی هۆزی مەخزومی کەلوپەلی لە خەڵکی وەردەگرت، پاشان ئینکاری وەرگرتنەکەی دەکرد، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم)فەرمانی کرد دەستی ببڕدرێت).(٢٧٤)

برگەی بیست و نۆ:

گونجاونیە دوعا لە کەسێك بکرێت کە دزیەکی لێ کردبێت، لەبەرئەوەی دوعاکەی تۆمەتباری دزی کردنەکە لەسەر دزەکە سووك دەکات.

( عائیشە(ڕەزای خوای لێبێت)، لێفەکەی لێ دزرابوو، بۆیە دوعای لەو کەسە دەکرد کە دزیویەتی، دوعاکردنەکەی وای لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرد بلێت: (بە دوعا کردنەکەت) تاوانەکەی لەسەر سووك مەکە).(٢٧٥)

برگەی سی:

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك شتێکی بزربووی یان دزراوی خۆی بەدەست کەسێکی تر بینی دەیفرۆشت، ئەوە هەقی خۆیەتی ماڵەکەی لێ وەرگرێتەوە، ئەو کەسەش کە ماڵەکەی لە یەکێکی تر کڕیبێت، ئەوە دەبێت فرۆشیارەکە حەقەکەی بۆ ڕەتکاتەوە).(٢٧٦)

برگەی سی ویەك:

ئەگەر دزەکە ئاشکرابوو کە ماڵێکی دزیوە، دەستەکەی ببڕدرێت یان نا، ئەوە هێنانەوەی ماڵەکەی دەکەوێتە ئەستۆوە.

## سزای چەتەو ڕێگرەکان

### بڕگەی یەکەم:

پێویستە گەورەی موسوڵمانان بەڕووی ئەوانەدا بووەستێتەوە کە لە ڕێگەوبانەکاندا چەك بەڕووی خەڵکیدا بەرز دەکەنەوەو دەیانکوژن و ماڵ و سامانەکەیان دەبەن، چونکە ئەوانە ئەگەر پشتگوێ بخرێن، ترس دەخەنە دڵی خەڵکیەوەو خراپەکاری تەشەنە دەکات و ماڵ و سامانەکان تێدا دەچن.

### بڕگەی دووەم:

ئەوانە ئەگەر پێش ئەوەی خەڵك بکوژن و ماڵەکانیان بەرن، لەلایەن دەسەڵاتەوە دەستگیرکران، پێویستە تەمبێ بکرێن و بخرێنە بەندەوە.

### بڕگەی سێیەم:

ئەو چەتانە ئەگەر کەسێك بکوژن و ماڵەکەی بەرن، ئەوا بۆماوەی سێ ڕۆژ بە هەڵواسراوی بەبێ نان و ئاو بە بەرچاوی خەڵکەوە دەمێننەوە، پاشان دەکوژرێن، ئەگەر هەر خەڵکەکەش بکوژن و ماڵەکانیان نەبەن، ئەوا تەنها دەکوژێنەوە هەڵناواسرێن، لەلایەن کەسوکاری کوژراوەکانیشەوە، هیچ لێبووردنێك قبووڵ ناکرێت بۆ ئەو تاوانبارانە.

### بڕگەی چوارەم:

ئەگەر تەنها ماڵەکانیشیان بردو کەسیان نەکوشت، ئەوا سزای دزیان بەسەردا دەسەپێنرێت و، دەستتیان دەبڕدرێت و، دوور دەخرێنەوە بۆ شوێنێکی تر.

### بڕگەی پێنجەم:

ئەوانە ئەگەر هەڵاتن لەدەست سزاکەیان، ئەوا پێویستە داوا بکرێنەوەو بهێندرێنەوە بۆ سزادانیان.

### بڕگەی شەشەم:

ئەگەر هەر یەکێك لەوانە، دوای دەسگیرکردنی داوای تۆبەی کرد، ئەوا تۆبەی لێ قبووڵ ناکرێت، بەڵام ئەگەر پێش دەستگیرکردنی خۆی بدات بەدەستەوەو،

دان بـه تاوانەكانیـدا بنێـت، ئـەوا دەكەوێتـە بـەر یاسـای تۆبـە كـردن، ئەگـەر كەسـێكی نەكوشـتبێت ئـازاد دەكرێـت، دەبێـت مـاڵی خەڵكەكـەش بگێڕێتـەوە كەلێی ستاندوون، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

فَمَن تَابَ مِن بَعْدِ ظُلْمِهِ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ اللّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ(٣٩)المائدة

﴿جـا كەسـێك كـە تۆبـەی كـرد لـەدوای ئەوسـتەمەی كـە كردوویـەتی و خـۆی ڕاست و چاك كردەوە، ئەوا خوا لێی خۆش دەبێت، بەڕاستی خـوا لێبـوردەو بە بەزەییە﴾.

## یاسای تەمبیٚ كردن

**بڕگەی یەكەم:**

ئەم سزادانە گەورەی موسوڵمانان پێوەی هەڵدەستێت.

**بڕگەی دووەم:**

سـزادانەكە لـەژێر ئـەو بڕگـە یاسـاییانەوەیە كـە بەسـەر دزو داوێنپـیس و چـەتەكاندا دەسـەپێنرێت و، هـیچ تۆڵـەو لەبریـدانێك نەیگرتوونـەوە، وەكـو ئەوكەسـەی كـە دزی كـردووە، بـەڵام دزیكردنەكـە نەبۆتـە هـۆی سـزادانی، جا بەهۆی ئەوەوەبێت كە ئەوماڵەی دزیویەتی لەنرخی چارەگە مسقاڵێك زێڕ كەمتر بووە، یان بە هەرهۆیەكی ترەوە یاساكەی بەسەردا نەسەپێنراوە، لێرەدا سـزای ئەوە وەردەگرێت كە كردوویەتی.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەم سزادانە، بۆ كەسی سەربەست نابێت بگاتە چل شوارك، بۆ كۆیلەش نابێت بگاتە بیست شوارك.

(پێغەمبـەری (صلی الله علیه وسلم) فەرموویـەتی: هـەر كەسـێك سـزادانی كەسـێك لـە ئەنـدازەی سـزادانەكەی بگەیەنێتـە سـزای تـاوانێكی گـەورەتر، ئـەوە لـە دەستدرێژكەرەكانە ).(٢٧٧)

(پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هیچ سزادانێك لەدەرەوەی سنووری ئەو سزایانەی خوا دایناون، لە (دە) شوارك تێناپەڕن ).(٢٧٨)

بڕگەی چوارەم:

گەورەی موسوڵمانان دەتوانێت لە تاوانی ئەم پۆلە تاوانبارانە ببورێت.

## سزاكانی هەڵوێست وەرگرتن

بڕگەی یەكەم:

ئەگەر ئاژەڵێك هێرشی كردە سەر كەسێكو، كەسەكە توانای خۆپاراستنی نەبوو، ئەوە مافی ئەوەی هەیە ئەو ئاژەڵە بكوژێت، هیچ حەقە خوێنیشی ناكەوێتە ئەستۆ.

بڕگەی دووەم:

ئەگەر كەسێكی بێگانە لە ماڵی كەسێكی تردا، لەژێرەوە چاوی دەگێڕاو هەوڵی تەماشاكردنی خێزانو كچی خاوەن ماڵەكەی دەدا، ئەوا خاوەن ماڵەكە مافی خۆیەتی هەر هەڵوێستێك بەرانبەر ئەوكەسە وەربگرێت، وەكو ئەوەی شتێكی تێبگرێت، بەڵام بۆی نیە بیكوژێت.

بڕگەی سێیەم:

ئەگەر كەسێك بەبێ مۆڵەت چووە ماڵی كەسێكی ترەوە، ئەوا مافی خاوەن ماڵەكەیە هەر هەڵوێستێكی بەرانبەر وەرگرێت.

بڕگەی چوارەم:

ئەگەر مەڕوماڵاتی كەسێك چووە ناو كشتوكاڵی كەسێكەوەو هەمووی خواردو شێلای، ئەوە مافی خاوەن كشتوكاڵەكەیە، داوای مافی خۆی لە خاوەن مەڕەكە بكات، ئەگەر چوونە ناوەوەی مەڕەكان بەشێكی كشتوكاڵەكەی خواردبوو، ئەوا ئەندازەكەی دیاری دەكرێتو پارەكەی لە خاوەنی مەڕەكان وەردەگیرێت، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

وَدَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِي الْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَاهِدِينَ (٧٨)الانبياء

﴿داودو سلێمانیش كه بڕیاریان دەدا لەسەر ئەو كشتوكاڵەی كه بە شەو مەڕی گەل و هۆزێك بەرەڵابووبوونە ناوی، ئێمەش بە بڕیارەكەیان ئامادەو ئاگادار بووین﴾.

**بڕگەی پێنجەم:**

ئەگەر ئاژەڵێك، یان باڵندەیەك، شتێكی بەهاداری وەكو موورویەك، یان ئونگوستیلەی كەسێكی تری قوتدا، ئەوا خاوەن مووروەكە بۆی هەیە داوای نرخی مووروەكە بكات لە خاوەنی ئاژەڵەكە، یان دەبێت ئاژەڵەكە سەربېڕدرێت و مووروەكەی لە زگی دەربهێنرێتەوە، ئەگەر لەكاتی دەرهێنانەوەشدا مووروەكە عەیبدار ببوو، ئەوا پێویستە خاوەن ئاژەڵەكە حەقی ئەو عەیبداریە بدات.

## سزای ئەوانەی سوێند لەژنەكانیان دەخۆن

## (الايلاء)

مەبەست لەوەیە پیاو بە سوێندێك خۆی قەدەغە بكات لەژنەكەی بۆ جووتبوون.

**بڕگەی یەكەم:**

سزا دانەكەیان ئەوەیە نابێت چوار مانگ لەسەریەك بچێتە پاڵ ژنەكەی.

لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٢٢٦) البقرة

﴿بۆئەوانەی سوێندێك دەخۆن كه نەچنە پاڵ ژنەكانیان(بۆكاری جووت بوون)، (لەو ڕۆژەوە سوێندەكەیان خواردووە) بۆماوەی چوار مانگ چاوەڕێ دەكەن و (ناچنە پاڵیان)، جا ئەگەر پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوە لە سوێندەكەیان، (ئەوا حەقە تاوانی سوێند خواردنەكەیان دەدەن و، دواتر بۆیان هەیە بچنەوە پاڵ ژنەكانیان)، جا بزانن بەڕاستی خوا لێبوردەو خاوەن بەزەییە﴾.

**بڕگەی دووەم:**

منداڵو شێتو كەسی نوستوو ئەم یاسایە نایانگرێتەوە.

بڕگەی سێیەم:

هەر سوێند خواردنێك وەكو ئەوەوایە سوێندی بەخوا خواردبێت، وەكوئەوەی بڵێت: بە حەقی كەعبە ئەگەر لەگەڵت جووتبم، دەبێت بەندەیك ئازاد بكەم، ئەوا سوێندخواردنەكەی دەكەوێتە ئەستۆ هەتا بەندەكە ئازاد نەكات بۆی نیە بچێتە پاڵ ژنەكەی، یان بڵێت: سوێند بەخوا ئەگەر بێمە پاڵت، ڕۆژووگرتنی مانگێكم بكەوێتە ئەستۆ، ئەوا هەتا مانگەكە بەسەریەكەوە بەڕۆژوو نەبێت بۆی نیە بچێتەوە پاڵ ژنەكەی.

## سزای ئەوانەی بە ژنەكانیان دەڵێن: تۆ وەكو پشتی دایكم وایت بۆمن (الظهار)

بڕگەی یەكەم:

ناوەڕۆكی یاساكە لەسەرئەوەیە كەسێك بە ژنەكەی بڵێت: تۆ بۆ من وەكو دایكم وایت بۆ كاری جووت بوون، یان بڵێت تۆ بۆ من وەكو نەنكم وایت بۆ كاری جووت بوون.

الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْكُمْ مِنْ نِسَائِهِمْ مَا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلا اللائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنْكَرًا مِنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ (٢)المجادلة

﴿ئەو كەسانەی بە هاوسەرەكانیان دەڵێن: تۆ بۆ من وەكو پشتی دایكم وای، ئەو ژنانە دایكی ئەوان نین، بەڵكو دایكی ئەوان ئەو ژنانەن كە ئەوانیان لێ بوون، ئەوان لە قسەكردنیشدا قسەیەكی خراپو درۆ دەكەن، بەڕاستی خواش بەخشەرو لێبوردەیە﴾.

بڕگەی دووەم: سزای ئەوانە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

یەكەم: ئەگەر خاوەن ماڵو سامان بێت، ئەوا دەبێت كۆیلەیەك ئازاد بكات، پێش ئەوەی بچێتە پاڵ ژنەكەی.

وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا

﴿ئەو کەسانەی بە هاوسەرەکانیشیان دەڵێن: تۆ بۆ من وەکو پشتی دایکم وای، پاشان لەو قسەیەی کە کردوویانە پەشیمان دەبنەوە، ئەوە پێش ئەوەی (ژن و مێردەکە) دەسکاری یەکتری بکەن (بۆکاری جووت بوون)، ئەوکەسە پێویستە بەندەیەك ئازاد بکات....﴾.

دووەم: ئەگەر ماڵوسامانی نەبوو کۆیلەك ئازاد بکات، ئەوە دەبێت دوو مانگ بەسەریەکەوە بەڕۆژوو بێت پێش ئەوەی بچێتە پاڵ ژنەکەی.

فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا

﴿کەسێکیش ماڵوسامانی نەبوو بەندەیەکی پێ ئازاد بکات، ئەوە دەبێت دوو مانگ بەدوای یەك بەڕۆژوو بێت، پێش ئەوەی لەگەڵ هاوسەرەکەی دەسکاری یەکتری بکەن(بۆکاری جووت بوون)..﴾.

سێیەم: ئەگەر بەهۆی نەخۆشیەوە، یان هەر هەرهۆیەکی ڕێگە پێدراوەوە، نەتوانێت دوو مانگ بەڕۆژوو بێت، ئەوا پێویستە خواردنی شەست هەژار بدات، لەو خواردنانەی کە کەس‌وکارەکەی خۆی پێ نان دەدات.

فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا

﴿ئەگەر کەسێکیش نەیتوانی دوو مانگ بەڕۆژو بێت، ئەوا(پێویستە)نانی شەست هەژار بدات، پێش ئەوەی بچێتە پاڵ هاوسەرەکەی﴾.

برگەی سێیەم: ئەم یاسایە ئافرەتان ناگرێتەوە، ئەگەر بە مێردەکانیان بڵێن: تۆ بۆمن وەکو پشتی باوکم وایت.

برگەی چوارەم:

ئەگەر پیاوێك چوار ژنی هەبن بەیەکەوە بە هەر چواریان بڵێت: ئێوە بۆ من وەکو دایکم وان، ئەوا دەبێت چوار کۆیلە ئازاد بکات، واتە سزاکەی دەبێت بە چوار ئەوەندە.

**برگەی یەكەم:**

ئەوانەی كە بەبێ مەبەست سوێندەكان بە دەمیاندا دێت.

لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَـكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ

﴿خوا بەوەتان لەگەڵ ناكات كە لە سوێند خواردنەكانتاندا بەبێ مەبەست بەدەمتاندا دێت، بەڵام بەوەتان لەگەڵ دەكات ئەگەر سوێند خواردنەكانتان بە وادەو پەیمانەوە بێت، جا لەبریدانی لێخۆشبوونی ئەم سوێندە، نانداني دە هەژارە لەو خواردنە مامناوەندانەی كە كەس‌وكارەكەی خۆتانی پێ نان دەدەن، یان بەرگ‌و پۆشاكی دە هەژارە، یان ئازادكردنی كۆیلەیەكە....﴾.

فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ .... (٨٩)البقرة

﴿جا كەسێك نانی دە هەژاری پێ نەدرا، (لەبریدانەكەی)سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بوونە، ئەوە لەبریدانی لێخۆشبوونی سوێندەكانتانە ئەگەر سوێندتان خوارد﴾.

**برگەی دووەم:**

ئەم یاسایە منداڵ‌و شێت‌و كەسی نووستوو ناگرێتەوە.

**برگەی سێیەم:**

هەموو كەسێك بۆ گەڕاندنەوەی مافێكی خۆی ڕێگەی پێدراوە سوێند بخوات.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ...(٨٧ المائدة).

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەو شتە باشانەی كە خوا بۆی ڕەوا كردوون، ئێوە لەخۆتانی قەدەغە مەكەن﴾.

**برگەی چوارەم:**

لە كێشەیەكدا لەنێوان دوو كەس، ئامادەكردنی شاهیدەكان لە ئەستۆی شكات كەرەكەدان، بۆ ڕاستی داواكەی، سوێند خواردنیش لە ئەستۆی شكات لێكراوەكەدایە، بۆ دەرباز بوون لەداوای شكات كەرەكە.

(دوو كەس لەسەر كێشەیەك هاتن بۆلای پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم)، یەكێكیان داوایەكی لەسەر ئەوەی تریان هەبوو، ئەویش بە شكات كەرەكەی گوت: شاهیدەكانت بێنە، شكات كەرەكەش گوتی: شاهیدم نیە، جا بە شكات لێكراوەكەی گوت: سوێند بخۆ بەو خوایەی كە هیچ پەرستراوێكی تر نیە تەنها ئەو نەبێت، كە هیچ مافێكی شكات كەرەكە بەسەرتۆوە یان لەلای تۆ نیە).(٢٧٩)

برگەی پێنجەم:

هەر كەسێك بۆ زەوتكردنی مافی یەكێكی تر سوێندی درۆ بخوات، لە ڕۆژی قیامەتدا خوا ڕقی لێ دادەگرێت.

(پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: كەسێك سوێندێكی بە درۆ بخوات، بۆئەوەی شتێك لە ماڵی كەسێكی موسوڵمان بپچڕێت، ئەوە بە شێوەیەك بە دیداری خوا دەگات كە خوا ڕقی لێ داگرتووە).(٢٨٠)

برگەی شەشەم: سوێند خواردن لەسەر شتێك بۆ گەڕانەوەی مافێك، پێویستە تەنها سوێند بە ناوە پیرۆزەكانی خواوە بخورێت، هەر كەسێك سوێند بە (الرحمن)و (الرحیم)و (القادر)و (الوهاب)و ناوە پیرۆزەكانی ترەوە بخوات، ئەوە سوێندەكە پێكدێت، لەبەرئەوەی ئەو ناوانە تایبەتن بە خواوە.

برگەی حەوتەم: كەسێك بۆ ڕازی كردنی كەسی بەرانبەری كە دەڵێت: (واللە وباللە وتاللە، لعمرُ اللە) ئەگەر مەبەستی سوێند خواردن بێت، ئەوا دەكەونە بەر یاسای سوێند خواردنەوە، لەم بارەوە خوا دەفەرموێت:

وَتَاللَّهِ لأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُمْ بَعْدَ أَنْ تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ (٥٧)الانبياء

﴿ئیبراهیم گوتی: سوێندیش بە خوا، چارەی بتەكانتان دەكەم دوای ئەوەی كە دەڕۆن و بەجێیان دەهێڵن﴾.

برگەی هەشتەم:

مرۆڤ سوێند بخوات لەسەر ئەنجامدانی هەر ئیشێك و، ئیشەكە نەكات، ئەوە سوێندەكەی دەكەوێتە ئەستۆ.

## یاسای دادوەری کردن

**بڕگەی یەکەم:**

هەر کەسێك پەیڕەوی یاساکانی خوا نەکات، کە لە قورئاندا بۆ محەمەدی هێناوەتە خوارەوە، ئەوە ئەوکەسانە لە بێباوەڕەکانن، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ (٤٤)المائدة

﴿....هەر کەسێکیش کار بەو یاسایانە نەکات کە خوا ناردوونیە خوارەوە، ئەوا ئەوانە بێباوەڕەن﴾.

**بڕگەی دووەم:**

ئەگەر کەسێك شایستەبێ ببێت بە دادوەر لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامیدا، بۆخۆشی بەم پلەیە ڕازی نەبێت و، کەسێکی تریش نەبوو بۆ ئەو پۆستە، ئەوا لەلایەن گەورەی موسوڵمانانەوە ناچار دەکرێت.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەگەر دادوەرێك زۆر زانابوو، بەڵام لێهاتوو نەبوو لە کاری دادوەریدا، ئەوە یەکێکی تر لە جێگەی ئەو دادەنرێت، بۆئەوەی خەڵك کەڵك لە زانستەکەی وەربگرن و، ئەوەی لە جێگەی ئەویش دانراوە دادوەریەکەی بە چوستی ئەنجام بدات.

**بڕگەی چوارەم:**

نابێت ئافرەت ببێت بە دادوەر.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: نەتەوەیەك سەرکەوتوو نابن، ئەگەر کاروبارەکانیان لەدەست ئافرەتێك دابێت).(٢٨١)

**بڕگەی پێنجەم:**

ناکرێت کەسێکی کوێر بکرێت بە دادوەر، چونکە ناتوانێت دوژمن و شاهیدەکان لەیەکتری جیا بکاتەوە.

**بڕگەی شەشەم:**

**نابێت دادوەر توندو تیژ، یان لاوازو ڕسوابێت.**

**بڕگەی حەوتەم:**

**دەبێت دادوەر شارەزا بێت بەڕێرەوی بڕگە یاساییەکان.**

**(پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **فەرموویەتی: دادوەرەکان سێ جۆرن، دووجۆریان لە نێو ئاگر دانو جۆرێکیشیان لە بەهەشتن، ئەوەی لە بەهەشتدایە پیاوێکە لە حەقو ڕاستی تێدەگەیشتو دادوەری پێ دەکرد، ئەوە لە بەهەشتدایە، بەڵام ئەوانەی نێو ئاگر، ئەوا یەکێکیان لەحەقو ڕاستی تێ دەگەیشت، بەڵام لە دادوەریەکەیدا لایدەدا لە ڕێگەی ڕاست، ئەوە لە ئاگردایە، یەکێکیشیان، بە نەزانی دادوەری بۆ خەڵکی دەکرد، ئەویش لە ئاگر دایە).**(٢٨٢)

**بڕگەی هەشتەم:**

**نابێت ڕێگە بدرێت بەرتیل وەربگیرێت.**

**(پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **فەرموویەتی: خوا نەفرەتی لەوانە کردووە لە دەسەڵاتدا بەرتیل دەدەنو بەرتیل وەردەگرن).**(٢٨٣)

**بڕگەی نۆیەم:**

**لە دەسەڵاتی دەوڵەتدا دیاری وەرناگیرێت.**

**(پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **پیاوێکی بەنی ئەسەدی بەکارهێنا بۆ کۆکردنەوەی زەکات، کاتێك گەڕایەوە گوتی: ئەوە بەشی ئێوەیەو ئەوەش بە دیاری بۆمن هاتووە، پێغەمبەری**(صلى الله عليه وسلم) **چووە سەر مینبەرەکەو فەرمووی: کارگوزارێك کە ئێمە بۆ ئەنجامدانی کارێك ناردومانە، دەبێت لێکدانەوەی چی بێت بۆ ئەو قسەیەی کە دەیڵێت: ئەوە بەشی ئێوەیەو ئەوەش بە دیاری بۆمن هاتووە، ئایا ئەو لەماڵی دایكوباوکی دانیشتووە هەتا وابیبینێت کە ئەو دیاریە بۆئەو هاتووە یان نا؟ سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە، هەر کەسێك**

شتێك لەو ماڵە بۆخۆی بەرێت، مەگەر ڕۆژی قیامەت هەر دەبێت بەکۆڵیەوە بیهێنێتەوە).(٢٨٤)

برگەی دەیەم:

دادوەر، یان دەسەلاتی دەوڵەت لە ناوچەیەکدا، دەتوانن بەشداری ئەو نانخوانانەبن کە خەڵکەکە بۆیان دەکەن، بە مەرجێك بۆ هەموو خەڵکەکە وەکو یەکبێت و، نەبێتە مایەی کارئاسانی کۆمەڵێك و کێشەو گرفت بۆ کۆمەڵێکی تر.

برگەی یازدە:

گەورەی موسوڵمانان نابێت بۆخۆی ڕاستەوخۆ بێتە ناو مامەڵەکانی کڕین و فرۆشتنەوە.

برگەی دوازدە:

دادوەر لە هەندێك کاتی تایبەتدا نابێت بڕیار بدات، وەکو کاتی تورەبوون، یان تینویەتی و برسی بوون، یان لە کاتی خۆشی و ناخۆشی، یان لە کاتی خەوەنوچکەدا، یان لە کاتی نەخۆشی و دڵەڕاوکێدا.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: بۆ دادوەر نەهاتووە لە کاتی تورەبوونیدا دادوەری بکات لەنێوان دوو کەسدا).(٢٨٥)

برگەی سێزدە:

وا چاکە دادوەر لە شوێنێکی دەرکەوتوو دانیشێت و، هەموو کەسێك بیگاتێ و شوێنێکی فراوان بێت، زۆری خەڵك و دەنگە دەنگ و دوکەڵ و بۆن کاری تێنەکەن.

برگەی چواردە:

واچاکە دادوەر بەندیخانەیەکی هەبێت، بۆ هێشتنەوەی ئەو تاوانبارانەی پێویست بە هێشتنەوە دەکەن.

برگەی پازدە: پێویستە دادوەر نووسەری هەبن، قسەی شاهیدو تاوانبارو ستەم لێکراوو بڕیارەکان بنووسن.

وا چاكە زانايانی ئايين ئامادەی كۆڕو كۆبوونەوەكانی بن، بۆئەوەی لەسەر پرسە گرنگەكان ڕاوێژ بە يەكتری بكەن، لەم بارەيەوە خوا دەفەرموێت:

وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ(٣٨)الشورى

﴿ئەوانەش كە وەڵامی داواكاريەكەی پەروەردگاری خۆيان داوەو، نوێژەكانيان جێبەجێ كردن‌و، چارەسەری كێشەكانيشيان بە ڕاوێژكردنە لە نێوان خۆياندا‌و، لەو ڕزق‌و بژێويەش دەبەخشنەوە كە پێمان بەخشيون﴾.

## ياساكانی شاهيدی دان

### بڕگەی يەكەم:

پێويستە ئەو كەسەی ئاگاداری گرێبەستێكی نێوان دوو كەس يان دوو لايەنە، لەكاتی پێويستدا شاهيدی دانەكەی بەڕاستی‌و دروستی بەبێ كەم‌و زياد بدات، لەم بارەيەوە خوا دەفەرموێت:

وَلاَ تَكْتُمُواْ الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ (٢٨٣)البقرة

﴿....ڕاستی شايەدی دانەكانيش مەشارنەوەو، هەركەسێ ڕاستی شاهيدی دانەكان بشارێتەوە، ئەوا ئەو كەسە دڵی تاوانبارەو، خواش ئاگادارو زانايە بەوەی كە ئێوە دەيكەن﴾.

### بڕگەی دووەم:

لە هەموو مامەڵەو گرێبەستێكدا، شاهيدەكان دوو پياون، يان پياوێك‌و دوو ژنن، وەكو خوا دەفەرموێت:

وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى..(٢٨٢البقرة)

﴿...دوو شاهيديش دياری بكەن لە پياوەكانتان(**بۆ شاهيدی دان لەسەر ڕاستی ئەم نووسراوە لە نێوانتان**)، جا ئەگەر دوو پياو دەست نەكەوتن، ئەوا پياوێك‌و دوو ئافرەت بگرن بە شاهيد لەوانەی كە ڕەزامەنديتان لەسەرن لەنێوان

شـاهیدەکاندا، (بۆیـەش دوو ئـافرەت)، بۆئـەوەی ئەگـەر یـەکێکیان نـاوەڕۆکی نووسراوەکەی لە یاد کرد، ئەوەی تریان بەبیری بێنێتەوە...﴿.

بەڵام لـە شـاهیدیدانی بینینـی کـاری داوێنپیسـی پێویسـتە شـاهیدەکان چـوار پیاو بن، بۆئەوەی ڕووداوەکە بخرێتە بارێکی یاساییەوەو سزای تاوانبارەکان بدرێت، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ...(١٥النساء)

﴾لە ئافرەتەکانیش ئەوانەی کاری بە دڕەوشتی(داوێنپیسی) دەکەن، ئەوا چوار شاهیدی پیاویان لەخۆتان لێ بگرن...﴿.

ئەگەر چوار شاهیدی پیاو شاهیدیان دا کە ئەو ئافرەتە داوێنپیسی کردووە، بەڵام دادوەر شایەدی دانی یـەکێکێکانی ڕەت کـردەوە، بەهۆی هـەر هۆیەکـەوە بێت، ئەوا جێبـەجێ کردنـی یاساکە دەوەستێت، وەکو ئـەوە وەهایـە هـەر هیـچ ڕووی نەدابێت، مادام ژمارەی شاهیدەکان نەگەیشتوونەتە چوار کـەس، ئەگـەر چـوار کەسـیش شـاهیدییان دا کـە ئافرەتێـك داوێنپیسـی کـردووەو، چـوار ئافرەتیش ئافرەتەکەیان پشکنی و ڕوون بۆوە کە ئەو ئافرەتە پەردەی کچێنی ماوە، ئـەوە یاسـاکە بەسـەر ئافرەتەکـەدا ناسـەپێنرێت و شـاهیدەکانیش سـزا نادرێن.

**برگەی سێیەم:**

شاهید نابێت بترسێت و گوێ بە کەس بدات، دەبێت لە پێناوی سەرکەوتنی حەق و ڕاستیدا تەواوی شاهیدی دانەکە بڵێت، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

وَلاَ يَأْبَ الشُّهَدَاء إِذَا مَا دُعُواْ....(٢٨٢ البقرة)

﴾...شاهیدەکانیش ئەگەر بانگ کران بۆ شاهیدی دان، با گـوێ نەدەنـە کـەس و شاهیدی لەسەر ڕاستیەکان بدەن...﴿.

**برگەی چوارەم:**

هیچ پارەو کرێ و پێ بەخشینێك نادرێت لە بەرانبەر شاهیدی داندا.

**بڕگەی پێنجەم:**

**مندالّو شێتو گێلو سەرخۆش بۆ شایەدی دان ناشێن.**

**بڕگەی شەشەم:**

**کەسی بێباوەڕ بە شاهید وەرناگیرێت، کۆیلەش بەپێی ئەو ئەرکانەی لەسەر شانێتیو ئەومافانەی هەنی بۆ شاهیدی دان ناگونجێت.**

**بڕگەی حەوتەم:**

**کەسی دووڕوو بە شاهید وەرناگیرێتو، پێویستە موسوڵمانەکان لێی وریابن لە هەر هەواڵێك کە بڵاوی دەکاتەوە، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:**

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ (٦)**الحجرات**

**﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەرهاتو کەسێکی لادەر لە ئایین هەواڵێکی بۆ هێنان، ئەوە لە هەواڵەکەی بکۆڵنەوەو(یەکسەر باوەڕی پێ مەکەن)، نەوەك بە نەزانی خەڵکانێك تووشی سزاو ئازار بکەنو، پاشان لەوەی کە کردوتانە پەشیمانی بنوێنن﴾.**

**بڕگەی هەشتەم:**

**ئەگەر شاهیدێك لە کێشەیەکدا ڕاستیەکی شاردەوە، یان هەواڵێکی بە درۆ بڵاوکردەوە، ئەوە جارێکی تر شاهیدی دانی لێ قبووڵ ناکرێت، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:**

وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ (٤)**النور**

**﴿ئەو کەسانەش کە ئافرەتە پاکەکان لەکەدار دەکەن، جا چوار شاهید ناهێنن (بۆ ڕاستی ڕووداوەکە)، ئەوانە دارکاری بکەن بە لێدانی هەشتا شوارك، بۆ هەتاهەتایش شاهیدیان لێ قبووڵ مەکەن، (لەڕاستیشدا) ئەوانە لادەرن لەسەر بەرنامەی پەروەردگار﴾.**

**بڕگەی نۆیەم:**

هەر کەسێك پیاوەتی و هەستی مرۆڤایەتی تێدا نەبێت، شیاوی ئەوەنیە ببێت بە شاهید.

**بڕگەی دەیەم:**

کەسێك گەمە بە یاریەکانی وەکو شەترەنج و تاوڵەو وەرق بکات و خویان پێوە بگرێت، شاهیدی دانی لیّ وەرناگیرێت.

**بڕگەی یازدە:**

کەسێك خەریکی کۆتربازی و کەوبازی و لەو بابەتانە بێت، شاهیدی لیّ وەرناگیرێت، چونکە ئەم پیشانە لە پلە مرۆییەکەی کەم دەکەنەوەو سەرقاڵی دەکەن و، دەبێتە مایەی لەبیرچونەوەی شاهیدی دانەکان.

**بڕگەی دوازدە:**

کەسێك خەریکی گۆرانی گوتن و مۆسیقاو دەگو ڕەقس بێت، شاهیدیدانی لیّ وەرناگیرێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: خوا شەڕاب و قومارو ئاوی جۆو تەپڵ لێدان و زورنا ژەنینی لەسەر ئومەتەکەی من حەرام کردووە).(٢٨٦)

بەڵام بۆ ڕاگەیاندنی مارەبڕینی نێوان ژن و پیاوێك، گونجاوە دەفە لێبدرێت و خەڵکەکەی پیّ ئاگادار بکرێتەوە، هەروەها بۆ لێخوڕینی مەڕوماڵاتەکان گونجاوە گۆرانی بگوترێت، خوێندنەوەی شیعرێکی جوانیش لە کاتی بیّ ئیشیدا تام و چێژ دەدات و ڕەوایە، شیعر گونجاوە ئەگەر شەڕە جنێوو پێداهەڵدان نەبێت.

**بڕگەی سێزدە:**

کەسێك قسەی پڕو پوچ بکات دەبێتە لادەر لە ئایین، بۆیە شاهیدی دانی لێ قبووڵ ناکرێت.

وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ (٣٠)الحج

﴿له قسه‌ی درۆو پڕوپووچیش خۆتان لادەن﴾.

برگه‌ی چوارده:

شكات كه‌رو شكات لێكراو ناكرێن به شاهید له‌كێشه‌كه‌ی خۆیاندا.

برگه‌ی پازده:

شاهیدی دانی كوڕ بۆ باوكی، یان باوكی بۆ كوڕه‌كه‌ی قبوولْ ناكرێت، شاهیدانی ژن‌ومێرد بۆ یه‌كتری قبوولْ ده‌كرێن، به‌لاّم شاهیدی دان دژ به‌یه‌كتری قبوولْ ناكرێت له ژن‌و مێرد، وه‌كو له كاتی زینادا.

برگه‌ی شازده:

شاهیدیدان ئه‌ركێكی زۆر قورسه پێویسته مرۆڤ به وریایی‌و وشیاری‌و هۆش له‌خۆبوونه‌وه شاهیدیه‌كه‌ی بدات، خوا له‌م باره‌یه‌وه ده‌فه‌رموێت:

وَلا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولاً (٣٦)الاسراء

﴿به‌سه‌ر شتێكیشه‌وه مه‌وه‌ستێ‌و قسه‌ی تێدا مه‌كه كه هیچ زانیاریه‌كت له‌سه‌ری نه‌بێت، بیستن‌و بینین‌و (ئاره‌زووی)دڵه‌كان، به‌ڕاستی ئه‌وانه هه‌موویان ئاده‌میزاد لێپرسراوه به‌رانبه‌ریان﴾.

(ئیبن عه‌باس (ڕه‌زای خوایان لێبێت) له‌باره‌ی شاهیدی دانه‌وه له پێغه‌مبه‌ری(صلى الله عليه وسلم) پرسی، ئه‌ویش فه‌رموویه‌تی: ڕۆژ ده‌بینی؟ گوتی: به‌ڵێ، ئه‌ویش فه‌رموویه‌تی: جا كه شتێكت بینی له‌سه‌ر شێوه‌ی ئه‌و ڕۆژه (ڕوون‌و ئاشكرا بوو)، ئه‌وه شاهیدی له‌سه‌ر بده، ده‌نا لێی گه‌ڕێ).(٢٨٧)

برگه‌ی حه‌ڤده:

ده‌كرێت شایه‌دی دانی كوێرێك وه‌ربگیرێت له‌سه‌ر قسه‌یه‌ك كه گوێبیستی بووه، به‌لاّم شاهیدیه‌كه‌ی وه‌رناگیرێت له‌سه‌ر كوشتنی كه‌سێك، یان تاوانبار كردنی به داوێنپیسی.

برگه‌ی هه‌ژده:

کەسێك شاهید بێت لە مارەبڕیندا، پێویستە ئاگاداری مەرجەکانی مارەبڕینەکە بێت، چونکە مەرجەکان لە مارە بڕینێکەوە بۆ مارە بڕینێکی تر جیاوازن، بۆ شاهیدی دانیش لەسەر کوشتنی کەسێك پێویستە شاهیدەکە ئەوەی کە بینیویەتی و شێوازی کوشتنەکە بخاتە ڕوو ئاشکرای بکات، پێویستە بڵێت: بینیم بە شیرەکەی لێیداو بەهۆی لێدانەکەوە پیاوەکەی کوشت، هەر ئەوەندە بەس نیە کە بڵێت: شیرەکەی لێداو مرد، لەوانەیە بەهۆی شتێکی ترەوە مردبێت، چونکە لەو شاهیدی دانەدا هۆکاری لێدانی شیرەکە ئاشکرا نەکراوە.

**بڕگەی نۆزدە:**

ئەگەر شاهیدێك لەلای چەند کەسێك شاهیدی لەسەر شتێکدا، بە مەبەستی ئەوەی ئەوانە ئاگاداری ڕووداوەکەبن، پاشان ئەوکەسە شاهیدی دەرە مرد، ئەوا ئەوانەی کە گوێیان لەقسەی ئەو پیاوە بووە، دەتوانن لەو کێشەیەدا لەلای دادوەر شاهیدی بدەن بەوەی کە بەم شێوەیە پێش مردنی کەسەکە گوێیان لێبوو ئەم شاهیدیەی دا، بە مەرجێك لە دوو کەس کەمتر نەبن، لێرەدا دادوەر ئەگەر باوەڕی بە قسەی ئەو دوو کەسانە نەکرد کە شایەدی دانەکەیان گێڕاوەتەوە، دەتوانێت سوێندیان بدات لەسەرئەوەی کە ڕاست دەکەن یان نا، لەم بارەشدا قسەی ئافرەتێك وەرناگیرێت لەسەر شاهیدیدانی کەسێك لەسەر ڕووداوێك کە ئەوکەسە دوای ئەو شاهیدیدانە مردبێت.

**بڕگەی بیست:**

کەسێك وای ڕادەگەیاند کە دوو هەزار دیناری قەرز لەلای فلأنە کەسە، کاتی دانەوەشی تێپەڕیوەو دوو شاهیدیشی هەیە، ئەگەر شاهیدی یەکەم شاهیدی دا بەوەی کە بڕە پارەکە تەنها هەزار دینارەو، شاهیدی دووەمیش شاهیدی دا بەوەی بڕە پارەکە دوو هەزار دینارە، ئەوا تەنها بڕی هەزار دینار بەسەر قەزدارەکەدا دەسەپێنرێت، لەسەر بنەمای ئەوەی ڕێژەی هەزار دینار لە شاهیدانی هەردووك شاهیدەکەدا بەدی دەکرێت، جا لەدوای ئەوە دادوەر

دەتوانێت شاهیدی دووەم سوێند بدات، لەسەر ڕاستی قسەکەی، بەم پێیە بەهۆی سوێند خواردنەکەوە هەزار دینارەکەی کەش دەسەپێنرێت بەسەر قەرزدارەکەو، کۆی گشتی قەرزەکە دەبێتەوە بە دوو هەزار دینار، هەروەها کەسێك وای ڕادەگەیاند کە هەزار دیناری قەرز لەلای فلانە کەسەو، کاتی دانەوەشی تێپەڕیوەو دوو شاهیدیشی هەیە، ئەگەر شاهیدی یەکەم شاهیدی دا بەوەی کە بڕە پارەکە تەنها هەزار دینارەو، شاهیدی دووەمیش شاهیدی دا بەوەی بڕە پارەکە دوو هەزار دینارە، ئەوا تەنها بڕی هەزار دینار بەسەر قەزدارەکەدا دەسەپێنرێت، دوای ئەوەی کە شاهیدی یەکەم لەسەر قسەکانی سوێند دەدرێت، بەهۆی ئەم سوێندەشەوە کار بە قسەی شاهیدی دووەم ناکرێت، چونکە بەهۆی سوێندخواردنی شاهیدی یەکەمەوە خاوەن قەرزەکە گەیشتۆتەوە بە بڕە پارەکەی خۆی کە لەبنەڕەتدا هەزار دینارە.

**بڕگەی بیست ویەك:** ئەگەر دوو شاهید شاهیدیاندا لەسەر دزێك کە شتێکی دزیوەو بە هۆیەوە دەستی دزەکە بڕدا، پاشتریش شاهیدەکان پەشیمان بوونەوە لە شاهیدی دانەکەیان و، کەسێکی تریان تۆمەتبار کرد، ئەوا گوێ لە قسەکانیان ناگرێت و حەقە خوێنی دەستە بڕاوەکەشیان دەکەوێتە ئەستۆ.

**بڕگەی بیست و دوو:** ئەکەر کەسێك شاهیدیەکی ڕاستی داو پێش سەپاندنی یاساکە مرد، یان شێت بوو، یان هۆشی لەخۆی نەما، ئەوا هیچ شك وگومانێك ناخرێتە سەر شاهیدی دانەکەی و، دادوەر دەتوانێت بەهۆی ئەو شاهیدی دانە بڕیارەکەی بسەپێنێت، بەڵام ئەگەر دوای شاهیدی دانەکە ئەوکەسە لە ئایین لایدا، ئەوا دادوەر بۆی هەیە کار بە شاهیدی دانەکە نەکات، چونکە لادان لە ئایین شك وگومان پەیدا دەکات، ئەگەر ئەو شاهیدی دەرەش دوای شاهیدی دانەکەی کەوتە دوژمنایەتیەوە لەگەڵ ئەوکەسەی کە شاهیدیەکەی لەسەر داوە، ئەوا شاهیدیدانەکە هەڵناوەشێتەوە، لەبەرئەوەی دوژمنایەتیەکە دوای شاهیدانەکە بووە.

**بڕگەی بیست و سێ:**

**ئەگەر کەسێك شاهیدی دا لەسەر یەکێکی ترو، پاشان دەرکەوت کە شاهیدی دەرەکە کۆیلە یان لە بێباوەڕەکانە، ئەوا کار بەم شاهیدی دانە ڕادەگیرێت.**

**بڕگەی بیست وچوار:**

**ئەگەر کەسێك کێشەیەکی لە دادگادا بردەوەو شایستەی ئەو بردنەوەیە نەبوو، ئەوا ئەو ماڵەی کە لەم کێشەیەدا دەستی دەکەوێت حەرامە بۆ ئەو کەسە، ئەم دادگایی کردنانە تەنها بۆ ئارامی ژیانی دنیان، دەنا پاشتر پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا بۆخۆی دادوەری هەموو کێشەکان دەکات و مافەکان بۆ خاوەن حەقەکان دەگێڕێتەوەو سزای تاوانبارەکانیش دەدات.**

**(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئێوە کێشەکانتان دێنن بۆلای من (بۆئەوەی دادوەریتان بۆ بکەم)، منیش تەنها وەکو ئێوە مرۆڤم، لەوانەیە هەندێکتان بە دەم وپلتر بن لە هەندێکی ترتان لە دەربڕینی بەڵگەکاندا، جا منیش دادوەری بەوە دەکەم کە گوێبیستی دەبم، وادەزانم ئەوکەسە لە قسەکانی ڕاست دەکات، جا ئەگەر بڕیارم دابێت بۆ کەسێك لەسەر مافێك کە لەڕاستیدا حەقی برا موسوڵمانەکەی بەرانبەری بووبێت، ئەوە وەکو ئەوە وایە پارچەیەکم لە ئاگر بۆ بڕیبێت، جا ئەوکەسە بۆخۆی دەزانێ ئەگەر مافی خۆیەتی با بیبات، دەنا با لێی بگەڕێت).**(٢٨٨)

**بڕگەی بیست وپێنج:**

**شایەدی دانێکی بە درۆ، هاوتای ئەوە دەکات کە سێ جار هاوبەشی بۆ خوا دابنرێت.**

**(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: شایەدی دانی بە درۆ بارتایی سێ جار هاوبەشی دانان بۆ خوا دەکات.).**(٢٨٩)

## یاساکانی دان پێدانان

## (الاقرار)

واتە دان پێدانانی تاوانەکان، یان بڕیاردان لەسەر کارێك کە بیەوێت ئەنجامی بدات.

**بڕگەی یەکەم:**

پێویستە کەسی خاوەنباوەڕ خاوەنی ئەم هەڵوێستە بێت کە دان بە ڕووداوەکاندا بنێت، ئەگەر لە بەرژەوەندیی خۆشیدا نەبن، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

یا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيّاً أَوْ فَقَيراً... (١٣٥) النساء

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بەردەوام بن لەسەر جێبەجێ کردنی حەق‌وڕاستیو، شاهیدی دانەکانتان بۆ خوا بدەن، ئەگەر لەسەر خۆشتانو باوانەکانیشتانو خزمە نزیکەکانیشتان بێت، دەوڵەمەند بن یان فەقیر (**شایەدی دانەکە بە ڕاستی بدەن**)﴾.

**بڕگەی دووەم:**

دان پێدانانی کەسێك بە تاوانێکدا کە کردوویەتی، یەکسەر سزاکەی بەسەردا دەسەپێنرێت.

**بڕگەی سێیەم:**

دان پێدانان بۆ کەسێکی کامڵی خاوەن ژیرییە، بۆیە منداڵو شێت، ئەم یاسایە نایانگرێتەوە.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەگەر کۆیلەیەك دانی نا بە سزادانیو تۆڵە کردنەوە لێی، ئەوە مافی خۆیەتی پێویستی بە پرسی خاوەنەکەی نیە، چونکە مافێکە بەسەر خۆیەوە، نەك بەسەر خاوەنەکەیەوە.

### بڕگەی پێنجەم:

ئەگەر کەسێك دانی نا بە مافی کەسێکی تر بەسەریەوە، یان دانی نا بە حەقێکی خوا بەسەریەوە، ئەوە پەشیمان بوونەوە دادی نادات و حەقەکە دەکەوێتە ئەستۆیەوە.

### بڕگەی شەشەم:

ئەگەر کەسێك دانی نا بەوەی منداڵێك لەنێو زگی دایکیدا بخاتە ریزی میراتگرەکانیەوە، یان بڕیاریدا بە وەسیەتێك دوای مردنی خۆی، ئەوا دان پێدانانەکەی دەسەپێت، بە مەرجێك دڵنیایی هەبێت لە بوونی منداڵەکە.

### بڕگەی حەوتەم:

ئەگەر کەسێك دانی نا بەوەی کە ژنەکەی خوشکیەتی لە شیر خواردندا، ئەوا گرێبەستی ژن و مێردایەتیەکەیان هەڵدەوەشێتەوە، بەلأم ئەگەر ژنەکە دانی بەوەدانا کە مێردەکەی برایەتی لە شیرخواردندا، ئەوە گرێبەستی مارەکردنەکە هەڵناوەشێتەوە، لەبەرئەوەی دان پێدانانەکەی لەسەر شتێکە کە مافی مێردەکەیەتی.

## یاسای کۆچکردن

کۆچکردن: بەو مانایەی بۆ سەربەستی ژیانت، لە شوێنێکەوە کۆچ بکەیت بۆ شوێنێکی تر.

### بڕگەی یەکەم:

خوا ئادەمیزادەکانی دروستکردوون بە سەربەستی بژین، جا لەهەر شوێنێکدا سەربەستی نەبوو، ئەوا پێویستە ئەوکەسە شوێنەکەی جێهێڵێت و بچێت بۆ شوێنێك تیایدا سەربەست بێت، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

قَالُوٓاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا فَأُوْلَـئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءتْ مَصِيراً

(٩٧)النساء

﴿....(فريشتەكان) پێیان دەڵێن: ئەدی زەوی خوا فراوان نەبوو؟ خۆ دەتانتوانی تیایدا كۆچ بكەن بۆ شوێنێكی تر (بۆئەوەی ستەمتان لیٚ نەكرێت)، جا ئەوانە شوێنی مانەوەیان دۆزەخەو دۆزەخیش خراپترین چارەنووسە﴾.

برگەی دووەم:

نابێت هیچ كەسێكی موسوڵمان، لەژێر سێبەرو سایەی دەسەلاٌتێكدا بژیەت كە باوەڕی بە ئایینی خوا نەبێتو هاوبەشی بۆ دانێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: من بەریم لە هەموو موسوڵمانێك لەگەڵ هاوبەش دانەرێكدا بێت).(٢٩٠)

برگەی سێیەم:

كەسێك كە توانای كۆچكردنی نەبێت لەبەر هەژاریو كەم دەرامەتی، ئەوە پێویست نابێت لەسەری كۆچ بكات، وەكو خوا دەفەرموێت:

إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلاَيَهْتَدُونَ سَبِيلاً (٩٨) فَأُوْلَئِكَ عَسَى اللّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللّهُ عَفُوّاً غَفُوراً (٩٩)النساء

﴿تەنها ئەو بیٚ دەسەلاٌتانە نەبێت لە پیاوانو ژنانو منداڵان، كە هیچ فرتو فێڵێك نازاننو، ڕێگایەك نادۆزنەوە بۆ دەربازبوون، جا ئەوانە ئومێد هەیە كە خوا لێیان ببورێت، بەڕاستی خواش بەخشەرو لێبوردەیە﴾.

برگەی چوارەم:

كەسێك لەپێناوی خواو پێغەمبەرەكەیدا (صلى الله عليه وسلم) كۆچ بكات لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر، ئەوا دەسكەوتی چاكی دەبێت، ئەگەر لەو كۆچكردنەشیدا بمرێت، ئەوا پاداشتەكەی لەلای خوایە، بۆیە دەفەرموێت:

وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللّهِ يَجِدْ فِي الأَرْضِ مُرَاغَماً كَثِيراً وَسَعَةً وَمَن يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ مُهَاجِراً إِلَى اللّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلى اللّهِ وَكَانَ اللّهُ غَفُوراً رَّحِيماً (١٠٠)النساء

﴿ئەو کەسەش کە لە ڕێگەی خوادا کۆچ دەکات، لە زەویدا شوێنی پەنابردنی زۆرو فراوان بوونی باری ژیان دەدۆزێتەوە، هەر کەسێکیش لە ماڵەکەی خۆی بچێتە دەرەوە بە نیازی کۆچ کردن لەپێناوی خوادا، جا مردنی بگاتێ، ئەوە بەڕاستی ئەوکەسە پاداشتەکەی لەلای خوایە، خواش لێبوردەو خاوەن بەزەییە﴾.

**بڕگەی پێنجەم:**

**ئەگەر کۆچ کردنەکەت لە پێناوی مەبەستێکی تایبەتی خۆتدا بێت، ئەوا ناچێتە ڕیزی کۆچکردن لە پێناوی خوادا.**

**(عومەری کوڕی خەتاب(ڕەزای خوای لێبێت) لە وتارێکدا دەڵێ: پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: ئەی خەڵکینە، ئەنجامدانی کارو کردەوەکان پەیوەستە بە نیەتی ئەو کەسەوە، ئادەمیزادیش تەنها پاداشتی ئەو شتەی هەیە کە نیەتی لێ هێناوە، جا هەر کەسێك (نیەتی وابووبێت)، کۆچکردنەکەی لەپێناوی خواو پێغەمبەردا بێت، ئەوە کۆچکردنەکەی لەپێناوی خواو پێغەمبەر دایە، هەر کەسێکیش (نیەتی وابووبێت)، لە کۆچکردنەکەیدا ماڵ و سامانێکی دنیای دەسکەوێت، یان ئافرەتێك بکات بە هاوسەری خۆی، ئەوا کۆچکردنەکەی لەپێناوی ئەو شتەدایە کە کۆچی بۆ کردووە).**(٢٩١)

## یاسای هەڵبژاردن

## (قانون الانتخاب)

### بڕگەی یەکەم:

سستەمی بەڕێوەبردن لە دەوڵەتی ئیسلامیدا سستەمی کۆمارییە، نابێت کوڕ لەدوای باوکی، یان برا لە جێگەی براکەی دەسەلآت بگرنە دەست.

### بڕگەی دووەم:

هەڵبژاردنی گەورەی موسوڵمانەکان لەنێو ئەوانەدا دەبێت، کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرو ئایینەکە هەیەو، نوێژەکانیان بە ڕێکوپێکی بەڕێوەدەبەن و، زەکاتەکانیان بە تەواوی ئەنجام دەدەن، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ (٥٥)المائدة

﴿بەڵكو بەڕاستی خواو پێغەمبەرو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، ڕابەری ئێوەن، ئەوانەی(ئەو خاوەنباوەڕانەی) کە نوێژەکانیان بەڕێوەدەبەن و زەکات دەدەن و ملکەچی دەنوێنن بۆ پەروەردگاریان﴾.

### بڕگەی سێیەم:

هەڵبژاردنی گەورەی موسوڵمانان بە دوو شێواز دەبێت:

#### شێوازی یەکەم:

ئەو ڕابەرەی کە لە دەسلآتدایە، دەتوانێت کەسێك دەستنیشان بکات لەدوای خۆی ببێت بە ڕابەری موسوڵمانان، بەمەرجێك ئەوکەسە لە خزمەکانی خۆی نەبێت، ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) لەلایەن پێغەمبەرەوە(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە جێنیشین دانرا.

#### شێوازی دووەم:

هەڵبژاردنی ڕابەری موسوڵمانان، لەلایەن ئەنجومەنی ڕاوێژەوە دەبێت، عومەر (ڕەزای خوای لێبێت)، بە ڕاوێژی ئەنجومەن، لەدوای ئەبوبەکر بە جێنیشین داندرا.

**بڕگەی چوارەم:**

ئافرەت پۆستی ڕابەرایەتی موسوڵمانانی پێ نادرێت.

**بڕگەی پێنجەم:**

هەڵبـژاردن سـالآنە ئـەنجام دەدرێـت، بـەلآم ئەگـەر ڕابـەرێك جێگـەی ڕەزامەنـدی کۆمەڵگا بوو، ئەوا سالآنە مانەوەکەی لـە ڕابەرایەتیەکەدا بـۆ نـوێ دەکرێتـەوە، ئەم نوێکردنەوەیـە لـە ئیسـلامدا بە(البیعـه) ناسـراوە، هـەموو تاکێك ڕاسـتەوخۆ بەشداری لەم هەڵبژاردنەوەیەدا دەکات.

(عبداللـەی کـوڕی عومـەر(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵـێ: ئێمـە پێغەمبـەرمان(صلی الله علیه وسلم) بە ڕابەری خۆمان هەڵدەبژاردەوە، لەسەر بنـەمای پابەنـدبوون و گوێڕایـەڵی فەرمانەکانی، ئەویش دەیفەرموو: (لەو سنوورەی کە بۆتان دەکرێت)).(٢٩٢)

**بڕگەی شەشەم:**

دەسەلآت و ئەرکەکانی ڕابەری موسوڵمانان:

یەکەم: فەرماندەی هەموو هێزەکانی سوپا.

دووەم: بڕیاردەری هەموو سزاو بەخشینەکانە بەپێی یاساکانی ئیسلام.

سـێیەم: دەسـەلآتی ئـەوەی دەدرێتـێ دەوڵـەت بـەو کەسـانە بسـپێرێت کـە شایستەی ئەنجامدانی ئەو ئەرکەن.

چـوارەم: دەسـەلآتی ئـەوەی دەدرێتـێ کەسـەکان دیـاری بکـات بـۆ ڕابەرایـەتی کردنی وڵاتە موسوڵمانەکان.

پێنجـەم: هـەموو هەڵسـوکەوتێك بـە پرسـی ئەنجومـەنی ڕاوێـژکاری دەبێـت، لـەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

....وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ .....(٣٨)الشوری

﴿چارەسەری کێشەکانیشیان بە ڕاوێژ کردنە لەنێوان خۆیاندا،﴾.

شەشـــەم: دەسـەلآتی ئـــەوەی دەدرێتـــێ لـــە کـــاتی نەهامـــەتی و تەنگانـــەو کارەساتەکاندا، فەتوایەك بدات بۆ ڕووبەڕووبونەوەی کارەساتەکان.

حەوتەم: دەبێت کەسێکی دڵ نەرم بێت بەرانبەر خەڵکەکەی و، توندو تیژبێت بەرانبەر دوژمنەکانی، ئەو ڕابەرە لە شوێنی پێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم)، خواش لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ.....(٢٩ الفتح)

﴿محەمەد پێغەمبەری خوایە، ئەوانەش کە لەگەڵ ئەودان، توندوتیژن لەسەر بێباوەڕکان و، بە بەزەیین لەنێوخۆیان،....﴾.

هەشتەم: مافی ئەوەی نییە خزمە نزیکەکانی خۆی لە دەسەلأتەکاندا دانێت، مەگەر ئەو خزمانەی شایستەی ئەو ئەرکە بن.

نۆیەم: هەموو پەیوەندیەکانی دەرەوەی جیهانی ئیسلامی بە بنبڕی تایبەتن بەوەوەو، هیچ تاکێك بەبێ پرسی ئەو بۆی نیە هیچ پەیوەندیەك ببەستێت.

دەیەم: دەسەلأتی چاودێریی و بەدواچوون و لێپرسینەوەی هەموو دەسەلأتدارانی دەوڵەتی دەدرێتێ، لەسەر شێوازی ڕاپەڕاندنی کارەکانیان.

برگەی حەوتەم:

پێویستە هەموو خاوەنباوەڕەکان، پابەند بن بە ڕابەرایەتیەکەیەوەو گوێڕایەڵی بکەن.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً (٥٩)النساء

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو خاوەن فەرمانی نێوان خۆتان بکەن، جا ئەگەر ناکۆك و دووبەرەك بوون لە کێشەیەکدا، ئەوا کێشەکە بگەڕێننەوە بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی، ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بە خواو ڕۆژی دوایی، ئەوە بۆ ئێوە چاکترەو ئەنجامی لێکدانەوەکەشی باشترە﴾.

## یاسای تێکۆشان لەپێناو خوادا

## (الجهاد)

**بڕگەی یەکەم:**

تێکۆشان و جەنگان لە پێناوی خوادا پێویست کراوە لەسەر شانی موسوڵمانەکان، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ.....(٢١٦ البقرة)

﴿(لە یاساکانی ئیسلامدا) بەشداری کردنی جەنگتان لەسەر نووسراوە، (بۆ پارێزگاری کردنی ئایینی خوا)، ئێوەش پێتان وایە ئەوە کارێکی ناخۆشە....﴾.

**بڕگەی دووەم:**

نابێت هەموو خەڵکەکە تێکڕا بچێت بۆ جەنگەکە، چونکە بە چوونی هەندێکیان ئەرکەکە لەسەرشانی ئەوانی تر لادەچێت، بۆئەوەی هەندێکیشیان بمێننەوە ئایینەکەیان فێری خەڵکی بکەن و کاروباری ڕۆژانەی خەڵکەکە ڕاپەڕێنن، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنْفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ (١٢٢)التوبة

﴿گونجاو نەبوو خاوەنباوەڕەکان هەموو تێکڕا دەرچووبان بۆ جەنگ، جا ئەگەر لەهەر سوپایەك دەستەیەك لەوان مابایەوەو نەبرابان بۆ جەنگ، بۆئەوەی لە ئایینەکەیان شارەزابین و تێبگەن و میللەتەکەیان ئاگادار بکەنەوە کاتێك کە دەگەڕێنەوە بۆلایان، بەو هیوایەی ئاگاداری و ئامادەباشی خۆیان وەرگرن﴾.

**بڕگەی سێیەم:** پێویستە موسوڵمانەکان بە سەرو ماڵیانەوە لە پێناوی خوادا بجەنگن، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

انفِرُوا خِفَافاً وَثِقَالاً وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (٤١)التوبة

﴿بەرەو جەنگ بڕۆن بە باری سوكو بە باری قورسەوە، بە خۆتانو ماڵو سامانتانەوە لە پێناوی ڕێبازی خوادا تێكۆشن، ئەوە بۆئێوە باشترە ئەگەر تێیدەگەنو دەزانن﴾.

**برگەی چوارەم:**

ئەو تێكۆشەرانەی بە ماڵو سامانەكانیانەوە لەپێناوی خوادا دەجەنگن، پلەیان بەرزترە لەوانەی لەماڵەكانیاندا دەمێننەوە، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

فَضَّلَ اللهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً...(٩٥ النساء)

﴿ئەو تێكۆشەرانەی كە بە خۆیانو ماڵو سامانیانەوە تێدەكۆشن، خوا بە پلەیەكی باڵا بەرزی كردوونەوە بەسەر ئەوانەی لە ماڵەكانیاندا دانیشتوون﴾.

**برگەی پێنجەم:**

تێكۆشان لەپێناوی خوادا هەموو بوارەكانی ژیان دەگرێتەوە، هەركەس بەپێی زانستەكەی خۆی، باشترین كارو كردەوەش ئەوەیە مرۆڤ ئەوەی دەیكات لە پێناوی خوادا بێت، ئینجا جەنگان بێت لە بەرەكانی جەنگ، یان بڵاوكردنەوەی ئایینەكە بێت، یان دۆزینەوەیەكی زانستی بێت، تەفسیرێكی قورئان یان ڕوونكردنەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەر بێت(صلى الله عليه وسلم)، یان پەروەردەكردنی منداڵەكەت بێت لەسەر ڕێبازی ئیسلام، هەموویان تێكۆشانن لە پێناوی سەقامگیری ئایینی خوادا.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پرسیاری لێكرا: كام كارە لە هەموو كارەكان باشترە؟ فەرمووی: باوەڕهێنان بە خواو پێغەمبەرەكەی‌و، تێكۆشان لە پێناوی خوادا).(٢٩٣)

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی: ئەگەر خوا چاكەی كەسێكی بووێت، ئەوا لە كاروباری ئاییندا شارەزای دەكات).(٢٩٣ب)

**برگەی شەشەم:** ئەوانەی ئامادە نین بچن بۆ جەنگ لە پێناوی خوادا لە پەیڕەوانی كتێبە ئاسمانیەكان، دەبێت ساڵانە سەرانە بدەن.

قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلا بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنْ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ (٢٩)التوبة

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لەگەڵ ئەوانەدا بجەنگن کە کتێبیان بۆ هاتووەو، باوەڕناهێنن بە خواو بە ڕۆژی دوایی، ئەو شتانەش لەسەرخۆیان قەدەغە ناکەن کە خواو پێغەمبەر قەدەغەیان کردوون، پەیڕەوی ئایینی ڕاستو دروستیش ناکەن، (**لەگەڵیان بجەنگن**) هەتا وەها بچووكو بێ دەسەڵات دەکرێنەوە ناچار دەکرێن بە دەستی خۆیان سەرانە بدەن﴾.

**بڕگەی حەوتەم:** لەکەس قبووڵ ناکرێت لەجیاتی یەکێکی تر لە پێناوی خوادا تێبکۆشێتو بجەنگێت.

**بڕگەی هەشتەم:**

خەڵکی هەژارو بێ تواناو شەلو کوێرو ژنو منداڵو کۆیلەو کەنیزەكو شێت، جەنگ کردنیان لەسەر نیە، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ وَلا عَلَى الْمَرْضَى وَلا عَلَى الَّذِينَ لا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِنْ سَبِيلٍ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ(٩١)التوبة

(هیچ شەرمەزارییەك نیە لەسەر خەڵکە هەژارو بێ تواناکانو لەسەر نەخۆشەکانو، نە لەسەر ئەوانەش کە هیچیان نیە بیبەخشنەوە، ئەگەر دڵسۆزیان نواند بۆ خواو پێغەمبەر، بۆ چاکەکارەکانیش هیچ ڕێبازێکی سزادان نیە، خواش لێبوردەو خاوەن بەزەییە﴾.

**بڕگەی نۆیەم:**

کەسێك قەرزدار بێت، بەبێ پرسی خاوەن قەرزەکە ناتوانێت بچێت بۆ جەنگ.

**بڕگەی دەیەم:**

گونجاونیە کەسی موسوڵمان بەبێ پرسی دایكو باوکی بچێت بۆ جەنگ، ئەگەر دایكو باوکەکەی موسوڵمان بوون.

**بڕگەی یازدە:**

**گونجاونیە بەبێ فەرمانی پێشەوای موسوڵمانان لەخۆیانەوە بچن بۆ جەنگ.**

**بڕگەی دوازدە:**

**پێشەوای موسوڵمانانیش دەبێت خۆی بۆ جەنگەکە ئامادە بکات و، سوپاکەی پێکەوەنێت و، خەڵکانی جێگەی باوەڕیان بەسەرەوە دابنێت و، ئەگەر پێویستی کرد قەڵایەکی پارێزراو بنیات بنێت، یان خەندەکێك لێدات، ئەگەر ویستیشی بۆ جەنگەکە بڕواتە دەرەوە، ئەوە سوپاکەی کۆ دەکاتەوەو، ڕێگە بەو کەسانە نادات بەشداری بکەن کە بە سوپای دوژمندا هەڵدەڵێن و، ڕێگە بەو کەسانەش نادرێت بەشداری بکەن کە (جاسوسن) و نامە گۆڕینەوەیان هەیە لەگەڵ بێباوەڕەکاندا، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:**

لَوْ خَرَجُوا فِيكُمْ مَازَادُوكُمْ إِلاَّ خَبَالاً وَلأَوْضَعُوا خِلالَكُمْ يَبْغُونَكُمْ الْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ (٤٧)التوبة

**﴿ئەگەر ئەوانە لەگەڵتان هاتبان بۆ جەنگ هیچیان لەئێوە زیاد نەدەکرد، مەگەر تەنها شێواندن و خراپەکاری نەبێت، بەخێراییش لەنێوانتان دێن و دەچن، قسە ئاڵوگۆڕ دەکەن و مەیلی ئاژاوە دەکەن، لەنێو ئێوەشدا خەڵکانێك هەن گوێیان لێدەگرن و، خواش زانا و ئاگادارە بە ستەمکارەکان﴾.**

**بڕگەی سێزدە:**

**ئەگەر ئەو گەل و نەتەوەیەی کە هێرشیان دەکرێتە سەر، ئایینی ئیسلامیان نەگەیشتبۆیە، ئەوا یەکسەر شەڕیان لەگەڵ ناکرێت، بەڵکو دەبێت نوێنەریان بۆ بنێردرێت، بۆئەوەی بێنە سەر ئایینی ئیسلام، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:**

وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً (١٥)الاسراء

**﴿ئێمەش هیچ کاتێك سزادەر نەبووین لەنێو نەتەوەیەکدا، پێش ئەوەی نێردراوێکیان بۆ بنێرین﴾.**

ئەگەر ئەو گەل و نەتەوەیەش بێباوەڕ بوون بە خواو، بڕیاریاندا سەرانە بدەن، ئەوا لێیان قبوولْ ناکرێت، هەتا دان بە تاك و تەنهایی خوادا نەهێنن، چونکە سەرانە تەنها بۆ پەیڕەوانی ئایینەکانە کە نایەنە ناو ئاینی ئیسلامەوە، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلا بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنْ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ (٢٩)التوبة

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لەگەڵ ئەوانەدا بجەنگن کە کتێبیان بۆ هاتووەو باوەڕناهێنن بە خواو بە ڕۆژی دوایی، ئەو شتانەش لەسەرخۆیان قەدەغەناکەن کە خواو پێغەمبەر قەدەغەیان کردوون، پەیڕەوی ئایینی ڕاستو دروستیش ناکەن، (**لەگەڵیان بجەنگن**) هەتا وەها بچووك و بێ دەسەڵات دەکرێنەوە ناچار دەکرێن بەدەستی خۆیان سەرانە بدەن﴾.

**بڕگەی چواردە:**

پێویستە ئەوانەی دەچن بۆ جەنگ خۆڕاگر بن، چونکە خۆڕاگری دەبێتەهۆی ئەوەی لەشکرێکی سەد کەسی بەرانبەر لەشکرێکی دوو سەد کەسی بجەنگێت، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفاً فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوا أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ (٦٦)الانفال

﴿ئێستا خوا بارەکەی لەسەر سووك کردن، خواش دەزانێ لاوازیو کەنەفتیەك لە نێوتاندایە، جا ئەگەر سەد کەسی خۆڕاگر لەنێو ئێوەدا هەبێت، سەردەکەون بەسەر دووسەد کەس لەوانو، بە فەرمانی خوا ئەگەر هەزار کەسی خۆڕاگر لەنێو ئێوەدا هەبێت، سەردەکەون بەسەر دوو هەزار کەس لەوان، خواش لەگەڵ ئەوانەیە کە دان بەخۆیاندا دەگرن﴾.

## بڕگەی پازدە:

لە هیچ کاتێکدا سوپای موسوڵمانان نابێت پشت بکاتە دوژمن، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفاً فَلا تُوَلُّوهُمْ الأَدْبَارَ (١٥) وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفاً لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزاً إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنْ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ (١٦)الانفال

﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، کاتێك کە(لە مەیدانی جەنگدا) تووشی بێباوەڕەکان بوون، (بە شێوەیەك) کە هەردووك لاتان بەرەو یەکتری دەخشان، پشتیان تێ مەکەن، لەو ڕۆژەشدا (لە مەیدانی جەنگدا) هەرکەسێك پشت لە بێباوەڕەکان بکات، ئەوە بەدڵنیاییەوە ئەوکەسە تووشی ڕق و قینێك دەبێت لەلایەن خواوە، شوێنی مانەوەی ئەو کەسەش جەهەندەمەو خراپترین چارەنووسە، مەگەر کەسێك کە بە پاشەکشە کردنەکەی خۆی وەرچەرخێنێ و لەلایەکی ترەوە هێرش بەرێت، یان کەسێك بیەوێت بۆلای دەستەیەکی خۆیان باداتەوە (بۆ یارمەتیدانیان)﴾.

## بڕگەی شازدە:

باش نیە لەو شەڕەدا کەسێکی خۆت بکوژیت کە پەیوەندی ڕوحم لە نێوانتاندا بوو.

(پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێگەی بە ئەبوبەکر نەدا کوڕەکەی خۆی بکوژێت(ڕەزای خوای لێبێت)).(٢٩٤)

## بڕگەی حەڤدە:

نابێت ژن و منداڵ و نێرەموکی دووڕەگ و کەسی پیرو پەککەوتە بکوژرێن، زانا ئاینەکانیشیان ناکوژرێن ئەگەر لە ئەهلی کتاب بوون، بەڵام ئەگەر ژن و منداڵ و ئەو ئەسیرە موسوڵمانانەی کە لایانن، وەکو بەربەستێك لە بەردەم سوپای ئیسلامدا دایان نابوون، ئەوا دەکوژرێن.

**بڕگەی هەژدە:**

نێردراوی ئەو گەل و نەتەوەیە بۆلای موسوڵمانەکان، کوشتنی لەسەر نیە.

**بڕگەی نۆزدە:**

گونجاوە هەموو گیانەوەرەکانی ئەو گەل و نەتەوەیە لە شەڕەکەدا بکوژرێن، ئەگەر سەرکەوتنیش لە شەڕەکەدا وای پێویست دەکرد کە خانووەکانیان بڕوخێنرێن و باخ و بێستانیان ببڕدرێن، ئەوا ئەوکارانە ڕەوایە ئەنجام بدرێن.

**بڕگەی بیست:**

ئەسیر ناکوژرێت لە شەڕدا، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الْآخِرَةَ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٦٧) لَوْلَا كِتَابٌ مِنَ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (٦٨)الانفال

﴿بۆ هیچ پێغەمبەرێکیش نەبووە دیلەکان بگرێت هەتا بەتەواى لە زەویدا بەسەریاندا زاڵ دەبێت و(لێیان توند دەکات)، ئێوە(بۆیە ئەو دیلانەتان گرتوون) لەبەرئەوەی کاڵاو کەل وپەلی ژیانی دنیاتان دەوێت و، خواش دواڕۆژی دەوێت بۆئێوە، خواش خاوەن هێزێکی بێ وێنەو کاردروستە، ئەگەر بڕیارێك نەبایە لەلایەن خواوە لە(لوح المحفوظ)دا کە پێشتر بڕیاری لەسەرداوە، (دەربارەی ئەوانەی بەشداری شەڕی بەدر دەکەن خوا چاوپۆشیان لێ دەکات لەوەی کە دەیکەن)، دەنا بەهۆی ئەوکارەی کە کردتان (بە ئازادکردنی بێباوەڕەکان بە لەبری وەرگرتنی ماڵی دنیا)، ئەوا سزایەکی گەورەو بەهێزتان بەردەکەوت﴾.

بۆیە لەدوای جەنگی بەدرەوە ئەسیر ناکوژرێت.

**بڕگەی بیست ویەك:**

ئەسیر بەپێی باری کەسایەتیەکەی بە لەبریدانێك ئازاد دەکرێت.

یەکێك لەو دیلانەی لە شەڕی بەدردا گیران، عەباسی کوڕی عبدالمطلب بوو (ڕەزای خوای لێبێت)، بەم شێوەیەی خوارەوە ئازاد کرا:

(یەکێك لەو دیلانە عەباسی کوڕی عبدالمطلب بوو(ڕەزای خوای لێبێت)، کە ئازادیان کرد دوای ئەوەی شتێکیان لە ماڵی دنیا لێ وەرگرت، ڕووی کردە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و گوتی: ئەی محەمەد، وات لێکردم ئەوەندەی ژیانم ماوە دەستم بۆ قوڕەیش پان بکەمەوە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەی کوا ئەو زێڕەی کە داتە(ام فەزڵ) کاتێك کە لە مەککە دەردەچووی و پێت گوت: من نازانم تووشی چی دەبم، جا ئەگەر شتێکم لێهات ئەوا بۆخۆت و بۆ..بۆ....، عەباس فەرمووی: کەس بەم شتە نازانێت تەنها من و(ام فەزڵ) نەبێت، تۆ چۆن بەم شتە دەزانیت؟ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: پەروەردگارەکەم پێی ڕاگەیاندم، عەباس گوتی: شایەدی دەدەم کە تۆ ڕاستگۆی و، هیچ پەروەردگارێکیش نیە تەنها خوا نەبێت و تۆش بەندەو ڕەوانەکراوی ئەوی. (ئەم ڕوونکردنەوەیە لە تەفسیرەکانی (القرطبی، ابن کثیر، اسباب النزول للسیوطی، الطبری، البیضاوی، البغوی) وەرگیراوە).

برگەی بیست ودوو:

ئەگەر موسوڵمانێك لە شەڕەکەدا بێباوەڕێکی کوشت، هەموو شتومەکە تایبەتیەکانی ئەو بێباوەڕە دەبن بەهی ئەو موسوڵمانە.

برگەی بیست و سێ:

هەموو دەسکەوتەکانی جەنگ کۆ دەکرێنەوەو پێنج یەکێکیان لێ جیا دەکرێتەوە بۆ خەرج کردنی لەڕێی خواو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و کەس و کاری پێغەمبەرو هەتیوو هەژارو ڕێبوارەکان، ئەوەی دەشمێنێتەوە بەسەر بەشداربووەکانی شەڕەکەدا دابەش دەکرێت، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ (٤١)الانفال

﴿جا(ئەگەر ئێوەش خاوەن باوەڕن، ئەوا)بزانن ئەوەی کە دەستتان کەوت لە شتێك (لە کاتی جەنگ)، ئەوە بەدڵنیاییەوە پێنج یەکی ئەو ماڵە(دەسکەوتووە)

بۆ خواو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و کەس‌وکاری پێغەمبەرو هەتیوو هەژارو ڕێبوارەکانە،﴾.

**بڕگەی بیست‌وچوار:**

وا باشە دەسکەوتەکانی جەنگ دوای شەڕەکە لە مەیدانەکەدا دابەش بکرێن، کەسی پیادە حەقە بەشێکی بەردەکەوێت، کەسی ئەسپ سوار سێ حەقە بەشی بەردەکەوێت، حەقە بەشێك بۆخۆی، دووحەقە بەشیش بۆ ئەسپەکەی، هیچ کەسێکیش لە ئەسپێکی زیاتر بۆ هەژمار ناکرێت.

دابەشکردنی دەستکەوتەکانی جەنگ لە کۆتایی یاساکانی زەکاتدا ڕوون کراوەتەوە.

**بڕگەی بیست‌و پێنج:**

گەڕان بەدوای هەژارو بێوەژندا بۆ یارمەتیدانیان، وەکو جەنگ کردن وایە لەپێناوی خوادا.

(پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: گەڕان بەدوای بێوەژن‌و خەڵکی هەژار بۆ یارمەتی دانیان، وەکو جەنگان وایە لە ڕێگەی خوادا، وەکو ئەوکەسەش وایە کە بە شەو شەونوێژ دەکات‌و بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت).(٢٩٥)

## یاسای سەرانە

**بڕگەی یەکەم:**

سەرانە لە کەسێك وەرناگیرێت کە باوەڕی بەخوا نەبێت.

**بڕگەی دووەم:**

سەرانە تەنها لە پەیڕەوانی ئایینە ئاسمانیەکان وەردەگیرێت، کە ئامادە نین بێنە ناو ئایینی ئیسلامەوە.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەگەر بت پەرستێك وازی لە بت پەرستی هێناو چووەناو یەکێك لە ئایینە ئاسمانیەکانەوە، ئەوا لەو ڕۆژەوە سەرانەی لیٚ وەردەگیریٚو ژیانی دابین دەکرێت لەنێو دەوڵەتی ئیسلامیدا.

**بڕگەی چوارەم:**

لە ئایینی ئیسلامدا لە بەرانبەر سەرانەدا، سەرو ماڵٚو کەرامەتی ئەوکەسە دەپارێزرێت کە سەرانەکە دەدات.

**بڕگەی پێنجەم:**

کەمترین سەرانە، یەك دینارە(یەك مسقاڵٚ زێڕ)ە بۆ خەڵکە هەژارەکانیان، بۆ مامناوەندەکانیشیان دوو دینارە(دوو مسقاڵٚ)ە، بۆ دەوڵەمەندەکانیشیان چوار دینارە(چوار مسقاڵٚ)ە.

**بڕگەی شەشەم:**

دەتوانرێت سەرانەی مەڕو ماڵاٚتو باجی کشتوکاڵیشیان لیٚ وەربگیرێت.

**بڕگەی حەوتەم:**

کاتی دانی سەرانەکە، کۆتایی ساڵەکەیە.

**بڕگەی هەشتەم:**

دەتوانرێت لەگەڵ سەرانە، ئەوەشیان بەسەردا بسەپێنرێت کە هەر موسوڵمانێك بە ناوچەکانی ئەواندا تێپەڕ بێت بۆ ماوەی سیٚ ڕۆژ خزمەت بکرێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: میوانداری سیٚ ڕۆژە).(٢٩٦)

**بڕگەی نۆیەم:**

سەرانە لە ئافرەتو منداڵو شێتو کۆیلەو کەنیزەك وەرناگیرێت.

## یاساکانی هێورکردنەوە

## (الهدنه)

**بڕگەی یەکەم:**

هودنە بریتیە لە ڕاگرتنی شەڕ لەنێوان هەردووك لایەنی شەڕکەردا، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، لەو ماوەیەدا کەس دەستدرێژی ناکاتە سەر لایەکەی تر.

**بڕگەی دووەم:**

لەنێو موسوڵماناندا بەبێ ئاگاداری پێشەوای موسوڵمانان، کەس مافی ئەوەی نیە هودنە لەگەڵ لایەکەی تردا واژۆ بکات.

**بڕگەی سێیەم:**

ئەگەر هاتوو دەسەلاٌتی موسوڵمانەکان بەسەر بێباوەڕەکانەوە بوو، ئەوا نابێت هودنەیان لەگەڵدا ببەسترێت، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

فَلا تَهِنُوا وَتَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ وَأَنْتُمُ الأَعْلَوْنَ وَاللَّهُ مَعَكُمْ (٣٥)محمد

﴿جا خۆتان بەبیٚ هێز نیشان مەدەن(لە بەرچاوی دوژمن)و، داوای شەڕ ڕاگرتن مەکەن لەکاتێکدا ئێوە(لە شەڕەکەدا) سەرکەوتوون، خواش لەگەڵ ئێوەدایەو هیچ شتێکیش لە کارو کردەوەکانتان کەم ناکاتەوە، (خواتان لەگەڵ دایەو لێتان ناگەڕێت تاكوتەنهابن لە کاروکردەوەکانتاندا)﴾.

**بڕگەی چوارەم:**

لە نێوان دوازدە مانگەکانی ساڵدا، خوا چواریانی داناون شەڕکردنو ڕاوکردن تێیاندا قەدەغەیە، خواش لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

فَسِيحُوا فِي الأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ (٢)التوبة

﴿(ئەی بێباوەڕەكان)، بۆماوەی چوار مانگان لە زەویدا بەبێ ترس گەشت و گوزار بكەن،﴾.

**بڕگەی پێنجەم:**

هیچ هودنەیەك ماوەكەی لە دە ساڵ تێپەڕ ناكات.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە پەیمانی حودەیبییەدا لەگەڵ قورەیشدا ڕێك كەوت لەسەر شەڕ ڕاگرتن بۆ ماوەی دە ساڵ).(٢٩٧)

**بڕگەی شەشەم:**

دەكرێت هودنە لەگەڵ بێباوەڕەكاندا بكرێت لە بەرانبەر سامان و سەروەتێكدا كە بێباوەڕەكان دەیدەنە موسوڵمانەكان.

**بڕگەی حەوتەم:**

ئەگەر لەو ماوەیەی هودنەدا، ئافرەتێكی خاوەن باوەڕ، لەنێو بێباوەڕەكان هات بۆ ناو موسوڵمانەكان، ئەوا ئەو ئافرەتە ناگەڕێنرێتەوە بۆ بێباوەڕەكان، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

فَلا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ....(١٠ الممتحنة)

﴿ئەو ئافرەتە موسوڵمانانەی كافرەكانیان جێهێشتوون و هاتوون بۆلای ئێوە، ئەگەر لێیان تێگەیشتن كە خاوەنباوەڕن، مەیانگێڕنەوە بۆلای بێباوەڕەكان، نە ئەو ئافرەتانە بۆ بێباوەڕەكان حەڵاڵن و نە بێباوەڕەكانیش بۆ ئەو ئافرەتانە حەڵاڵن﴾.

**بڕگەی هەشتەم:**

هەر ڕێككەوتنێك لەبەر ڕۆشنای فەرموودەو سوننەتەكانی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) نەبێت، دروست نیەو هەڵدەوەشێتەوە، بۆنموونە: ئەگەر هودنەكە ببێتە كەم كردنەوەی سەرانە، یان ڕێگەیان پێ بدرێت بێنە ناو كەعبەوە، یان ڕێگەیان پێ بدرێت كەنیسەیەك دروست بكەن، یان ڕێگەیان پێ بدرێت گۆشتی بەرازو مەشرووبات بڵاوبكەنەوە، ئەوە ئەو هودنەیە هەڵدەوەشێنرێتەوە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەر کارێك بكرێت فەرمانی ئێمەی بەسەرەوە نەبێت، ئەوە ئەو کارە لە ئیسلامدا ڕەت دەکرێتەوە).(٢٩٨)

**بڕگەی نۆیەم:**

هەر لادانێك لە ڕێککەوتنی هودنەکەدا دەبێتە هەڵوەشانەوەی هودنەکە، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

...الَّذِينَ عَاهَدتُّمْ مِنْ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْئاً وَلَمْ يُظَاهِرُوا عَلَيْكُمْ أَحَداً فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَى مُدَّتِهِمْ .....(٤)التوبة

﴿.....ئەوانەی پەیمانتان لەگەڵیان هەیەو بە هیچ شێوەیەك پەیمانەکەی خۆیان نەشکاندووەو، کەسیش لەوان لێتان ڕانەپەڕیوە، ئەوانە ماوەی پەیمانەکەیان لەگەڵدا تەواو بکەن....﴾.

**بڕگەی دەیەم:**

ئەگەر پێشەوای موسوڵمانان هەستی کرد ئەو بێباوەڕانە لە ماوەی هودنەکەدا نیازی خیانەتکارییان هەیە، ئەوە دەتوانێت هودنەکە هەڵوەشێنێتەوەو خۆیان بۆ ئامادە بکات، لەم بارەیەوە خوا دەفەرموێت:

وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً فَانْبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ (٥٨)الانفال

﴿یان ئەوەتا لە خیانەتی نەتەوەیەکیش دەترسی(**کە هاوپەیمانیانن**)، ئەوا وەکو چۆن ئەوان پەیمانەکەی ئێوەیان شکاند، ئێوەش پەیمانەکەی ئەوان بشکێنن، بەڕاستی خوا خیانەتکارەکانی خۆش ناوێت﴾.

## یاسای داب و نەریتەکان

## بەشی یەکەم

## یاسای داب و نەریتە نەتەوەییەکان

**برگەی یەکەم:**

يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ (١٣)الحجرات

**﴿ئەی خەڵکینە، ئێوەمان لە نێرینەو مێیینەیەك دروست كردووەو، كردوومانن بە چەندین نەتەوەو تیرەو هۆز، بۆئەوەی یەكتری بناسن، بەڕاستی بەڕێزترینتان لەلای خوا ئەوەتانە كە خوا دەپەرستێ، بەڕاستی خوا زاناو شارەزایە(بەوەی كە دەیكەن)﴾.**

**برگەی دووەم:**

**هەموو گەل و نەتەوەیەك بۆی هەیە یادی جەژنە نەتەوەیەكانیان بكەنەوە بە مەرجێك دژایەتی یاساكانی ئیسلامیان تێدا نەكرێت.**

**(عائیشە** (ڕەزای خوای لێبێت)**دەڵێ: ڕۆژی جەژن بوو، ئەبوبەكر هاتە ژوورەوەو منیش دوو كیژۆڵەی خزمەتكارم لابوون، ئەو گۆرانیانەیان دەگوتنەوە كە ئەنسارەكان لە ڕۆژی (بوژانەوە)دا دەیانگوتنەوە، ئەبوبەكریش گوتی: بە چوزەلەی شەیتان و لە ماڵی پێغەمبەردا ئەوكارە دەكرێت؟ پێغەمبەریش** (صلى الله عليه وسلم) **فەرموویەتی: ئەی ئەبوبەكر، هەموو گەل و نەتەوەیەك جەژنێكی خۆی هەیە، ئەوەش جەژنی ئێمەیە).** (٢٩٩)

**برگەی سێیەم:**

**ئەو نەتەوانەی لەسەر ئایینی ئیسلام نین و لە پەیڕەوانی كتێبە ئاسمانیەكانن، پەیڕەوانی مەسیح نزیكترین ڕێبازو بەرنامەن لە موسوڵمانەكانەوە، بێباوەڕو جوولەكەكانیش توندوتیژ ترینیانن.**

لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُواْ الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُواْ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُمْ مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ قَالُوَاْ إِنَّا نَصَارَى ذَلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَاناً وَأَنَّهُمْ لاَيَسْتَكْبِرُونَ (٨٢)المائدة

﴿(ئەی محەمەد)، جوولەکەو ئەوانەی کە هاوبەشیان دانا بۆ خوا، دەیانبینی کە توندو تیژترین خەڵکن دژی خاوەنباوەڕەکان، ئەوانەش کە گوتیان ئێمە پەیڕەوانی عیساین، دەیانبینی کە نزیکترین کەسن بۆ دۆستایەتی کردنی خاوەنباوەڕەکان، (ئەویش) هۆی ئەوەیە کە (پەیڕەوانی عیسا)خۆیان بە گەورە نازانن و زانا و چاودێریکەری ئایینیان لەنێودان﴾.

**بڕگەی چوارەم:**

دەتوانرێت موسوڵمانەکان خواردنی پەیڕەوانی ئاینە ئاسمانیەکان بخۆن و، پەیڕەوانی ئایینە ئیسلامیەکانیش خواردنی موسوڵمانەکان بخۆن، بەڵام خواردنی دەستی بێباوەڕەکان بە هیچ شێوەیەك ناخورێت.

الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ(٤ المائدة

﴿ئەمرۆ هەموو خواردنە بە لەزەتەکانتان بۆ ڕەوا کرا، خواردنی ئەوانەشتان بۆ ڕەوایە کە پێشتر کتێبی ئاسمانیان بۆ هاتووە، خواردنەکانی ئێوەش بۆ ئەوان ڕەوایە....﴾.

**بڕگەی پێنجەم:**

دەکرێت موسوڵمانەکان ژن لەو نەتەوانە بخوازن کە لە پەیڕەوانی کتێبە ئاسمانیەکانن، بەڵام ژنی موسوڵمانیان نادرێتیٚ.

وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ وَلاَ مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ....(٥ المائدة

﴿.... (هەروەها هاوسەریەتی) ئەو ئافرەتە ناسك و پاکانەشتان بۆ ڕەواکراوە کە پەیڕەوانی ئەو کتێبانەن کە پێش ئێوە بۆیان هاتۆتەخوارەوە، ئەگەر مافی مارەییەکەتان بە تەواوی پێدان، (بە شێوەیەك بە مارەکردن بێت و)، داوێنەکان

بپارێزن لە كاری ناشیرین و ئەو پەیوەندیە بە سەردان و دیدەنی نەبێت، (لە ڕێگەی دۆستایەتی كردنی یەكترییەوە نەبێت)....﴾.

**بڕگەی شەشەم:**

**لە ئیسلامدا قەدەغەیە نەتەوەیەك گاڵتە بە نەتەوەیەكی تر بكات.**

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا يَسْخَرْ قَومٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ....(١١ الحجرات)

﴿ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە، نەتەوەیەكتان گاڵتە بە نەتەوەیەكی ترتان نەكات، ئومێد هەیە لەلای خوا ئەو نەتەوە گاڵتەپێكراوە لەوان باشتربن، ژنانیش گاڵتە بە ژنانی تر نەكەن، ئومێدهەیە لەلای خوا ئەو ژنە گاڵتە پێكراوانە لەوان باشتربن....﴾.

## بەشی دووەم

## یاسای داب و نەریتی تاكەكانی كۆمەڵگای ئیسلامی

**بڕگەی یەكەم:**

**تاكەكان سەربەستن، هیچ كەسێك بە زۆرەملێ ناهێنرێتە ناو ئایینی ئیسلامەوە، مرۆڤەكان خاوەن ژیرین دەتوانن چاكەو خراپەی خۆیان بزانن.**

لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ.... (٢٥٦ البقرة)

﴿زۆر لێكردن و ناچاركردن نیە لە ئاییندا(بۆ هێنانی كەسێك بۆسەر ئایین بە زۆرەملێ)، بەڕاستی ژیریش (بەكارهێنانی بیروهۆش) دەركەوتووە لەنێو گومڕایی و سەر لێشێواویدا....﴾.

إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا (٣)الانسان

﴿ئێمە ڕێگای ڕاستمان نیشانی مرۆڤ داوە، جا یان سوپاسكەر دەبێت، یان بێباوەڕ دەبێت﴾.

**بڕگەی دووەم:**

هەر کەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بكات، ئەوە گوێڕایەڵی خوای کردووە، هەر کەسێکیش لێی یاخی بێت، ئەوە لەخوا یاخی بووە.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەر کەسێك گوێڕایەڵی من بکات، ئەوە گوێڕایەڵی خوای کردووە، هەر کەسێکیش لە من یاخی بێت، ئەوە لە خوا یاخی بووە). (٣٠٠)

برگەی سێیەم:

نابێت نێرینەکان خۆیان وا دەرخەن بە مێیینەکان بچن و نابێت مێیینەکانیش خۆیان وادەرخەن بە نێرینەکان بچن.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەعنەتی لەو ئافرەتانە کردووە کە خۆیان وا لێدەکەن وەکو پیاوان دەرکەون، لەعنەتی لەو پیاوانەش کردووە خۆیان وا لێبکەن وەکو ژنان دەرکەون). (٣٠١)

برگەی چوارەم:

درۆزنترین کەس لەنێو تاکەکانی کۆمەڵگادا، ئاریش کەرو زێڕنگەرن.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: درۆزنترین کەس لەنێو خەڵکیدا ئارایش کەرو زێڕنگەرن). (٣٠٢)

برگەی پێنجەم:

کەسێك کە بانگ بکرێت بۆ نانخواردنی بووك گواستنەوەیەك، دەبێت وەڵامی داواکە بداتەوەو بەشداری بکات.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك لەئێوە بانگکرا بۆ نانخواردنی بووك گواستنەوەیەك، با بچێت و وەڵام بداتەوە). (٣٠٣)

برگەی شەشەم:

پێویستە هەموو تاکێك بەشداری بکات لە پارێزگاری نیشتیمان و بیروباوەڕەکەیدا.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: کەسێك ڕمبێك بگرێتە دوژمنەکەی، ڕمبەکە بگاتە دوژمنەکەی، جا ئامانجەکەی بپێکێت یان نەیپێکێت، (لەلای خوا) هاوتای ئازاد کردنی بەندەیەك دەکات). (٣٠٤)

برگەی حەوتەم:

ماڵی کوڕ بۆ باوکەکەی ڕەوایە.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: خۆشترینی هەموو ئەوشتانەی کە دەیانخۆن، ئەوانەن کە بە توانای خۆتان بەدەستیان دێنن، منداڵەکانیشتان، لەو شتانەن کە بۆخۆتان بە دەستتان هێناون). (٣٠٥)

برگەی هەشتەم:

پێویستە هەموو تاکێك مامەڵەیەکی شایستە لەگەڵ کەسوکارەکەیدا بکات.

(لە پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (باشترینتان ئەو کەسەتانە کە بۆ کەسوکارەکەی باشبێت، منیش لە هەمووتان باشترم بۆ کەسوکارەکەم).(٣٠٦)

برگەی نۆیەم:

کەسی موسوڵمان گونجاونیە پیریەکەی خۆی بشارێتەوەو مووە سپیەکان هەڵکێشێت.

(لە پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم)، ڕێگەی نەداوە مووە سپیەکانی پیری هەڵکێشرێن و فەرمووشیەتی: ئەوە ڕەوشەنی ڕووناکی خاوەنباوەڕە).(٣٠٧)

برگەی دەیەم:

نابێت کەلوپەلی زێڕ بەکاربهێنرێت بۆ خواردن و خواردنەوە لەلایەن نێرو مێیەکانەوە.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەوەی لە قاپێکی زیودا دەخواتەوە، ئەوە ئاگری جەهەندەمی بەناو زگیدا ڕادەکێشرێت).(٣٠٨)

برگەی یازدە:

نێرینەکان بۆیان هەیە بەرگی خوری بپۆشن، پۆشاکی حەریریش، قەدەغەیە.

(پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: لەسەرتانە پۆشاکی خوری بپۆشن، هەست بە شیرینی بیروباوەڕ دەکەن لەنێو دڵەکانتان).(٣٠٩)

(پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (نێرینەکان)ئەوەی لەدنیادا پۆشاکی حەریر لەبەر بکات، لەدواڕۆژدا لەبەری ناکات(لێی بێبەش دەبێت)).(٣١٠)

برگەی دوازدە: کەس بۆی نییە بە دزیەوە چاو لە ماڵی خەڵکی بگێڕێت.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەر کەسێك چاو بگێڕێت بە ماڵێکدا، بەبێ پرسی خەڵکەکەی، ئەوە خاوەن ماڵەکە مافی ئەوەی دەدرێتێ چاوی ئەوکەسە دەرهێنێت).(٣١١)

برگەی سێزدە: ناندان و سەلام کردن باشترین پابەندبوونە بە ئیسلامەوە.

ئەسپ سوار، سڵاو لە کەسی پیادە دەکات، پیادەش سڵاو لە کەسی دانیشتوو دەکات، خەڵکی کەمیش سڵاو لە زۆرینە دەکەن).

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ئەسپ سوار سەلام لە کەسی پیادە دەکات، کەسی پیادەش سەلام لە کەسی دانیشتوو دەکات، کەمینەش سڵاو لە زۆرینە دەکەن). (٣١٢)

(پیاوێك لە پێغەمبەری(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) پرسی: لە ئیسلامدا کام ڕەفتارە باشترە؟ فەرمووی: ناندان بە خەڵکی و سەلام کردن لە کەسێك کە بیناسیت یان نەیناسیت). (٣١٣)

برگەی چواردە: مافی موسوڵمان بەسەر موسوڵمانەکانەوە، پێنج شتە:

یەکەم: دەبێت وەڵامی سەلامەکەی بدرێتەوە.

دووەم: دەبێت لەکاتی پژمینا دوعای بۆ بکرێت، پێی بگوترێت: (خوا ڕوحمت پێ بکات).

سێیەم: دەبێت وەڵامی بانگهێش کردنەکەی بدرێتەوە.

چوارەم: لەکاتی نەخۆشیدا سەردان بکرێت.

پێنجەم: لەکاتی مردندا بەدوای تەرمەکەیەوە بڕۆن بۆ سەرقەبران.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: پێنج شت دەبێت موسوڵمان بەرانبەر برای موسوڵمانی ئەنجامیان بدات، وەڵامی سەلامەکەی بدرێتەوە، لە کاتی پژمینا دوعای بۆ بکرێت، لەکاتی بانهێش کردندا دەبێت وەڵامی داوایەکەی بدرێتەوە، لە کاتی نەخۆشیدا سەردانی بکرێت، لە کاتی مردندا دەبێت بەدوای جەنازەکانیانەوە بڕۆن). (٣١٤)

برگەی پازدە:

سەلام کردن لە مێرمندالأن لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم).

پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەلای کۆمەڵێك مێرمنداڵدا تێپەڕی سەلامی لێکردن). (٣١٥)

برگەی شازدە: نابێت سوکایەتی بە ڕۆژگار بکرێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەڵێ: خوا دەفەرموێت: ئادەمیزاد ئازارم دەدات کاتێك سوکایەتی بە ڕۆژگارەکە دەکات، من ڕۆژگارم، شەوو ڕۆژەکان هەڵدەگێڕمەوە). (٣١٦)

برگەی حەڤدە:

باوەڕبوون بە خەون:

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (خەون سێ جۆرە: تێیاندایە تۆقاندنە لە شەیتانەوە بۆ ترساندنی ئادەمیزادو، تێیاندایە ئەوەی کە ئادەمیزاد لە کاتی بەخەبەریدا پێیەوە گیرۆدەیە لە کاتی نوستنەکەیدا دەیبینێتەوەو، تێیاندایە بە شێکە لە چل و شەش بەش لە پێغەمبەرایەتی).(٣١٧)

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (خەونی خاوەنباوەڕ بەشێکە لە چل و شەش بەش لە پێغەمبەرایەتی).(٣١٨)

برگەی هەژدە:

هەموو تاکێك مافی ئەوەی هەیە ئەگەر ناوەکەی ناخۆش بێت، بیگۆڕێت بە ناوێکی خۆشتر.

(کچێك ناوی (عاصیه)بوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ناوەکەی گۆڕیو پێیگوت: ئەتۆ(جەمیلە)ی).(٣١٩)

برگەی نۆزدە:

پێویستە هەموو تاکێك ماوە ماوە بەهۆی ئامێری حوجامەوە خوێنە پیسەکەی جەستەی فڕێداتە دەرەوەو، کرێی ئەو کەسەش بدات کە خوێنەکەی بۆ دەگرێت. ئەم کردارە لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم).

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حوجامەی کردو حەقەکەشی دا).(٣٢٠)

برگەی بیست:

هەر کەسێك لە خەودا پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ببینێت ئەوە بەدڵنیاییەوە ئەوەی کە دیتویەتی پێغەمبەر بووە).

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: کەسێك لە خەونیدا من ببینێت، ئەوە بەدڵنیاییەوە منی بینیوە، چونکە شەیتان ناتوانێت خۆی بێنێتە سەر شێوەی من). (٣٢١)

برگەی بیست ویەك: گونجاونیە کەسێك بەسەر ڕوویدا بخەوێت.

(پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەلای کەسێکدا تێبەڕی لەنێو مزگەوت بەڕوودا خەوی لێ کەوتبوو، ئەویش قاچێکی گەیاندیّو بەخەبەری هێناو فەرمووی: هەستەوە دانیشە، ئەم جۆرە خەوتنە جەهەندەمیانەیە). (٣٢٢)

برگەی بیست ودوو: کەسی موسوڵمان نابێت جوێن بە (با) بدات.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: جوێن بە (با) مەدەن، (با) لەڕوحی خوایە، ڕەحمەت و سزای خوا دێنێت، بەلاّم داوا لەخوا بکەن لەخێرەکەیتان بداتیّو، خۆش لەپەنای خوادا بگرن لە وێرانکاریەکەی بتانپارێزێت ). (٣٢٣)

برگەی بیست وسیّ:

کەس ڕێگەی پیّ نادرێت بە ناوی پێغەمبەرەوە(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قسەیەك هەڵبەستێت.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: بەناوی منەوە درۆیەك هەڵمەبەستن، چونکە بەدڵنیاییەوە ئەوەی درۆیەك بەناوی منەوە هەڵبەستێت، ئەوا دەچێتە ئاگرەوە). (٣٢٤)

برگەی بیست و چوار: نابێت نێرینەکان ئەنگوستیلەی زێڕ لە دەست بکەن.

(پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕازی نیە (نێرینە)ئەنگوستیلەی زێڕ بەکار بێنێت).(٣٢٥)

برگەی بیست وپێنج: نەفرینی خوا لەسەر ئەوکەسەیە کە شێوەی خۆی دەگۆڕێت و پرچی زیادە بە قژیەوە دەلکێنێت و پێستەکەشی دەکوتێت.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەعنەتی لەو کەسە کردووە کە قژی زیادە بە سەریەوە دەلکێنێت و لەعنەتی لەوەش کردووە ئەو کارە ئەنجام دەدات و، لەعنەتیشی لەوکەسە کردووە کە پێستەکەی خۆی دەکوتێت و ئەو کەسەش کە کوتانەکە ئەنجام دەدات). (٣٢٦)

برگەی بیست و شەش:

نابێت کەسێك لەسەر پشت درێژ بێت و قاچێکی بخاتە سەر ئەوەی تریان.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: با کەسێك لەئێوە لەسەر پشت درێژ نەبێت و قاچێکیشی خستبێتە سەر قاچەکەی تری). (٣٢٧)

برگەی بیست وحەوت:

وێنەکێشەکان لە سزای دواڕۆژدا، سزاکەیان لەهی هەمووکەس توندترە.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: توندترین سزادانی خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا، بۆ وێنە کێشەکانە). (٣٢٨)

برگەی بیست و هەشت:

ئەگەر یەکێك لەئێوە سێ جار لە دەرگایەکی داو دەرگای لێ نەکرایەوە، با بگەڕێتەوە، ئەگەر لە دەرگاشی داو لە ژوورەوەڕا پێی گوترا کێیە؟ با بە تەواوی ناوی خۆی بڵێت و تەنها هەر ئەوەندە نەلێت منم یان خۆمانین.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لەئێوە سێ جار هەوڵی مۆڵەت وەرگرتنی داو ڕێگەی پێنەدرا، با بگەڕێتەوە). (٣٢٩)

(جابری کوڕی عبدالله (ڕەزای خوایان لێبێت) دەڵێ: لە بارەی قەرزێکەوە کە لەسەر باوکم بوو، هاتم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لە دەرگام دا، فەرمووی: کێیە؟ منیش گوتم: منم، فەرمووی: منم منم، وەکوئەوەی ڕازی نەبووبێت بە وەڵامەکەم.). (٣٣٠)

بڕگەی بیست ونۆ:

لە ماڵەکانتاندا یان لە باخچەو شوێنی کارکردندا نابێت سەگ ڕابگیرێت، یان لە گەشت کردندا نابێت سەگو توتەڵە بەشداری گەشتەکە بکەن، چونکە فریشتەکانی خوا ڕوو لە شوێنێك ناکەن کە سەگی لێبێت.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: فریشتەکان هاوڕێیەتی کەسێك ناکەن کە سەگو توتەڵەی لەگەڵدا بێت). (٣٣١)

بڕگەی سی:

قەدەغەیە مرۆڤ پلار لە برای موسوڵمانی بداتو ناوو ناتۆرەی بۆ هەڵبەستێو عەیبوعارەکانی ئاشکرا بکات، لە کاتی توڕەبوونیشدا دەبێت پشوو درێژ بێتو توڕەییەکەی خۆی قوتداتەوە، ئەگەر ستەمیشتان لێ کرا، گونجاونیە ئێوەش بە ستەم کردنێك وەڵامی بدەنەوە، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ (١٣٤)ال عمران

﴿ئەوانەش کە(لە کاتی تووڕەییدا)، ڕقەکانی خۆیان دەخۆنەوەو لە خەڵکیش دەبوورن، خواش چاکەکارەکانی خۆش دەوێت﴾.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم)فەرموویەتی: بەهێزی (کەسەکان)، بەوە ناپێورێت لە ئاست کاردانەوەی ڕووداوەکاندا خۆیان بۆ ڕانەگیرێت، بەڵکو بەهێزی (کەسەکان) لەوەدایە، لە کاتی توڕەبووندا خۆیان بگرنەوەو دان بەخۆیاندا بگرن). (٣٣٢)

**برگەی سی ویەك:** خاوەن باوەڕەكان برای یەكترین، ئەگەر كێشەیەك هەبوو لەنێوانیان دەبێت بەزووترین كات ئاشتیانە چارەسەری بكەن و، نابێت بە هیچ شێوەیەك دەستدرێژی بكەنە سەر یەكتر، ئەگەر دوولایەنیش كێشەیەكیان هەبوو، ئەوا پێویستە خاوەنباوەڕەكان بكەونە نێوانیانەوە، جا ئەگەر یەكێك لەم دوولایەنە ملی نەدا بۆ ئاشت بوونەوە، ئەوا پشتیوانی لەلایەنەكەی تر دەكرێت تا لایەنە شەڕخوازەكە دەهێنرێتەوە سەر ڕێگەی ڕاست.

إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ (١٠)الحجرات

﴿بەڕاستی خاوەنباوەڕەكان برای یەكترین، جا چاكەكاریی و ئاشتەوایی بكەن لەنێوان براكانتان، لە خواش بترسێن بەو هیوایەی بەزەیی پێتاندا بێتەوە﴾.

كەسی موسڵمانیش نابێت ڕقاوی و حەسودو ڕووو وەرگێر بێت لەگەڵ برای موسوڵمانیداو، گونجاویش نیە لە سێ ڕۆژ زیاتر لێی بتۆرێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرموویەتی: ڕق لە یەكتری دامەگرن و حەسودی بە یەكتری مەبەن و ڕوو لەیەكتر وەرمەگێڕن، بە برایەتی بەندایەتی خوا بكەن، بۆ كەسێكی موسڵمان ڕەوانیە لە سێ ڕۆژ زیاتر لە برای موسڵمانی بتۆرێت).(٣٣٣)

**برگەی سی ودوو:** كەسی موسوڵمان و خاوەنباوەڕ نابێت خۆبەگەورەزان و لووت بەرز بێت، هەروەها نابێت لەنێو كۆمەڵدا خۆی وا دەرخات كە هەر ئەو شایستەی هەموو شتێكە.

وَاللَّهُ لاَيُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ(٢٣) الحديد

﴿خواش هیچ كەسێكی خۆبەگەورەزانی شانازیكەری خۆش ناوێت﴾.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم)فەرموویەتی: ئەوەی من دەیزانم، ئەگەر ئێوە زانیباتان، ئەوا كەم پێدەكەنین و زۆریش دەگریان). (٣٣٤)

**برگەی سی وسێ:**

كەسی موسوڵمان و خاوەنباوەڕ نابێت درۆ بكات، درۆ كردن لەبەرنامەی خوات دووردەخاتەوە.

إِنَّمَا يَفْتَرِي الْكَذِبَ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْكَاذِبُونَ (١٠٥)النحل

﴿ بەڕاستی تەنها ئەو كەسە درۆ هەڵدەبەستێت كە باوەڕ ناهێنێت بە بەڵگەو نیشانەكانی خوا، بەڕاستی ئەوانەش بۆخۆیان درۆزنەكانن﴾.

(پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم)فەرموویەتی: ڕاستگۆیی چاكەكردنە، چاكەكردنیش بەرەو بەهەشتت دەبات، بەندەش هەوڵدەدات بۆ دەستهێنانی ڕاستگۆیی، تا دەگاتە ئەوەی لای خوا بە ڕاستگۆ دەنووسرێت، درۆكردنیش خراپەكارییە، خراپەكاریش بەرەو ئاگرت دەبات، بەندەش هەوڵ دەدات بۆ بەدەستهێنانی درۆكردن، تا دەگاتە ئەوەی لای خوا بە درۆزن دەنووسرێت). (٣٣٥)

### بڕگەی سی وچوار:

قەدەغەیە كەسی موسوڵمان‌و خاوەنباوەڕ خیانەتكاری بكات.

إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّاناً أَثِيماً (١٠٧)النساء

﴿بەڕاستی خوا كەسێكی خۆش ناوێت كە خیانەتكاری تاوانكەر بێت﴾.

### بڕگەی سی وپێنج:

دەروونی ئامیزاد بە بەردەوامی هانی دەدات بۆ كاری خراپە، بۆیە پێویستە خاوەنباوەڕەكان بە بەردەوامی لە سەنگەر دابن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ویستە چەوتەكانی دەروونەكانیان.

إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ ...(٥٣)يوسف

﴿بەڕاستی دەروونی ئادەمیزاد فەرمانی پێ دەكات بە خراپە كردن.....﴾.

### بڕگەی سی وشەش:

ئافرەتان نابێت كارێك بكەن سەرنجی نێرینەكان ڕاكێشن.

وَلا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ....(٣١ النور)

﴿.....با ئەو ئافرەتانەش(كە خرخاڵیان لەپێدایە) لە كاتی ڕۆیشتندا پێ بە زەویدا نەدەن، بۆئەوەی بەهۆی دەنگی خرخاڵەكەیەوە خەڵكی ئاگادار بكاتەوە بەوەی كە شاردوویەتیەوە لە جوانیەكەی.....﴾.

ئەو ئافرەتانەش(کە خڕخاڵیان لە پێدایە) لە کاتی ڕۆیشتندا نابێت پێیان بەزەویدا بدەن، نەوەك ببێتە هۆی زرینگانەوەی خڕخاڵەکانیان و سەرنجی ئەو خەڵکانەی پیٚ ڕابکێشرێت کە دڵیان نەخۆشە، ئینجا بەپێی قیاسی خڕخاڵەکان هەر شتێك ببێتە مایەی سەرنج ڕاکێشان، گونجاونیە ئافرەتەکان بەکاری بێنن، یان پەیڕەوی بکەن، لە بەرنامەکانی ئیسلامدا ئافرەت هەر ئەوەندەی ڕێگە پێدراوە دەموچاوو دەستەکانی بە دەرەوەبن، جا ئەگەر ئافرەت بەهۆی جلوبەرگەکەیەوە شوێنێکی تری بە ڕووتی بینرا، ئەوا سنووری یاساکانی ئیسلامی بەزاندووەو، ئەگەر عیبادەتەکانیش بکات، لە ماندووبوون زیاتر هیچی بۆ نامێنێتەوە، چونکە بەم هەڵسوکەوتەی دژایەتی فەرمانێکی خوای کردووە، وەکو ئەوەوایە کەسێك بەبیٚ دەستنوێژ نوێژەکەی بکات.

**بڕگەی سی وحەوت:**

گونجاونیە لە سیٚ کاتدا سەردانی یەکتری بکەن، کاتی پێش نوێژی بەیانی و، کاتێك کە پۆشاکەکانتان دادەنێن لە کاتی پشووی نیوەڕۆو، لە کاتی دوای نوێژی خەوتنان، ئەو کاتانە سیٚ کاتی خۆ ڕووت کردنەوەن بۆ ئێوە، مافی خۆتانە لەگەڵ هاوسەرەکانتان بن و خۆشیەکانتان لیٚ تێك نەدرێت، ئەگەر منداڵێکیش دایك و باوکی ببینێت لە کاتی جووتبووندا، ئەوا بەدرێژایی تەمەنی گرێیەکی دەروونی تێدا دروست دەبێت کە بەرەو هەڵدێری دەبات.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنْكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنْكُمْ ثَلاثَ مَرَّاتٍ مِنْ قَبْلِ صَلاةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُمْ مِنَ الظَّهِيرَةِ وَمِنْ بَعْدِ صَلاةِ الْعِشَاءِ ثَلاثُ عَوْرَاتٍ لَكُمْ......(٥٧ النور)

**بڕگەی سی وهەشت:**

لە ئیسلامدا مرۆڤەکان بەپێی لەش ولارو سامان و سەروەت و نەتەوەکانیان هەڵناسەنگێنرێن، بەڵکو بەهۆی خواپەرستیەکەیانەوە هەڵدەسەنگێنرێن، هیچ جیاوازییەك نیە لە نێوان پێست ڕەش و پێست سپی و پێست سوورو پێست

زەردەکاندا، خوا تەماشای بیرکردنەوەی ناو دڵی مرۆڤ دەکاتو، لەسەر ئەو بنەمایە لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم)فەرموویەتی: خوا تەماشای شێوەوماڵو سامانەکانتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵودەروونو کارو کردەوەکانتان دەکات).(٣٣٦)

برگەی سی‌ونۆ: دەبێت ڕێز لە گۆڕو گۆڕستانەکان بگیرێت، ئێسكو پروسکی کەسی مردوو وەکو ئێسکانەکانی مردووەکە وەهایە بە زیندوویەتی، بۆیە دەبێت ڕێزی لێ بگیرێت، هەروەها لە ڕەوشتی پێغەمبەرە(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەردانی مردووەکان بکرێتو، خێرو چاکەشیان بۆ بکرێت.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی: (شکاندنی ئێسکی کەسێکی مردوو، وەکو شکاندنی ئێسکەکەی وایە کە زیندووە).(٣٣٧)

(پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم)دیدەنی خەڵکی گۆڕستانی (القليب)ی کردو فەرمووی: ئەوەتان دیتەوانیٚ کە پەروەردگارەکەتان بەڕاستی وادەی پێدابوون؟ (ئەوانەی لەگەڵیدا بوون) گوتیان: بانگی مردووەکان دەکەی؟ فەرمووی: ئێوە لەوان چاکتر نابیستن، بەڵام ئەوان وەڵام نادەنەوە).(٣٣٨)

برگەی چل: کەسانی پەیڕەوی ئیسلام، دەبێت پەیوەندیە ڕۆحیەکانی نێوان خێزانەکەی بپارێزێتو زوو زوو سەردانی یەکتری بکەن.

(پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم)فەرموویەتی: کەسێك کە بیەوێت ڕزقو ڕۆزیەکەی زۆرو فراوان بێتو، شوێنەکەشی لەنێو کەسوکارەکەیدا بزر نەبێت، با پەیوەندیەکانی ڕوحم بەجێ بگەیەنێت). (٣٣٩)

برگەی چل‌ویەك:

کەسی موسوڵمان دەبێت کار ئاسانکەر بێت، نابێت کارەکان لەسەر خەڵکی قورس بکاتو، هەروەها دەبێت لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕووداوەکانیشدا ئارامو لەسەرخۆ بێت، نابێت دەرپەڕێتو هەڵوێستێکی توند وەرگرێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: کارئاسانی بکەن و تەنگەبەریش مەبن، ئارام بن و بەڕووی خەڵکیشدا دەرمەپەڕن). (٣٤٠)

برگەی چل و دوو:

ئەگەر کەسێك باوێشکی هاتەوە پێویستە زوو کۆتایی بە باوێشکەکەی بێنێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: خوا کەیفی بە پژمین دێت و ڕقی لە باوێشك دان دەبێتەوە، جا ئەگەر هاتوو یەکێك لەئێوە پژمی، پاشان سوپاس وستایشی خوای کرد، ئەوە هەر موسوڵمانێك گوێی لێ بووبێت، لەسەری پێویست دەبێت وەڵامی بداتەوەو بڵێت: (خوا ڕوحمت پێ بکات)، بەڵام باوێشك ئەوە لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر یەکێك لەئێوە باوێشکی هاتەوە، چەندەی بۆی دەکرێت با خێرا کۆتایی پێ بێنێت، چونکە ئەوکاتەی کە باوێشکت پێدا دێت، شەیتان پێت پێدەکەنێت). (٣٤١)

برگەی چل و سێ: ئەرکی سەرشانی هەموو موسوڵمانێکە بەلای کەمەوە هەفتەی جارێك خۆی بشوات.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: لەسەر هەموو موسوڵمانێك پێویستە لە هەر حەوت ڕۆژدا، ڕۆژێك سەرو لەشی بشوات). (٣٤٢)

برگەی چل وچوار:

دەبێت کەسی موسوڵمان ئاگاداری ڕەفتارەکانی خۆی بێت نەوەکە بکەوێتە ڕیزی دووڕووەکانەوە.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: نیشانەکانی کەسی دووڕوو سێ نیشانەن: ئەگەر کەوتە دووان درۆ دەکات، ئەگەر ئەمانەتی لادندرا دەستی بۆ دەبات، ئەگەر وادەشی دا وادەکەی خۆی جێبەجێ ناکات). (٣٤٣)

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ئاژاوەچی ترین کەس لەنێو خەڵکیدا ئەوانەن دوو ڕوویان هەیە، دێتەلای ئەوانە بە ڕوویەك خۆی دەردەخات و، دەچێتە لای ئەوانی تریش، بە ڕوویەکی تر خۆی دەردەخات). (٣٤٤)

**برگەی چل‌وپێنج:** لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەرە(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە مرۆڤی موسوڵمان چووە سەر جێگەکەی بخەوێت ئەم فەرموودەیە بڵێتەوە:

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کاتێ دەچووە سەر جێگەی نووستنەکەی دەیفەرموو: ئەی پەروەردگار، من بەهۆی تۆوە زیندوو دەبمەوە، بەهۆی تۆشەوە دەمرم، کاتێ بەخەبەریش دەهات، دەیفەرموو: سوپاس‌وستایش بۆ ئەو خوایەی کە زیندوی کردینەوە دوای ئەوەی کە مراندینی، گەڕانەوەش هەر بۆلای ئەوە).(٣٤٥)

**برگەی چل‌وشەش:**

پێویستە موسوڵمان دوای نان خواردن ئەو فەرموودەیە بڵێتەوە:

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کاتێ لەنان خواردن دەبوۆوە، دەیفەرموو: سوپاس‌وستایش بۆ ئەو خوایەی کە نان‌و ئاوی داینێ‌و ئێمەی کرد بە موسوڵمان).(٣٤٦)

**برگەی چل‌وحەوت:**

پێویستە کەسی موسوڵمان لەم دەستکەوتە مەزنە خۆی بێبەش نەکات کە لەم فەرموودەیەدا هاتووە:

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: لەنێو دروستکراوەکانی خوادا کەس پاداشتی وا نادرێتەوە وەکو پاداشتی ئەوکەسەی کە بەیانیان‌و ئێواران سەد جار بڵێت: (سحبان الله العظيم وبحمده)).(٣٤٧)

**برگەی چل‌و هەشت:**

پێویستە موسوڵمان ڕازی بێت بە هەژاریەکەی خۆی‌و، ئافرەتانیش خۆیان لە سزای دواڕۆژ لادەن، وەکو لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێت:

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: چاوم بەناو خەڵکی بەهەشتدا گێڕا بینیم زۆرینەی خەڵکەکەی هەژارەکانن، چاویشم بە ئاگردا گێڕا، بینیم زۆرینەی خەڵکەکەی لە ئافرەتانن).(٣٤٨)

برگەی چل‌ونۆ: مرۆڤی موسوڵمان دەبێت لە قسەکردندا ئاگاداری خۆی بێت بزانێت چی دەڵێت.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: هەر کەسێك نێوان دوو شەویلکەکانی و دوو ڕانەکانیم بۆ دابین بکات، منیش بەهەشتی بۆ دابین دەکەم).(٣٤٩)

برگەی پەنجا:

پێویستە کەسی موسوڵمان بگاتە ئەو باوەڕەی کە ژیانی دنیا تەنها لەزەتێکی هەڵخەتێنەرە، بۆیە پێویستە پابەند بێت بە بەندایەتی کردنەکەی بۆ پەروەردگاری، خوا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلا مَتَاعُ الْغُرُورِ (٢٠)الحديد

﴿ژیانی دنیاش لە لەزەتێکی فریودەرە زیاتر نییە﴾.

(عبدالله دەڵێ: پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، لەسەر حەسیرێك پاڵکەوتبوو، کە هەستا شوێنەواری حەسیرەکە بەسەر کەلەکەیەوە دیاربوو، گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر ڕایەخێکت بۆ ڕاخەین، ئەویش فەرمووی: من‌و دنیا چیمان بەسەریەکەوە هەیە، من لە دنیادا تەنها وەکو ڕێبوارێك وام لەژێر سێبەری دارێك پشوو بدات‌و پاشان بڕوا بەجێیبهێڵێ).(٣٥٠)

برگەی پەنجا ویەك:

موسوڵمان لە ژیانیدا نابێت بەرز بڕوانێت، بە بەردەوامی دەبێت تەماشای ژیانی خەڵکەکەی ژێر خۆی بکات.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لەئێوە بیری لە کەسێك دەکردەوە کە لە ماڵ‌و شێوەدا بەرز نرخێنراوە، ئەوا با تەماشای (باری ژیانی ئەوخەڵکانەی ژێر خۆی بکات).(٣٥١)

برگەی پەنجاودوو:

باشترین کارو کاسپی ئەوەیانە کە بەردەوام بیت لەسەری.

(عائیشه(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: باشترین ئیش‌وكار بە لای پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ئەوەیان بوو كە خاوەنەكەی بەردەوام بێت لەسەری).(٣٥٢)

**بڕگەی پەنجاوسێ:**

باشترین خواپەرست، ئەو كەسەیە كە بە سەرو ماڵ لە پێناوی خوادا تێكۆشێت، یان كەسێك لە پەناگایەك خوای خۆی بپەرستێت‌و خەڵكی نەگلێنێتە ناو كێشەكانی خۆیەوە.

(پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، گوتی: لەنێو خەڵكیدا كامەیان لە هەموویان باشترە؟ فەرمووی: (پیاوێك بە سەروماڵ لە پێناوی خوادا تێكۆشێت)، پیاوەكە گوتی كێی تر؟ فەرمووی: (خاوەنباوەڕێك لە دۆڵێك لە دۆڵەكاندا خوای پەروەردگاری خۆی بپەرستێت‌و خەڵكی تووشی كێشە نەكات).(٣٥٣)

**بڕگەی پەنجاو چوار:**

مرۆڤی موسوڵمان‌و خاوەنباوەڕ دەبێت خاوەن هەڵوێست بێت بەرانبەر پاراستنی شەرەف‌و ناموسی كەسوكارەكەی‌و نابێت گەوادیان پێوە بكات.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرموویەتی: سێ (پۆل) لە ڕۆژی دواییدا خوا ڕوویان ناداتێ، ئەوانەی دایك‌و باوكیان ئەزیەت دەدەن‌و، ئەو ئافرەتانەش كە شێوەی خۆیان دەهێننە سەر شێوەی پیاوان‌و، ئەوانەش كە گەوادی دەكەن، سێ (پۆلیش) ناچنە بەهەشتەوە، ئەوانەی ڕقیان لەدایك‌و باوكیان دەبێتەوەو، ئەوانەش كە خویان بە شەڕاب خواردنەوەوە گرتووەو، ئەوانەش كە منەت دەكەن بەهۆی ئەو بەخشینەی كە بە خەڵكی دەدەن).(٣٥٤)

**بڕگەی پەنجاوپێنج:**

مرۆڤی خاوەنباوەڕ دەبێت ڕێز لە ناوی خوا بگرێت، كاتێك كە یەكێك بۆ داواكاریەك ناوی خوای بەگژدا دەكات.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرموویەتی: کەسێك کە خۆی لە پەنای خوادا گرت، ئێوەش پەنای بدەن، کەسێکیش کە ناوی خوای هێنا، بۆئەوەی یارمەتی بدەن، ئێوەش بیدەنێ، کەسێکیش کە هانای بۆ خوا برد، ئێوەش بە هانایەوە بچن، کەسێکیش کە چاکەیەکی لەگەڵ کردن، ئێوەش پاداشتی بدەنەوە، ئەگەر نەشتان بوو پاداشتی بدەنەوە، ئەوا ئەوەندەی بۆ بپاڕێنەوە هەتا بۆخۆتان هەست بەوە دەکەن گە پاداشتتان داوەتەوە).(٣٥٥)

برگەی پەنجاو شەش: پێویستە کەسی خاوەنباوەڕ دەستی ڕاستی بەکاربێنێت بۆ خواردن و خواردنەوە.

(پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لەئێوە خواردنێکی خوارد، با بە دەستی ڕاست بیخوات، ئەگەر خواردنەوەیەکیشی خوارد، با بە دەستی ڕاست بیخواتەوە، چونکە لەڕاستیدا شەیتان بە دەستی چەپی دەخوات و دەخواتەوە).(٣٥٦)

برگەی پەنجاو حەوت:

کەسی خاوەنباوەڕ پێویستە کە دانیشت بۆ نان خواردن، ناوی خوا بێنێت و بڵێت(بسم الله)، بە دەستی ڕاستیش نانەکە بخوات و، لەو بەشەی بەردەمی خۆشی بخوات.

(عەمری کوڕی ئەبی سەلمە دەڵێ: لە ژوورەکەی پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، نانم دەخوارد، دەستم لەنێو سینیەکەدا دەگێڕا، ئەویش فەرمووی: ئەی هەرزەکار، ناوی خوا بێنەو، بە دەستی ڕاست لەوەی بەردەمی خۆت بخۆ).(٣٥٧)

برگەی پەنجاو هەشت:

کەسی خاوەنباوەڕ پێویستە لە کاتی ئاو خواردنەوەدا (هەڵی نەقوڵێنێ)، دۆلکەی ئاوەکە ئەوەندە بەرز نەکاتەوە ببێتە هۆی ئەوەی ئاوەکە لەسەرەوەڕا بکرێتە ناو دەمیەوە، هەروەها وەهاش باشە، مرۆڤ لە کاتی نان خواردن و ئاو خواردنەوەدا، لەباری دانیشتوویی دابێت.

